٤٤٤

# بیرەوەرییەکانی
# سەفەرخان

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com



سیودوو ساڵ خۆڕاگریی لە زیندانەکانی شای ئێراندا
لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ عەلی ئەشرەف دەروێشیان

و: تەها عەبدوڵڵا فەرەج/ سێکانیانی

بیرەوەریی

---

# بیرەوەرییەکانی سەفەرخان

---

سیودوو ساڵ خۆڕاگریی لە زیندانەکانی شای ئێراندا
لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ عەلی ئەشرەف دەروێشیان

وەرگێڕانی لە فارسییەوە:

تەها عەبدوڵڵا فەرەج/ سێکانیانی

سلێمانی

٢٠٢٢



## حکومەتی هەرێمی کوردستان

## وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان

## بەڕێوەبەرێتی ڕاگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی






# بیرەوەرییەکانی سەفەرخان

چاوپێکەوتنی: عەلی ئەشرەف دەروێشیان
وەرگێڕانی: تەها عەبدوڵڵا فەرەج/ سێکانیانی
بابەت: بیرەوەری
نەخشەسازی بەرگ و ناوەڕۆك: پەیام ئەحمەد
سەرپەرشتیاری چاپ: کارزان عەبدوڵڵا
قەبارەی کتێب: A5
ژمارەی لاپەڕە: ( ٢٩٠ )
تیراژ : ( ٥٠٠ ) دانە
ساڵی چاپ: ٢٠٢٢
شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی کارۆ
نرخ: ( ٦٠٠٠ ) دینار
لە بەڕێوەبەرێتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی ( ٢٠٠٠ )ی ساڵی ٢٠٢٢ی پێدراوە

بەڕێوەبەرێتی ڕاگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
شەقامی وەیس، نزیك کتێبخانەی گشتی سلێمانی
٣٣٠١٩٤٩

## پێشەکی وەرگێڕ

سـەفەرخان، یان سـەفەری قارەمانیان، یەکێکە لە نـاوە دیارەکانی وڵاتی ئێران، ئەو بووە بە ڕەمزی خۆڕاگریی و قارەمانێتی زیندانەکانی شای ئێران. ئەم قارەمانە کە نازناوی بنەماڵەکەشیان (قارەمانی) بووە، کەسـێکی قارەمان و شۆڕشگێڕ و تێکۆشـەری ناوچەی ئازەربایجانی وڵاتـی ئێران بووە. ئەو لەگەڵ دەسـتپێکی شۆڕشـی ئازەربایجان، کە هـاوکات بـووە لەگەڵ کۆماری مهابـاد، چەکی هەڵگرتـووە و لە دژی جەور و سـتەمی ئاغا و دەرەبەگەکانی ئەو سـەردەمەی ئازەربایجان وەستاوەتەوە.

چەندین سـاڵ بوو ناوی سـەفەرخانم بیسـتبوو، دەمزانی کەسێکی ئازەرییـە و خەڵکـی ئازەرشـەهر و تەبرێـزە، دەمزانـی ئەویـش هەر وەکـو غەنی بلوریان، عەزیز یوسـفی، جەلیلی گادانی، بێژەنی جەزەنی و خوسـرەوی گوڵسـورخی زیندانییەکـی ئـازا و بـەورە و خۆڕاگری زیندانەکانی ئێران بووە، بەڵام هیچ زانیارییەکی ئەوتۆم لەسەر شێوازی خەبات و تێکۆشـان و ئاوارەیـی و دەسـتگیرکردن و خۆڕاگرییەکانی ناو زیندانی نەبوو. زۆر بەدوای سـەرچاوەیەکدا دەگەڕام؛ بەڵکو شتێک لەبـارەی ژیانی ئەو پیاوە قارەمانەوە بزانم، بەڵام هیچ شـتێکم نەهاتە بەرچـاو، ئەوەی لەبارەی ژیانی ئەوەوە دەمزانی هەر ئەوە بوو، کە لە دەمی چەند کەسـێکەوە گوێبیسـتی ببووم. ئەو کەسێکی ئازەریی بوو، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانیشـدا خەڵکی زۆر بە کەمی ئەویان دەناسـی. ئەوەبوو لە مانگی تەممووزی سـاڵی (٢٠٢١) هەواڵیان پێدام؛ کە هاوڕێی بەڕێز و خۆشەویسـتم کاک ئیسماعیلی قادری خەڵکی شارە جوانەکەی

سەردەشت تووشی کارەسات بووە و لە نەخۆشخانەی ئورومیە خەوێنراوە، منیش بە زوویی ڕێگای وڵاتی ئێرانم گرتەبەر و خۆم گەیاندە هاوڕێ بەڕێز و خۆشەویستەکەم. دوای بینینی هاوڕێ بەڕێزەکەم، وەک پیشەی هەموو جارێکم لە شاری ئورومیە ڕۆیشتم بۆ سەردانیکردنی کتێبخانەکانی شار، بە هەڵکەوت لە جامخانەی کتێبخانەیەکدا چاوم بە کتێبی (خاطرات سفر قهرمانیان) کەوت، منیش وەک حەوت هەنگم لە دارێکدا دۆزیبێتەوە، بە خێرایی خۆم کرد بە ناو کتێبخانەکەدا و گووتم: ئاغا گیان ئەو کتێبەم پێ بدە. هێندە تامەزرۆ بووم بۆی، هەر لە گەڕانەوەمدا تا گەیشتمەوە سلێمانی کتێبەکەم خوێندەوە، چونکە خۆشم زۆر ئاوارەیی و دەربەدەرییم بینیبوو، هەروەها زیندانیی سیاسی بووم و دەرد و مەینەتی ناو زیندانەکانی ڕژێمی بەعسم بینیبوو، شاهیدی قارەمانێتی و خۆڕاگریی دەیان کوڕە کوردی سەفەرخانئاسا بووم، بۆیە کتێبەکە زۆر سەرنجی ڕاکێشام و بڕیارم دا وەریبگێڕمە سەر زمانی شیرینی کوردی. تاکو زیندانییانی سیاسی و قارەمانە خۆڕاگرەکانی گەلەکەم زانیارییەکیان هەبێت لەبارەی زیندانییانی خۆڕاگر و زیندانە تاریکەکانی وڵاتانی تر.

دیارە دیکتاتۆر لە هەر سەردەم و لە هەر شوێنێک بێت، هەر دیکتاتۆرە، لە زیندانەکانی ڕژێمە دیکتاتۆرەکاندا جیاوازییەکی وا نابینیت لەبارەی ئەشکەنجە و لێدان و فەلاقەکردن و سوکایەتیپێکردنی زیندانییان. چۆن لە زیندانەکانی بەعسدا داوایان لە زیندانییان دەکرد کە ببنە سیخوڕ بەسەر هاوڕێ زیندانییەکانیانەوە و هەوڵیان دەدا زیندانیی بە زیندانیی ئەشکەنجە بدەن، بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەش؛ چەندین بەڵێنی درۆیان بە زیندانییان دەدا، دیارە زۆر بە دەگمەن کەسێکی خاوەن بیروباوەڕ هەبووە خۆی بدۆڕێنێت و ملکەچی داواکارییەکانی ئەوان بێت. هەڵسوکەوتی جەللادەکانی ساواکیش هەر وەها بووە و هیچیان لە هەڵسوکەوتی جەللادەکانی ڕژێمی بەعس کەمتر نەبووە.

شای ئێران بە دەستوخەتی خۆی لەسەر دۆسیەی سەفەرخان

دەنووسێت: بە هیچ شێوەیەک ئازاد ناکرێت و دەبێت تەواوی ژیانی لە زینداندا بەســەربەرێت، بەڵام دوای چەندین ســاڵ مانەوەی لە زینداندا، ساواک فشارێکی زۆری لێ دەکەن تاکو پاکانەی پێ بنووسن و ئازادی بکەن، بەڵام ئەو ملکەچی داواکانیان نابێت، هەر بۆیە لەسەر نەنووسینی پاکانە جۆرەها ئەشکەنجە دەدرێت، ئەو دەڵێت: جارێکیان لەگەڵ (١٢٠) زیندانیــی تــردا منیــان برد تاکــو پاکانە بنووســین و ئازادمــان بکەن، ئەوان هەموو پاکانەیان نووســی و سوپاســی شــایان کــرد، تەنها من نەمنووسی، دەڵێت: گەرچی ئەوان هەموویان بە ئازادبوونیان خۆشحاڵ بــوون، بەڵام من لە هەموو ئەوانە خۆشــحاڵتر بووم، چونکە توانیبووم لووتی ســاواکییەکان بشــکێنم و ویژدانی خۆم ئاسوودە بکەم. ئاسودە بووم بەوەی کە لە ســەردەمی کۆمــاری ئازەربایجاندا ئەو بەڵێنەی بە خەڵکــم دابوو، توانیبــووم بەڵێنەکەم بەرمە ســەر و خیانەت لە گەل و نیشتمانەکەم نەکەم...

ســەفەرخان باسی هەڵوێســت و ئازایەتی و خۆڕاگریی زیندانییانی وەکو بێژەنی جەزەنی و خوســرەوی گوڵســورخی و چەندین زیندانیی تر دەکات، کە چۆن لە زینداندا لەســەر پێداگرییان لە هەڵوێســتەکانیان لەسێدارە دراون، هەروەها باسی کەسانی وەکو عەزیز یوسفی و غەنی بلوریان و جەلیل گادانی دەکات، کە هەرســێکیان کورد بوون و خەڵکی شــاری مهاباد بوون و هەریەکەیان ماوەی (٢٥ تا ٢٨) ساڵ لە زینداندا مابوونەوە و ئامادە نەبوون ملکەچی داواکانی ســاواک بن، بە جۆرێک باســی عەزیــز یوســفی دەکات و دەڵێــت: دوای (٢٥) ســاڵ زیندانیی، بۆئەوەی نوێنەرانی خاچی سوری جیهانی چاویا پێی نەکەوێت، ساواک بــە ناچاریی ئازادی دەکەن، بەڵام عەزیز یوســفی لەبەردەم ســەرۆکی زینداندا دەڵێت: بۆ ئازادم دەکەن؟ خۆ من پاکانەم نەنووسیوە، دیارە تۆ و ساواک لە ناچارییدا ئازادم دەکەن.

پێویســتە ئەوەش بڵێین، بیرەوەرییەکانی سەفەرخان پێشتر لەلایەن کەســێکی تــرەوە بە نــاوی (بەهــرۆزی حەقی)یەوە لە وڵاتــی ئەڵمانیا

چاپکــراوە، بەڵام ســەفەرخان ڕەخنەی لێی هەبووە و نەیویســتووە لە وڵاتــی ئێران بڵاوی بکاتــەوە، هەر بۆیە دواتر نووســەری بەناوبانگی ئێرانی عەلی ئەشرەف دەرویێشیان، کە هاوڕێی زیندانی بووە، سەرلەنوێ چاوپێکەوتنی لەگەڵدا دەکاتەوە و ئەم کتێبەی هێناوەتە بەرهەم.

**تەها عەبدوڵلا فەرەج/ سێکانیانی**
**٢٠٢٢/٧/١**

## پێشەکی نووسەر

کتێبی بیرەوەرییەکانی سـەفەرخان سـاڵی (١٣٧٢/ ١٩٩٣) لە وڵاتی ئەڵمانیـا بە هەوڵ و تێکۆشـانی (بەهرۆزی حەقـی) لەچاپدراوە، بەڵام کتێبەکە جێگای ڕەزامەندیی سـەفەرخان نەبـوو، من لە مانگی ئازەری (١٣٧٤) لـە دیداریکمـدا کە لەگەڵ سـەفەرخان ئەنجامم دا، ئەو گووتی: زۆربەی ئەو نووسینانەی ناو کتێبەکە قسەی من نین و بەهرۆزی حەقی چەندین وشـە و ڕسـتەی تێکەڵ بە قسەکانی من کردووە، هەر ئەوەش بـووە هۆی ئەوەی کە من نەتوانم بیرەوەرییەکانم بۆ هاوڵاتییانی خۆم بە چاپ بگەیەنم.

هەرچۆنێـک بێـت کتێبەکەی بەهرۆز لـە چاوەڕوانی سـەفەرخاندا نەبـوو، من ماوەیەکی زۆرم لەگەڵ سـەفەرخان لە زیندانەکانی ئەوین، قەسر و کۆمیتەی هاوبەش بەسەربردبوو، بۆیە نەمتوانی بەرامبەر ئەو دەستەوەسـتان بمێنمەوە، ئەگەرچی دەمزانـی کارێکی گرانە و کاتێکی زۆری دەوێـت، بـەڵام لە یەکێک لـە دیدارەکانمدا لەگەڵ ئـەودا بەڵێنم پێ دا کە دووبارە بۆ ئامادەکردنی کتێبێک دەسـتبەکاربم. سـەفەرخان دەیگووت: من تەواوی ئەو دەسـتنووس و بەڵگانەی کە چەندین سـاڵ بوو کۆمکردبوونەوە لەگەڵ چەندین کاسـێت هەموویم داوە بە بەهرۆز و ئیتر دەستم ناکەونەوە. من بەڵێنم بە سەفەرخان دا کە لە سەرەتاوە دەسـت پێبکەمـەوە، بۆیـە تەسـجیلەکەم هەڵگرتوو لە هاوینی سـاڵی (١٣٧٤/ ١٩٩٥) دوای نەشتەرگەرییکردنی و دابەزینی نزیکەی چل کیلۆ لە کێشـی، هەفتانە دوو جار لای دادەنیشـتم و بـە ورەیەکی بەرزەوە یادەوەرییەکانـی خـۆی بۆ دەگێڕامـەوە. لە کۆتاییـدا یادەوەرییەکانیم

لەسەر (٢٣) کاسێتی یەک کاتژمێریی تۆمارکرد، دواتر یادەوەرییەکانیم خستە سەر کاغەز، دیارە سوودم لە کتێبەکەی بەهرۆزی حەقیش وەرگرتووە، زۆرێک لە بەڵگە مێژووییەکان و ناوی کەسایەتییەکان و بەڵگەکانم لە کتێبەکەی بەهرۆز وەرگرتووە.

ماوەیەک لە بیری ئەوەدا بووم کە بیرەوەرییەکانی سەفەرخان چۆن بنووسم، نووسینی ڕۆمانێک لەسەر بیرەوەرییەکانی ئەوم هەڵگرت بۆ کاتێکی تر، سەرەتا ویستم ئەم یادەوەرییە بە شێوەی ڕۆمان – یادەوەریی بنووسم، بەڵام دوای نووسینی نزیکەی دووسەد لاپەڕە، هەستم کرد لە ئێستادا توانای ئەو کارەم نییە. سەفەرخانیش پەلەی بوو دەیویست هەرچی زووترە کتێبەکەی بۆ ئامادە بکەم، دواتر بۆم دەرکەوت هەمان گووتە سادە و ڕاستگۆییەکانی ئەو باشترین ستایلە بۆ نووسین.

هیوادارم ئەم کتێبە بتوانێت ڕابردووی مرۆڤێکی تێکۆشەر و خاوەن بەڵێن بە زیندوویی بهێڵێتەوە، مرۆڤێک کە ماوەی (٣٢) ساڵ تەمەنی خۆی لەپێناوی ئازادیی گەلەکەی لە زیندانە تاریکەکانی ڕژێمی پەهلەوییدا بەسەر بردووە.

لە کۆتاییدا پێویستە ئەوەش بڵێین، کە نووسەر و وەرگێڕ و لێکۆڵەر (پەروێزی بابایی) دوای خوێندنەوەی کتێبەکە؛ بەشێک لە بابەتە مێژووییەکانی وەبیر هێنامەوە و زۆرێک لەو بەسەرهاتانەی کە سەفەرخان بیری چووبوون، یان لەسەر کاسێتەکان سڕابوونەوە، بە هاوکاریی ئەو و نووسەر (مورتەزای زەڕبەخت) تەواوم کرد.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان**
**١٣٧٥/٩/٢٠**
**١٩٩٦/١٢/١١**

## ئەو کەسەی گووتی (نەخێر)

**خوێنەرانی بەڕێز:**

چاپی چوارەمی بیرەوەرییەکانی سەفەرخان لەکاتێکدا دەگاتە دەستی ئێوە؛ کە خۆی لەناو ئێمەدا نەماوە. سەفەری قارەمانیان (سەفەرخان) مێژووی دەرد و ڕەنجی ئێمە بوو، مێژووی زیندان و ئەشکەنجەکانی ئێمە و مێژووی لەسێدارەدان و سەرکوتکردنی ئێمە بوو. ئەو کەسێکی لادێیی بوو، کەسێکی سادە و دڵپاک بوو، هەشتاو یەک ساڵ لە ژیاندا بوو. لە تەمەنی بیست ساڵییدا بۆ ئازادیی جووتیاران و زەحمەتکێشان دەستی داوەتە خەبات، لەژێر ستەمی دەرەبەگەکانی ئازەربایجان لە تەمەنی بیستوپێنج ساڵیدا لەگەڵ هێرشە دڕندانەکەی سوپای شا بۆ سەر ئازەربایجان ئاوارە دەبێت و دەڕوات بۆ وڵاتی عێراق. دوای بەرگەگرتنی دوو ساڵ زیندانیی و ئاوارەیی دەگەڕێتەوە بۆ ئێران و لە ساڵی (١٩٤٨/١٣٢٧)، واتە لە تەمەنی بیستوحەوت ساڵیدا دەستگیر دەکرێت و دەخرێتە کونجی زیندانەوە. لە تەمەنی پەنجاوحەوت ساڵیدا دوای مانەوەی (٣٢) ساڵ لە زینداندا، بەهەمان شێوە کە خۆی ئارەزووی بۆ دەخواست بە دەستی ئازادیخوازانی خەڵکی ئێران لە زیندان ئازاد دەکرێت. دوای ئازادبوونی تا کۆتایی ژیانی بە دەرد و ئازار و نەخۆشیی سیودوو ساڵەی زیندانەوە دەتلایەوە. ئەو لە زینداندا تووشی نەخۆشیی سییەکان ببوو. لە کاتژمێر (٣)ی بەرەبەیانی ڕۆژی یەکشەممەی (١٩ی ئابانی ١٣٨١) (٢٠٠٢/١١/١٠) کۆچی دوایی کرد.

سەفەری قارەمانیان، قارەمانی زیندان و ئەشکەنجە و سیا چاڵەکانی زیندان، لەنێوان هەست و هاودەردیی هەزاران کەس، ڕۆژی چوارشەممەی (٢٢)ی ئابان تەرمەکەی لە نەخۆشخانەی ئێران

شەهرەوە گواسترایەوە و لە ئیمامزادەی تاهر کەرەج بەخاک سپێردرا.

قســەکردن لەســەر (٣٢) ســاڵ خۆڕاگریی لە هەلومەرجی سەختی نامرۆڤانــە و تاقەتپڕووکێنــی زینــدان، هەروا ئاســان نییــە. ئەو کاتێک کەوتــە کونجی زیندانــەوە، تەمەنی لە لوتکەی گەنجــی و جوانیدا بوو، بەدرێژایی ئەو ســاڵە ترســناکانە حەز و ئارەزووەکانی لەناوبران، ئەو بەورە و ئازایەتییەکی زۆرەوە ڕووبەڕووی ژیان وەستایەوە و گووتی: ((نەخێر)). کاتێکیش ئازادکرا پیرەمێردێک بوو.

دوای تێپەڕبوونی بیستوپێنج ساڵ لە زیندانییکردنی لە ساڵی (١٣٥٢/ ١٩٧٣)، کاتێک پاسەوانانی شا نارەزاییەکانی زیندانییانی سیاسیی تاران و شارەکانی تری ئێرانیان سەرکوت کرد، شەوێک سەفەرخان خەونێک دەبینێــت. (لــە خەونمدا ســاڵی ١٣٤٦/ ١٩٦٧ لە زیندانــی ئورمیەم، دار هەنارەکانــی ناو حەوشــی زینــدان گوڵێکی زۆریان کــردووە، تەواوی حەوشــەکە پــڕ ببوو لە گوڵە هەناری ســور، هیچ کاتێــک خەوی ئاوها خۆشــم نەدیوە، خەونەکــەم زۆر جوان بوو)، ئەو تــا چەند ڕۆژێک بە دڵێکی خۆشەوە خەونەکەی بۆ هاوڕێکانی دەگێڕایەوە.

ئــەو لەنــاو ئێمــەدا ڕۆیشــت، یــاد و یادەوەرییــە پــڕ شــکۆکانی ڕووبەڕووی ســتەمکاران دەوەستێت و ڕیسوایان دەکات. ئەو هەمیشە یادەوەرییەکانــی لەناو دڵی زەحمەتکێش و ســتەمدیدە و ڕۆشــنبیرانی ئازادی و دادپەروەرانی ئێرانی خۆشەویستمان بەزیندوویی دەمێنێتەوە.

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان**
**مانگی ئابانی (١٣٨١/٢٠٠٢)**

## یادەوەرییەکانی سەفەرخان

لە شەقامی سەربەداران لە بەردەم کۆشکی ژمارە هەشت وەستاوم، پەنجــە دەنێم بە دووگمەی جەرەســی قاتی پێنجەمــدا، دەنگی دەرگاکە دێت و دەکرێتەوە. بە شەستوهەشــت پلیکانەدا ســەردەکەوم، لە پشتی دەرگاکەوە دەوەســتم و هەناســەبڕکەمە، لە دەرگاکە دەدەم، کەسـێک لــە پشــتی دەرگاکــەوە وەســتاوە، زووتر لــە شووشــەی دەرگاکەوە ســێبەرەکەی دەبینم و دەرگاکە دەکاتەوە، هەروەکو کێوی (ســەبەلان) ڕاســت بە پێوە وەســتاوە، دەســتی بۆ لای من درێژ دەکات، دەســتم لەنێــو دەســتیدا ون دەبێت. دادێتەوە و ڕووخســاری دێنێتە پێشــەوە، لەســەر پەنجەکانی قاچم دەوەســتم و ئەملاولای ماچ دەکەم، دەرگاکە پێوەدەدرێتەوە. هاوسەری دووەمی سەفەرخان لە لایەکی ژوورەکەوە ڕاکشــاوە و ئازاری پشــتی هەیە، دەیەوێت هەڵســێت، بەڵام من ناهێڵم. دوودڵ بووم لەوەی هەڵسم و بڕۆم لە چێشتخانەکە چایی بهێنم. ئاخر ســەفەرخان لەنــاو ماڵدا هەمــوو کارەکان هەر خــۆی ئەنجامی دەدان. ئەگــەر من بچم چایی بهێنم نیگەران دەبێت، هیچ پەلە ناکەم، ئەو خۆی دەڕوات لە چێشتخانە لەسەر سینییەک سێ چایی دەهێنێت. دەستەکانی دەلــەرزن و چایەکان بەســەر پیاڵەکانــدا دەڕژێن، لەســەر قەنەفەکان دادەنیشین و هەواڵی یەکتری دەپرسین. وێنەیەکی سەردەمی لاوێتی لە بەرامبەرمان بە دیوارەکەدا هەڵواسراوە، کە بە جلوبەرگی سەربازییەوە گیراوە، لە وێنەکەدا چەکێکی بەدەستەوەیە و دەمانچەیەکیشی لە کەمەر بەستووە. چەکەکەی بە دەستی ڕاستی گرتووە و جگەرەکەشی لەنێوان پەنجەکانی دەســتی چەپیدایە. لەلایەکــی وێنەکەوە ئەم دێڕە هۆنراوەیە نووسراوە و پێشکەش بە سەفەرخان کراوە:

عەشق کە لە سەرەتادا ســەرکێش و خوێناویی بوو
هەرکەســێك ئارەزووی نەدەکرد، دووردەکەوتەوە.

لەلای سەرەوەی ژوورەکەشدا تابلۆیەکی جوانی سەفەرخان بە دەستی پەروێزی حەبیب پوور نەخشێنرابوو، چوارچێوەی تابلۆکە یەک مەتر بە هەشتا سانتیمەتر بوو.

سەفەرخان لەلای چەپمەوە دانیشتووە، هەروەک هەمیشە هێمن و لەسەرخۆیە، بە هێواشی مژی لە جگەرەکەی دەدا. من هەمیشە ئەوم بە هێمنی بینیوە، ئەو هێمنییەی ئەو وانەیەک بووە بۆ من و زۆرێک لە هاوڕێکانی. تەنانەت لە زیندانیشدا و کاتێک کە پۆلیس هەڵیکوتاوەتە سەریان، ئەو ئارامیی خۆی لەدەست نەداوە. تەسبیحە بچکۆلانەکەم لە گیرفانم دەردەهێنم. هەوا گەرمە، ئاو سەرناکەوێت بۆ نهۆمی پێنجەم، موبەریدە کار ناکات. سەفەرخان بەردەوام بە دەستەسڕەکەی ئارەقەی ناوچاوانی دەسڕێت. تەسجیلەکە پێدەکەم و دەڵێم: سڵاو سەفەرخان، من ئەمڕۆ دەمەوێت یادەوەرییەکانی تۆ تۆمار بکەم، بفەرموو: سەفەرخان، بزانم تۆ لەکوێ لەدایک بوویت؟

ئەو هەمیشە جگەرەکەی بە دەمییەوەیەتی، مژێک لە جگەرەکەی دەدات و ڕووخساری لەنێو دووکەڵدا ون دەبێت، تاکو باشتر گوێبیستی وتەکانم ببێت، گوێی چەپی لە من نزیک دەکاتەوە. ئەو گوێی ڕاستی هیچ نابیستێت. (دواتر ئەمەم بۆ دەرکەوت) سەریم لێ نزیک دەکاتەوە و دەڵێت: ئەمەی تۆ دەیکەیت پرسیار و وەڵامە، من حەز لە پرسیار و وەڵام ناکەم، چونکە من تەمەنێکە پرسیارم لێدەکرێت، وا باشترە بە ئازادانە قسە بکەم.

بەهەرحاڵ ئێستا تۆ دەست پێ بکە. چۆنت پێ باشە پرسیار بکە، منیش وەڵامت دەدەمەوە. تاقەتت هەیە قسە بکەیت... مەڵێ تاقەتت هەیە... ئاخر نامەوێت ماندووت بکەم.

سەیرێکی پەنجەرەکان دەکات و چاوی بۆ دوور دەڕوانێت...

**سەفەرخان:** من ساڵی (١٩٢١/١٣٠٠) لە گوندی شیشوان لەدایک بووم. شیشوان گوندێکی گەورەیە، بەستراوەتەوە بە دەریاچەی ئورمیەوە. گوندێکی زۆر خۆشە. خاکێکی بەپیت و سەر سەوزی هەیە. لە شارەکانی بناو و ئازەرشەهر و مەراغەوە نزیکە، بە تەنیشت شاری عەجەبشێرەوەیە، ڕووباری قەلاچای بەناو گوندەکەدا تێدەپەڕێت.

باوکم ناوی حوسێنە و دایکیشم ناوی گەوهەر تارجە. ماڵەکەمان قەرەباڵغ بوو، ژمارەمان زۆر بوو، باوکم بە تەنها نەبوو، ئەوان سێ برا بوون، هەریەکەیان چەند منداڵێکیان هەبوو، ئێستا ناوەکانیانم لەیاد نییە. هەندێکیان ئێستاش هەر ماون، هاوڕێیانی سەردەمی منداڵیم، منداڵانی گەڕەک بوون و هەموویان نەخوێندەوار بوون، هیچ شتێکیان لەبارەی ژیان و ئەم جیهانەوە نەدەزانی. نەیاندەزانی لە ژیانیاندا چی دەگوزەرێت، ئەوان لەو باوەڕەدا بوون کە دەبێت هەمیشە لە خزمەت ئاغاکاندا بن، هەمیشە لە خزمەتدا بن و لەژێر سایەی ئاغاکاندا بن. ئەگەر خوانەکردە ڕۆژێک ئاغا لە کەسێک دڵگیر ببووایە، ئەوا ئەو کەسەی دەکردە گەوری ئاژەڵەکانەوە و لەوێ زیندانیی دەکرد. زۆرێک لە ئاغاکان لەناو گەوڕەکانیاندا زیندانی تایبەتیان دروستکردبوو، ئێستاش شوێنەواری ئەو زیندانانە هەر ماون. ئەو زیندانانە قفڵ و زنجیر و هۆکارەکانی ئەشکەنجەدانیان تیادا بوو. لەدوای شۆڕشی (١٩٧٩/١٣٥٧) خەڵکی ئەو کەلوپەلی زیندانانەیان هێنایە دەرەوە و زنجیرەکانیان لە قاچیان دەبەست و وێنەیان پێوە دەگرتن و لە ڕۆژنامەی کەیهان-دا بڵاویان دەکردنەوە.

ئەو سەردەمە خەڵکانی هەژار لە ژیانێکی دژواردا بوون، لەوپەڕی بەهێزیی حکومەتی پەهلەوییدا لە (٤٧٦) گوندی ناوچەی ماکۆ، (٣٥٠) گوندیان لەژێر دەسەڵاتی (ئانال خانم)و کوڕەکانیدا بوو، لە ناوچەی خومسەی ئازەربایجان زولفەقارییەکان (٣٦٣) گوندیان لەسەر تەملیک کرابوو.

باوکی ئاغاکانی ئێمە لە قاجارەکان بوون، لەدوای عەباس میرزا،

ئیمام قولی میرزا کرا بە والی ئازەربایجان، ئەو، شــوێنی پشــوودانی، گوندەکــەی ئێمە بوو، بەڵام لە شــاری تەبرێــزەوە حکومڕانیی دەکرد. دامــودەزگا و بەڕێوەبردنی ناوچەکــەی لە تەبرێز بوو. ئەم ئیمام قولی میرزایــە دوانزە کــوڕی هەبوو، کــە هەریەکێکان لە گوندی شیشــوان کۆشکێکی بۆ خۆی دروستکردبوو. ئەوان بە تەواویی دەستیان بەسەر بــاخ و زەوی خەڵکیــدا گرتبــوو. ئــەو خەڵکە هــەژارە دەبووایە ســاڵ دوانزەی مانگ بێگاریی بۆ ئاغا بکەن. دەبووایە لە هەر ماڵێک کەســێک بــڕوات و کار بــۆ ماڵــی ئاغا بــکات، گیایان بۆ بدوورێــت، گێرەیان بۆ بکات، ترییان بۆ بڕنێت و خزمەتی باخەکانیان بکات. کاتێک ئاغا دەهات بۆ ناو گوند، هەموو خەڵکی لەبەری هەڵدەســتان و کڕنووشــیان بۆی دەبرد، خۆ ئەگەر کڕنووشــیان بۆ نەبردایە، ئەوا دارکارییان دەکردن و زیندانییان دەکردن.

کاتێک تەمەنم هەڵکشا و کاتی چوونە قوتابخانەم هات، هەروەکو هەر منداڵێکــی تر ئارەزووی فێربوونم هەبوو، بــەڵام ئاغاکان لە ناوچەکەدا هەموو دەســەڵاتێکیان هەبــوو، حەزیان بەهۆشــیاربوونەوەی منداڵان نەدەکــرد، لە گوندەکاندا دژی کردنەوەی قوتابخانە بوون، هەربۆیە من ناچــار بووم ماوەی حەوت ســاڵ لە حوجرە و لــەلای مەلاکان وانەی گوڵســتان و بووستان بخوێنم، بەڵام لەبەرئەوەی من زمانەکەم تورکی بوو، هیچ شــتێک فێر نەبووم. دوای ئەوە لە شاری عەجەبشێری نزیک گوندەکەمــان قوتابخانــە کرایەوە، منیش چووم بۆ ئــەو قوتابخانەیە و خوێندنی ســەرەتاییم لەوێ تــەواو کرد، بەڵام بەهۆی دەســتکورتی و نەبوونییەوە بەختی ئەوەم نەبوو بەردەوام بم لە خوێندن. باوکم چەند پارچە زەوییەکی هەبوو، بەهۆی چاندنی ئەو زەوییانەوە ژیانی خۆمان دابین دەکرد. هێز و ماندووبوون لە ئێمە بوو، بەرهەمیش بۆ ئاغا بوو. هەروەکو چۆن ئەبولقاســمی لاهوتی شاعیری کرماشانی هاوشاری تۆ دەڵێت:

هەوڵ و تێکۆشان لە ئێمە، بەرهەمیش بۆ کەسانی تر.

جووتیــارەکان ناچــار بوون کاری بێگاریی بــۆ ئاغا ئەنجام بدەن و خواســتەکانی ئەوان جێبەجێ بکەن. ئاغاکانیش بەردەوام بەهانەیان بە جووتیاران دەگرت.

بیــرم دێــت کاتێــک تەمەنــم حەڤــدە- هــەژدە ســاڵان بــوو، بــۆ بەدەســتهێنانی پارووە نانێک لــە کاری جووتیاریــدا، هاوکاریی باوکم دەکــرد. ئەو کات پۆلیســەکان دەهاتــن و ئــازاری خەڵکەکەیان دەدا و دواتــر تەواوی گوندنشــینەکانیان بە پێی پەتی دەبرد بــۆ مەراغە. لەو کاتەدا ناچار دەبووین بۆ ڕزگارکردنیان لە دادگا و زیندانیی نەکردنیان ڕەشوە بدەین. ئەو بەرهەمەی ساڵانە لە زەوییەکان بەرهەممان دەهێنا، زۆربــەی لەکاتی پاییزدا و لەژێر بەفر و باراندا لەناو دەچوون، ئەوەی دەمایەوە بەشــی زۆری بۆ ئاغاکان دەبوو، هەربۆیە بەشێکی زۆر کەم بۆ خۆمان دەمایەوە. ئەو بەشە کەمەی خۆمان ناچار بووین بیدەین بە ڕەشــوەی پۆلیس و دادگا. هەندێک جار گوندنشــینەکان ناچار دەبوون خۆیان نامە بۆ ئاغا بنووسن، ئەمەش نموونەیەکە لەم نامانە.

ئێمــە ماوەیەکە بەرهەمی کشــتوکاڵمان کۆکردووەتەوە، چاوەڕوانی مۆڵەتی بەڕێزتانین. ئێوە تاکو ئێســتا مۆڵەتتان پێ نەداوین کەمێک لەو بەرهەمە ببەینەوە بۆ ماڵەوە، تاکو بۆ خواردنی خۆمان بەکاری بهێنین، ئێمە زۆر برسین و پێویستمان بە خواردن هەیە.

جووتیارانــی ناوچەکە زۆربــەی تەمەنیان لــە زیندانەکانی دەوڵەت بەسەر دەبرد، یان پێوەنی زنجیریان لە پێ دەکرا و لە زیندانی ئاغاکان زیندانیــی دەکــران، خــۆ ئەگەر لــە زیندانــدا نەبوونایە، ئــەوا ئاوارە و ســەرگەردان هەر ڕۆژەو لە بنکەیەکی پۆلیس لە تەبریز و مەراغە، یان دادگاکاندا بەدوای کەسوکاریاندا دەگەڕان.

ئەوکات گرنگترین ئامرازی بەرهەمهێنان، مانگا بوو، بەهۆی ئەوەی ئاغاکان مۆڵەتیان نەدەدا مانگاکان لەو کایە بخۆن کە بەرهەمیان دەهێنا، ئــەو ئاژەڵە داماوانە لە برســاندا بە بەرچــاوی خاوەنەکەیانەوە مردار دەبوونەوە. تەواوی پارێزگای ئازەبایجان لەژێر دەســەڵاتی ئیمام قولی

والــی تەبرێزیدا بوو، گوندی شیشــوانیش بە چەقــی فەرمانڕەوایی ئەو ئەژمار دەکرا.

لە سەردەمی لاوێتیمدا بەردەوام خەریکی کارکردن بووم، ڕۆژێکیان ئەوەنــدەم کا و وێنجە دابوو بە ئەســپی پۆلیســەکان، تەواو شــەکەت ببووم. ڕووم کردە باوکم و پێم گووت: باشە بۆچی دەبێت ئێمە هەرچی هەمانە دەرخواردی ئەم مفتەخۆرانەی بدەین؟ باوکم کەسێکی دنیادیدە بوو، گووتی: کوڕم جارێکی تر ئەو قسانە نەکەیت، ئاغاکان وەک میوان ئەم پۆلیســانە دەهێننــە گوندەکەمان، ئەگەر ئێمــە ناڕەزایی دەرببڕین، دەمانکەنــە گەوڕەکانیانەوە و دارکارییمان دەکەن و زیندانییمان دەکەن و هەرچی هەمانە و نیمانە دەیبەن.

منیش لێم پرسی: مەگەر حکومەت نییە بە هانامانەوە بێت؟

باوکم بە پێکەنینێکــی تاڵەوە گووتی: حکومەتی چی؟ حکومەت واتە ئەم شــازادانە، ئەم پۆلیسانەش لەژێر دەســەڵاتی ئەواندان، ئەوان چی بڵێن پۆلیسەکان لە قسەیان دەرناچن.

خۆ تەنها ڕەنج و ماندووبوونمان لەلایەن ئاغاکانەوە بەتاڵان نەدەبرا. ئــەوان بــەردەوام زوڵم و ســتەمیان دەکــرد، ناموســی جووتیارانیان دەشــکاند، هــەر ڕۆژە و بەهانەیەکیــان دەگرت، هەر شــەوە و دەرد و مەینەتییەکیان پێ دەداین، شــەوانە بە خەم و خەفەتی تازەوە سەرمان دەخســتە ســەر ســەرین. ئەم هەموو چەوســانەوە و نادادپەروەرییە، ئێمەی بەرەو خەباتێکی حەتمی دژی نادادپەروەریی پەلکێش دەکرد.

گووتم باوکم جووتیار بوو، زەوییەکەش هی خۆمان بوو، بەڵگەشمان هەبــوو، بەڵام ئاغاکان موڵکانەیان لێوەردەگرتین. ئێمە زەویمان دەکێڵا، تۆومان دەچاند، ئاومان دەدا، تەواوی کارەکان لە ئەستۆی جووتیاراندا بــوو. دوای ئەوەی کە بەروبووم کۆدەکرایەوە، ئاغا، یان نوێنەری ئاغا دەهــات و بەرهەمەکــەی دەکردە ســێ بەش. دوو بەشــی بۆ جووتیار و بەشــێک بۆ ئاغا. جووتیار ناچاربوو بەشــی ئاغا لەگەڵ بەشــەکەی خۆیــدا ببــات بۆ عەمبار. تەنانەت کای گەنمەکەشــیان بەهەمان شــێوە

دابەش دەکرد. کاتێک کە گەنمەکەمان دەکردە عەمبارەوە، نوێنەری ئاغا دەهات دارێکی درێژی لە عەمبارەکە دەدا و لەناو گەنمەکەدا دەیچەقاند، بۆئەوەی هیچ کەسێک مافی ئەوەی نەبێت دەستکاریی گەنمەکە بکات. واتــە ئەگەر ئاژەڵێک، یــان باڵندەیەک لە گەنمەکەی بخواردایە، ئەوا ئەو دارەی کــە دایان نابوو، گۆڕانکاریی تیا بەدی دەکرا. ئەوکات بەهانەیان پێ دەگرتین، کە بۆچی ڕێگریمان لە ئاژەڵ و باڵندە نەکردووە.

شــاعیری جووتیــاران ئازەر ئوغلّــی چەندین هۆنــراوەی بە زمانی ئازەری هەیە لەسەر چەوسانەوەی جووتیاران.

ئێمــە بەردەوام لەگــەڵ ئاغاکاندا لە ڕووبەڕووبوونــەوەی یەکتریدا بوویــن. ئێمــە دەمانگــووت ئــەم زەوییانە موڵکــی خۆمانــە. ئەوانیش دەیانگــووت بەشــێک لــە داهاتەکەی بدەن بــە ئێمە. تــەواوی ئەرک و ماندووبوون لە ئەستۆی ئێمە بوو، خۆ ئەگەر بە ڕێکی حسابی بکەیت، نزیکەی سێ بەشی بۆ ئەوان دەبوو، بەشێکی بۆ ئێمە دەمایەوە. هەمیشە لە دادگای مەراغە ڕووبەڕووی یەکتری دەبووینەوە. ئەوان دەڕۆیشتن قڕان بە قڕان پارەیان لە جووتیاران کۆدەکردەوە و جووتیارەکانیشیان دەبردن بۆ مەراغە و لەوێ لە دژی جووتیارەکان ڕەشوەشیان دەدا بە دادگا. ئاغاکان دەسەڵاتیان هەبوو، حکومەتیش بە دەست ئەوانەوە بوو، لە کۆتاییدا تەواوی هەوڵەکانی جووتیاران دەبووە نەخشی سەر ئاو و لە دادگادا ئاغاکان دەبوونە براوە و جووتیارانیش دەدۆڕان.

ئیمــام قولی میرزا خاوەنی ســەر و ماڵی ئێمــە و خاوەنی ناوچەی ئازەربایجان بوو، ئەو خزمی موزەفەرەدین شــا بوو، هەر ئەویش ئەو شوێنە بەپیت و بەرەکەتەی بە ئەو بەخشیبوو. نازانم شا خاڵی بوو، یان کــوڕە خاڵی بوو. دەریاچــەی ئورمیەش هەر موڵکی ئەوان بوو، موڵکی ئاغا بوو، خۆیان کەشتییان هەبوو، ئەو کەشتییانە هی ڕووسەکان بوو، کــە لە جەنگی دووەمی جیهانیدا لە ڕێگای کەســێکی ئەرمەنی تەبرێزی گەیشــتبووە دەستی ئاغای قاسمییەکان. ئەو کەشتییانە لەنێوان ئورمیە و دانالو هاتوچۆیان دەکرد و گەشتیاریان دەهێنا و دەبرد.

بە منداڵی لە دەرەبەگەکان دەترســام، چونکە هەرکات بیانویســتایە دەهاتن و دەیانبردین لە گەورەکانیاندا زیندانیی و دارکارییان دەکردین، تا ئێرە یادەوەرییەکانم تایبەتن بە ژیانی خۆم.

**عەلی ئەشــرەف دەرویشیان: لە کەســانی بنەماڵەکەت ئەگەر کەســێکت لەیادە بۆمان باس بکە، دایــە گەورەت، بابە گەورەت، یان هەر کەسێکی تر...**

**سەفەرخان:** بابە گەورەی خۆمم بیرنایەت، بەڵام دایە گەورەم زۆر پیر بوو، هیچ شتێکی ئەوتۆشم لەبارەی ئەوەوە بیر نییە. کاتێک من لە زیندانیی بووم، دایکم کۆچی دوایی کرد. باوکم تا ســاڵی (١٩٦٢/١٣٤١) لە ژیاندا مابوو، کاتێک ئەویش کۆچی دوایی کرد من لە زینداندا بووم، هــەر لە زیندانــدا بووم کە هاوسەرەکەشــم کۆچی دوایــی کرد. دواتر باسی دەکەم کە چۆن کۆچی دوایی کرد.

گووتم لە حوجرە، مەلا وانەی گوڵســتان و بوستانی پێ دەگووتین، من ماوەی هەشت ساڵ لای مەلا خوێندم، یەک وشە فێر نەبووم، بەڵام قورئانــم خوێند، ســاڵێک لەلای مەلاباجییەک قورئانــم خوێند. کە ژنێک بوو ڕۆژانەیەک نانمان پێدەدا و ئەویش فێری قورئانی دەکردین.

کاتێک دەوڵەت هات لە عەجەبشــێر قوتابخانە بکەنەوە، دەربەگەکان ڕێگەیــان نــەدا. لە ناوچەکــەی ئێمەدا حەفتــا گوند هەبوو، لــەم حەفتا گوندەدا یەک مامۆستا نەبوو، ئەگەر کەسێک بیویستایە شتێک بخوێنێت، دەڕۆیشت بۆ لای مەلا، یان ئاخوند. دواتر چەند میرزایەک پەیدا بوون کــە تەنها یەک کتێبی فارســییان هەبوو، ئێمــە دەچووین بۆ لای ئەوان. هەرچۆنێک بێت ماوەیەک ڕۆیشــتم بۆ لای ئەوان، بەڵام یەک وشە فێر نەبــووم. تاکو ڕەزا شــا لە عەجەبشــێر قوتابخانەی کــردەوە و منیش ڕۆیشتم بۆ ئەو قوتابخانەیە و تاکو پۆلی شەشەمی سەرەتاییم خوێند. من پێشتر لای مەلاباجییەک قورئانم خوێندبوو، هەرکەسێک کە قورئانی خەتم دەکرد، هاوڕێکانی بە کۆمەڵ دەچوون بۆماڵیان و مەراسیمێکیان

دروســت دەکرد و نانی نیوەڕۆیان لەوێ دەخوارد. بەو مەراســیمەیان دەگووت (قورئان چیخما)، واتە قورئان خەتمکردن.

هەرچەندە ئێمە لە ئاغاکان دەترساین، بەڵام جووتیارەکان لایەنگری ئێمە بوون. ڕاستە کە ئێمە جووتیار بووین، بەڵام لە گوندەکەدا لایەنگرمان زۆر بوو. خزم و کەســمان زۆر بوو، گەنجی باشــمان هەبوو، گەنجی ئازا و جەســور، زۆربەی زۆری دانیشــتووانی گوندەکە یەک بەرەباب بووین. هەموومان یەک عەشیرەت بووین. هەر بەو هۆیەشەوە ئاغاکان نەیاندەتوانی وەک خەڵکانی تر زۆر ئازاری ئێمە بدەن، بەڵام هەر کاری خۆشــیان دەکرد. بۆ نموونە ڕۆژێک پۆلیس هاتن بۆ گوندەکەمان. ئاغا پۆلیسێکی هێنا بۆ ماڵی ئێمە، ئەو پۆلیسە ماوەی دە ڕۆژ لە ماڵی ئێمەدا مایەوە. کا و جۆ و وێنجەمان دەدا بە ئەســپەکەی، دەبووایە گۆشــت و قبوڵیش بدەین بە خۆی. هەموو ڕۆژێک مریشــکێکمان بۆ ســەردەبڕی. ئەو ســەردەمە پۆلیس هەموو شــتێک بــوو. کاتێک ئــەوان دەهاتن بۆ گوندەکە، ئاغا ئەوانی بەسەر ماڵاندا دابەش دەکرد، بۆئەوەی ئەو خەڵکە خەرجییان بکێشــێت. ئەوان هەرگیز پۆلیســەکانیان نەدەبردە ماڵەکانی خۆیــان. ئەی کەواتە پۆلیس بۆچی دەهاتنــە گوندەکەمان؟ چونکە ئێمە بەردەوام لەگەڵ دەرەبەگەکاندا لەکێشــەدابووین، کێشە و شەڕ لەسەر باخ و زەوییەکان.

ژیانی ئێمە بەردەوام ڕەنج و کارکردن بووە. لە تەمەنی دە ســاڵیدا کە ڕۆیشتم بۆ لای مەلاباجی فێری قورئان بووم، کاریشم دەکرد. ئێمە ڕەزی ترێی زۆرمان هەبوو، خۆت هاتوویت و بینیوتە، ئێمە سێ جووت گاجووتمان هەبوو، خەڵکانی تر یەک جووتیان هەبوو، ئێمە یەک چرکە بێکار نەبووین.

باوکــم بەردەوام جوێنــی دەدا و لێی دەداین، دەیگــووت کە بڕۆین ئالف بهێنین و گوێرەکەکان ببەین بۆ لەوەڕ و ئەســپەکان تیمار بکەین. تــەواوی لێپرســراوێتی ئەو ئاژەڵانە لە ئەســتۆی من بــوون، ئەو کاتە تەمەنم چواردە ساڵ بوو.

ڕۆژێک سکم ئازاری هەبوو، ڕۆیشتم بۆ لای حەکیم، لە گوندەکەماندا یەک حەکیم هەبوو، ناوی حەکیم کەریم بوو، ئەو گیادەرمانی هەبوو، ئەو سەگبابە دەرمانی پێ نەدام. منیش لەبەر خۆمەوە گووتم: خودایە ڕۆژێک بێت من تۆڵە لەم حەکیمە بکەمەوە. هەرچۆنێک بێت ئەو دەرمانی پێ نەدام و منیش ئازارم زۆر بوو. حەکیم کەریم کەسێکی بەهایی بوو، کوڕەکەی تا ماوەیەک لەمەوبەر لە تاران دوکانی گیادەرمانی هەبوو و دەرمان گیایی دەفرۆشێت، ئەو کوڕێکی باش بوو، لەدوای شۆڕش چەند جارێک هات بۆ ماڵمان، لەوانەیە ئەویش ئێستا هەڵاتبێت و وڵاتی جێهێشتبێت. باوکی کتێبێکی بە زمانی تورکی هەبوو، کە دەستنووس بوو، چاپ نەبوو. ئەو سوود و گرنگیی گیایەکانی لەو کتێبەدا دەخوێندەوە، لە دوای خۆی ئەو کتێبە بۆ کوڕەکەی جێما و بۆی بوو بە خێر و بەرەکەت.

عەتارەکان بە ناوی دەرمانەوە کەمێک تەپوتۆزیان کۆدەکردەوە، کە دەیانکردە ناو پاکەتی بەتاڵی جگەرەوە و دەیان دا بە ئێمە و دەیانگووت ئەمە ئەسپرینە، لەو سەردەمەدا کەپسول نەبوو، ئێمە ئەو تەپوتۆزەمان دەخوارد، هەر بۆیە ئەو کات مردن زۆر بوو. نیوەی خەڵکی گوندەکەمان کەچەڵ بوون، کوێریی و تەراخوما زۆر بوو، نەخۆشیی ئاوڵە هەبوو، ئێستاش ئەو کەسانەی تووشی نەخۆشیی ئاوڵە بوون، چەند کەسێکیان ماون و دەموچاویان کونج بووە.

ئەو ئیمام قولی میرزایەی کە والی ئازەربایجان بوو، تەواوی گوندەکانی دەوروبەری دەریاچەی ئورمیە موڵکی ئەو و دەرەبەگەکانی تر بوون، ئەوان لە کوردستانیش موڵکیان زۆر بوو، لێرەوە تاکو مهاباد زیاتر لە (٣٠) گوندیان هەبوو. لەم شوێنەی ئێمەوە تاکو مهاباد ژمارەیەکی زۆر گوند هەیە. تەواوی دەوروبەری دەریاچەی ئورمیە موڵکی ئاغاکان بوو، (خوێ)ی دەریاچەی ئورمیەش هەر ئەوان دەیانفرۆشت. زەوییەکانیش بە تەواویی موڵکی ئەوان بوو.

ئێمە دەڕۆیشتین بۆ ئەو دەشتە، دڕک و گیامان کۆدەکردەوە و

دەمانبرد بۆ ماڵی ئاغا. ئەوان زیاتر لە دووسەد ئەسپیان هەبوو، یەک مێگەل مانگا و وڵاخیان هەبوو، ئەوان مێگەلەکەیان مافی ئەوەی هەبوو بچێتە موڵک و باخی هەرکەسێکەوە و بە ئارەزووی خۆیان تیایدا بلەوەڕێن، هیچ کەسێکیش مافی ئەوەی نەبوو لە باخەکەی خۆی دەریان بکات. ئەو مێگەلە وڵاخە ئازاد بوون و مۆڵەتیان پێدرابوو. ئێستا بڕۆن لە خەڵکانی ئەو سەردەمە بپرسن و بزانن ڕۆژگارێکی چەند سەخت و پڕ لە نەهامەتییان هەبووە. لەوانەیە هەموو کەس باوەڕ نەکات کە خەڵکی ئازەبایجان چۆن لەژێر ستەمدا بوون، لە نەبوونی و برسێتیدا لە ڕیزی نانەواکاندا دەمردن. حاجی زادەی ئازەربایجان هونەرمەندێکی شانۆکار بوو، لەسەر ئەو نانە بۆگەن و ڕەق و خراپەی کە خەڵکی لە نانەواکان ڕیزیان بۆ دەگرت، بە تەنزەوە دەڵێت: هیتلەر هەر ڕۆژە دەست بەسەر وڵاتێکدا دەگرێت، ئەگەر ڕەزا شا پیاوی مەیدانە، با بێت یەک نان لەم نانە وەربگرێت، ئەگەر زۆر زۆر پیاویشە با بێت و یەک پارووی لێ بخوات.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لەو ساڵانەدا هاوڕێکانت کێ بوون؟**

**سەفەرخان:** لەو ساڵانەدا هاوڕێکانی من تەنها منداڵی جووتیارەکان بوون، بەیەکەوە دادەنیشتین و گفتوگۆمان دەکرد، کە ئاغاکان بە سواری ئەسپەکانیان دەهاتن، ئێمە ڕامان دەکرد، وامان هەست دەکرد دێن و دارکارییمان دەکەن و پێمان دەڵێن بۆچی لێرە کۆبوونەتەوە.

کاتێک ژن و کچانی ئاغا دەچوون بۆ حەمام، هیچ کەسێک مافی ئەوەی نەبوو لەناو گوندەکەدا بێت. دەبووایە هەرکەس بە زوویی بڕواتە ماڵەکەی خۆی و نەیەتە دەرەوە. خۆ ئەگەر کەسێک لە دەرەوە بووایە، دەبوو ئەو کەسە ڕووە و دیوارێک بوەستایە تاکو ئەوان تێدەپەڕین. حەمامەکەش لە کۆشکەکەیانەوە نزیک بوو، دوای گەڕانەوەی ئەوان لە حەمام، ئینجا خەڵک بۆیان هەبوو لە ماڵ بچنە دەرەوە.

**هاوسەری سـەفەرخان:** ئێمە لەگەڵ سـەفەرخان ڕۆیشتبووین بۆ شیشوان، لەمماڵەوە دەچووین بۆ ئەو ماڵ. دەچووینە هەر ماڵێک گوێم لێبوو دەیانگووت مەلەک قاسـمی مـردووە، نەفرەتی خودای لێبێت. من پرسیارم دەکرد بۆچی نەفرەتی لێ دەکەن، ئەو پیاوە کێ بووە، ئەوەندە نەفرەتـی بـۆ دەنێرن. دەیانگـووت ئەو نەدەبوو وا بە ئاسـانی بمرێت، دەبووایـە تۆڵـەی لـێ بکرێتەوە. منیـان برد بۆ ژوورێـک، ئەو ژوورە ئێستاش لە خانووەکەی سەفەرخاندایە. گووتیان کاتێک کە سەفەرخان لاو بوو شـەوێک لەگەڵ هاوسـەری خوشـکەکەی- حەیـدەر ئافاقی و ئەحمـەد فەخری نەژاد و محەمەد نووری لـە کێڵگەکەوە گەڕابوونەوە و دەیانویسـت لەو ژوورەدا نانی ئێوارە بخۆن، لەپڕێکدا خزمەتکارێکی ئاغـا بە شـڵەژاوییەوە خۆی کـردووە بە ژووردا، لێی دەپرسـن چییە بۆچـی وا شـڵەژاویت؟ خزمەتکارەکـە دەڵێت: دوێنێ شـەو هاجەریان کردبـوو بە بووک، پیاوانی ئاغا بە هێزی چەک هاجەریان لە ماڵی زاوا وەرگرت و بردیان بۆ ئاغا.

**سـەفەرخان:** بەڵـێ، ئـەوە ڕاسـتە، هەمـان خزمەتـکار کـە ئـەو بەسـەرهاتەی بۆ گێڕاینەوە، خۆشـی لەگەڵیدا بوو. گووتی: ئەو شەوە بڕیـار وابـوو کچە بچێتە ماڵی زاوا، بەڵام ئاغا ئێمەی نارد و لە پێشـدا بووکمان برد بۆ ئاغا. خۆ هەر ئەو ئاغایە ئەو جۆرە کارەی نەکردووە، لـە تـەواوی گوندەکانـی ئازەربایجان ئاغا دەسـەڵاتدار بـوون و هەر کارێکیان پێخۆشبووایە ئەنجامیان دەدا.

**هاوسەری سەفەرخان:** دوای ئەوەی کە خزمەتکارەکە باسی بردنی بووک و دارکاریکردنی زاوا و هەڵاتنی زاوای کرد، حەیدەرخان دەستی لـە خواردن کێشـایەوە، گووتـی: ئیتر ئێرە جێگای دانیشـتن نییە، ئێمە تا ئێسـتا لەگەڵ ئەمانەدا مەدارمان کردووە، بەڵام ئێسـتا دەستدرێژیی دەکەنە سـەر ناموسـمان، ئەم ئاغایانە تا ئێستا برسـییان دەکردین و ڕەنجی ئێمەیان دەخوارد، بەڵام لە ئێسـتا بەدواوە ئەوا ناموسیشـمان دەبەن. هەر لەوێ هەرچواریان دەست لە خواردن هەڵدەگرن و سوێند

دەخـۆن تـا تۆڵـە نەکەنەوە دانانیشـن. بەڵێ، ئەو کەسـەی کە ئیسـتا نەفرەتـی لێدەکەن، ئەو ئاغایە بوو کە ژیانی ئێمەشـی تێکدا. ئەو چوار کەسـە چەکیان کردە شـانیان و لەو ڕۆژەوە دەسـتیان کرد بە خەبات تـا لە کۆتاییـدا حەیدەرخانی ئافاقـی لەسـێدارەدرا و ئەحمەد فەخری نەژاد بێسـەر و شـوێن کرا و دیاریش نییە چی بەڵایەک بەسەر ژن و منداڵەکانیدا هاتووە. کەسـی سێیەمیش محەمەد نوری گوللەباران کرا. سـەفەرخانیش چارەنووسی بەوە گەیشت کە ماوەی سیودوو ساڵ لە زینداندا بێت.

**سەفەرخان:** ئاغاکان لە گوندەکەی ئێمەدا بەرنامەیەکی نوێیان پیادە دەکرد کە زۆر سەرنجڕاکێش بوو، ئەویش ئەوە بوو هەرکەسێک ئەگەر مەڕێکی هەبووایە، دەبوو یەک قڕان بدات، هەرکەسێک باخی هەبووایە، دەبـوو یـەک تومەن بدات. ئەسـپیش بڕێک باجی لەسـەر بوو. لە هەر ماڵێک کەسێک دەڕۆیشت جۆگە ئاوەکانی پاک دەکردەوە. هەموو بەهار و پاییزێـک ئەوە کارمان بـوو. ئەگەر پەتاتەمان بچاندایە بەشـێکی بۆ ئاغا بوو. هەرشتێکی ترمان بچاندایە لە گەنم و جۆ و نیسک، دەبووایە بەشـێکی بـۆ ئاغا بێت. دیارە تەنها لە گوندەکـەی ئێمە بەو جۆرە بوو، دەنـا لـە گوندەکانی تر وا نەبوو، چونکـە ئاغاکەی ئێمە لە هەمان کاتدا والی ئازەربایجان و ناوچەکەش بوو.

دواتـر ڕەزا شـا ژەهـری بۆ کـردە خواردنەوە و ئـەم ئیمام قولی میرزایەی کوشـت، هەر بەو جۆرە کەسـێکی تریشـی کوشت کە ناوی سەولەت سـەڵتەنە بوو. سەولەت سـەڵتەنە دوو سێ هەزار چەکداری هەبـوو، پێویسـتە ئـەوەش بڵێیـن کـە ڕەزا شـا چەندین کەسـی لەو چەکدارانەش کوشت، بۆئەوەی خۆی ببێتە دەرەبەگێکی گەورەتر. دواتر پاشـماوەی چەکدارەکانی هەڵاتن بۆ کوردسـتان و هەر لە کوردستان ئەوانی تریشی گرتن و خستنییە زیندان و دووری خستنەوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەو باجەی باست کرد، ساڵانە بوو؟**

**ســـەفەرخان:** بەڵــێ، ســـاڵانە پارەکەمـــان دەدا، ئـــەو گاجووتانەی جووتیان پێ دەکرا، باجیان نەدەخرایە ســـەر. دەیانگووت ئەوانە زەوی دەکێڵن، بەڵام باجیان خستبووە سەر مانگا و ساڵانە بۆ هەر مانگایەک دوو تومەنیـــان وەردەگرت. ئەو خەڵکە ئەوەنـــدە لە ئاغاکان تورەبوون لە راپەرینی ســـاڵی (١٣٥٧) هێرشـــیان کردە ســـەر کۆشکی ئاغا و هەر شـــتێکی بەردەســـتیان کـــەوت، شـــکاندیان. بـــۆ نموونە قاپـــی چینی کە نرخەکـــەی زۆر گران بوو، هەڵیان دەگرتن و دەیانکێشـــان بە زەویدا و دەیانشـــکاندن. فـــەرش و قاڵی گرانبەهایان بە چەقـــۆ دەبڕی و ئاگریان دەدان. هیچ شـــتێکیان لە ماڵی ئاغادا نەهێشـــت و هەموویان ســـووتاند. ڕێگەیان نەدا کەسێک شقارتایەکیش لەگەڵ خۆیدا بەرێت. ئەو هەڵکوتانە سەر ماڵی ئاغاکان هەمووی کەڵەکەبووی ئەو ڕق و قینەی خەڵکی بوو دەرهەق بەو زوڵم و چەوســـانەوەیەی لەسەریا بوو. وەک باسمان کرد جووتیارەکان بەردەوام دەچەوســـانەوە، ئەگەر قڕانێکیان شـــک ببردایە لەپێناوی سەلامەتیی گیانی خۆیان، وەک ڕەشوە دەیان دا بە پۆلیس. لەو بارە ناهەموارەدا ڕۆژێک گوێبیستی دەنگی فڕۆکە بووین لە ئاسمانەوە، ئەوە یەکەمجار بوو فڕۆکە ببینین، دوای کاتژمێرێک دەنگی تەقە دەهات لە نزیک گوندەکەمانەوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: تۆ ئەو کاتە لەکوێ بوویت؟**

**ســـەفەرخان:** من لەســـەر خەرمان بـــووم، خەرمانم شـــەن دەکرد، دەمویســـت کایەکە لە گەنمەکە جیا بکەمەوە. ئاسایشـــێک هەبوو ناوی حەســـەن بوو، کەســـێکی زۆر باش بوو، ســـەیرم کرد بەرەو لای ئێمە دێـــت. ئەو هاوڕێی باوکم بوو، باوکم لێی پرســـی هەواڵ چییە؟ ئەویش گووتـــی: من هیچ نازانم، بـــەڵام لەم لایەوە دەنگی تەقـــەی تفەنگ دێت، وا دەردەکەوێـــت جەنـــگ ڕوویدابێـــت. دەنگـــی تەقەکان تـــەواو لە ئێمە نزیکبوونـــەوە، تەنها پێنـــج کیلۆمەتر لێمانەوە دوور بوون. ڕوســـەکان

لەگەڵ سەربازانی ئێرانی لە شەڕدا بوون، ئێمەش خەرمانەکەمان جێهێشت و گەڕاینەوە بۆماڵەوە، لە گوندەکەدا هەرکەسە و دەستی ژن و منداڵی خۆی دەگرت و دەڕۆیشت بۆ ناو باخ و دارستانەکان، تاکو لە پەنایەکدا خۆیان حەشار بدەن. چەندین سەرباز لە (شاخی قارقا بازارِ)ی پشتی عەجەبشێرەوە هاتنە خوارەوە. سەربازەکان ئێرانی بوون، بەرەو دێهاتەکانی ناوچەی (دیزجەرود) سەرەوخوار بوونەوە، خۆیان دەخستە ناو دارستانەکە و چەکەکانیان لە کەنار جادەکەدا فڕێدەدا. ئەوان داوای جلوبەرگی ئاساییان دەکرد، تاکو لەبەری بکەن و بەرەو ماڵەکانی خۆیان بڕۆن. ئەوان چەک و جلوبەرگیان فڕێ دەدا و هەڵدەهاتن. لە هەر شوێنێکەوە بڕۆشتیتایە چەک کەوتبوو. من خۆم زیاتر لە (٥٠) چەکم کۆکردەوە. خۆتان دەزانن لەشکری (٣)ی تەبرێز چەندە چەکی هەبوو، بەهۆی ئەو چەکانەوە زۆر کەس دەوڵەمەند بوون. هەر بەهۆی ئەو چەکانەوە بوو کە ئێمەش چەکدار بووین و دواتر کەم کەم فشارمان خستە سەر دەرەبەگەکان و کەوتینە بەرگریکردن، تاکو پێش بە زوڵم و زۆرداریی ئاغاکان بگرین. چەند کەسێک لە ئاغاکان هەڵاتبوون و ڕوویان کردبووە گوندەکانی تر. کوڕەکانی ئیمام قولی میرزا دوانزە کوڕ بوون، دوانزە کۆشکیان هەبوو، ئەوان هەموویان هەڵاتبوون و هیچ کەسێکیان لە گوندەکەدا نەمابوو. ئێمە ماوەی یەک ساڵ چەکدار بووین، لە ماوەی ئەو ساڵەدا هیچ هەواڵێک لە پۆلیس و حکومەت نەبوو. لە هەر ناوچەیەکدا کەسێک حکومڕانی دەکرد. هەرکەسێک چەکداری زیاتری لەگەڵدا بووایە، ئەو براوە بوو و خەڵکی زیاتر لە دەوری کۆدەبوونەوە. ئێمەش ئەو کاتە نزیکی دوو هەزار چەکدار بووین و لە دەوروبەری گوندەکەی خۆمان بووین. دواتر هێواش هێواش خەڵکەکە چەکەکانی خۆیان فرۆشت، نرخی چەک لە سێ تومەن زیاتر نەبوو. تەنانەت بە یەک تومەن و دوو تومەنیش فرۆشتبوویان.

**عەلی ئەشـــرەف دەروێشـــیان: بەو هەموو چەکەوە چیتان کرد؟ ئەگەر ماندوو بوویت گفتوگۆکەمان هەڵدەگرین بۆ ڕۆژێکی تر.**

**ســـەفەرخان:** نەخێـر مانـدوو نەبـووم، ئـەو دەرەبەگانـەی کـە حکومڕانییـان دەکـرد، ئەوانیـش چەکداریان هەبـوو، جووتیارەکانیان دەچەوسـاندەوە. جووتیـارەکان سـاڵ دوانزە مانگ کاریـان دەکرد و ڕەنجیـان دەدا، کەچی هیچ شـتێکیان نەبوو. پەندێکـی تورکی هەیە کە بە فارسـی دەبێتە (ما امسـال پس خرمن با جووک امدیم خانە)، واتە: (ئێمە ئەمساڵ دوای خەرمان کوتان، تەنها بە شەنەکەمانەوە گەڕاینەوە بـۆ ماڵـەوە)، واتە هیچ شـتێکمان بۆ نەمایەوە جگە لە (شـەن)ەکەمان. لەو سـەردەمەدا زۆربەی هەرە زۆری خەڵکـی بەهۆی نەبوونی ڕادیۆ و ڕۆژنامـە و نەخوێندەوارییـەوە هیـچ زانیارییەکیـان نەبوو لەبارەی چۆنییەتی هەڵگیرسـانی جەنگی دووەمی جیهانییەوە. زوڵم و سـتەمی ڕەزا شـا و دەرەبەگەکان بوونە هۆی ئـەوەی کە خەڵکی ئازەربایجان چـەک هەڵگـرن و دژی ئەو هەمـوو چەوسـانەوەیە بەرگریی بکەن و داوای مافی خۆیان بکەن.

**عەلی ئەشـــرەف دەروێشیان: لەو کاتەدا تۆ تەمەنت چەند ساڵ بوو؟**

**ســـەفەرخان:** من تەمەنم بیست ساڵ بوو، کاتێک هاوپەیمانان هاتنە ئێرانەوە و ڕەزاشاش هەڵات. وەک باسم کرد تەواوی چەکەکانی تەبرێز لە گوندەکانی دەوروبەر و لە گوندەکەی ئێمەدا فڕێدرابوون، کاتێک ئێمە لە بەرامبەر دەرەبەگەکان چەکدار بووین، ئیتر ترسمان لێیان نەبوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: کاریگەریی شۆڕشی سۆڤیەت لەسەر ناوچەکەی ئێوە چی بوو؟**

**ســـەفەرخان:** لە سەردەمی ڕەزا شادا زۆرێک لە ئازەربایجانییەکان بـۆ کارکـردن بـەرەو چەمـی ئـاراس، بەتایبەت بـۆ تەفلیـس و باکۆ

ڕۆیشــتبوون، کــە گەڕانەوە بۆ ئێــران؛ کۆڵێک ئەزموونیــان هەبوو لە خەبــات و بەرگریکــردن. ئەو کاتــە ئازەربایجانی باکوور و باشــوور نەبــوو. بۆ نموونــە دەیانگووت فڵان کەس ڕۆیشــتووە بۆ (ئون تاش)، واتە بۆ ئەوبەری ڕووبار، ئەوان دەڕۆیشتن لەوێ کاریان دەکرد و برە پارەیەکیان کۆدەکردەوە، ئەوکات سنوور نەبوو، هەندێکیان ڕۆیشتن و هەر لەوێ هاوســەرگیرییان کرد و ئێستا دەستە دەستە دەگەڕێنەوە و کەســوکاریان دەدۆزنەوە. بە ئەوانیان دەگووت: ڕۆیشتووەکان. ئەوان گەڕانــەوە و بــە ئازەربایجانــدا بڵاوبوونەوە. دەچوونە هەر شــوێن و شــارێک باسی شۆڕشی سۆڤیەتیان دەکرد. بۆ نموونە دەیانگووت ئیتر ســەرمایەداران لەناوچوون و بەلشــەویکەکان بەســەر هەموو شتێکدا ســەرکەوتن و حکومــەت حکومەتــی گەلە و دەرەبەگــەکان بۆیان نییە جووتیــارەکان بچەوســێننەوە، تــەواوی دەرەبەگــەکان هەڵاتــوون بۆ وڵاتانی تر و کۆشکەکانیان جێهێشتووە و لە وڵات دوورکەوتوونەتەوە. ئەوان ئەو جۆرە هەواڵانەیان بۆ ئێمە باس دەکرد، کەوا لەوێ شــۆڕش ڕوویــداوە و دەرەبەگــەکان بەرگرییــان کردووە و دواتر تێکشــکاون. بەلشــەویک و مەنشــەویک لێرەشــەوە دەرکەوتــن. ئەوان مــاڵ بەماڵ دەگەڕان و قسەیان بۆ خەڵکی دەکرد، باسی ڕووداو و بەسەرهاتەکانیان بــۆ خەڵکی دەگێڕایەوە، هەرکەســە و ئــەوەی بینیبووی، بۆ خەڵکەکەی دەگێڕایــەوە. من لە فڵان شــوێن بــووم، فڵان ئاغا ئــەو کارەی کرد و شەڕی کرد و دوایی هەڵات بەرەو ئێران. زۆر لەو قسانەیان بۆ خەڵکی کــرد. هەر بەهۆی ئەمانەشــەوە خەڵکانی ناوچــەی ئێمە بەئاگا هاتنەوە و دەیانویســت خۆیان لە زوڵم و ســتەمی دەرەبەگــەکان ڕزگار بکەن. ئەوکاتــە نە ڕادیــۆ هەبوو، نــە ئۆتۆمبێل، نە تەلەفــۆن، خەڵکی بەهۆی گێڕانــەوەوە گوێبیســتی هەواڵەکان دەبوون. بــۆ نموونە من دەچوومە گوندێک؛ کەســێکیش لــە باکۆوە هاتبوو، ئەو دەیگــووت: دەرەبەگەکان هەڵاتــوون و جەمــاوەر خۆیان حکومەتیــان دامەزراندووە و حکومەت هەموو ئازادییەکی بۆ جەماوەر دەستەبەر کردووە.

پێشــتر ئەوەم بۆ باســکردیت، کە ئێمە هەمیشــە لەگەڵ ئاغاکاندا لە ململانێـدا بووین و بەردەوام بە ڕێـگای دابگاوە بووین. ئەوان خۆیان بــە خاوەنــی ماڵ و خاوەن ژنی ئــەو خەڵکە دەزانــی. ماڵەکانیان تاڵان دەکردن و دەیانبرد. دوای تەواوبوونی جەنگی دووەمی جیهانی و هاتنی ئــاوارەکان لــە ســۆڤیەتەوە، جووتیارەکان چوونە ســەر ئەو باوەڕەی کــە دەکرێت دژی شــا و دەرەبەگەکان خەبات بکەن و ســەرکەوتنیش بەدەســت بهێنــن، بەڵام بەو مەرجەی ڕێبەرێکیــان هەبێت. لەم ئاوارانە چەند کەســێکیان لە گوندی شیشوانی ئێمە نیشــتەجێ ببوون. شەوانە ئێمــەی خەڵکــی گوند ســەردانمان دەکردن و بە لایانەوە دادەنیشــتین. ئەوانیــش باســی ڕاپەڕینــی جووتیــاران و کرێکارانــی ئازاربایجان و باکۆیان بۆ دەکردین لە دژی ڕوســیای تزاری و سەرکەوتنی شۆڕشی سۆشیالســتی. من و هاوڕێ زەحمەتکێشــەکانی ترم هەر هەلێکمان بۆ هەڵکەوتایــە، دەچووینە لایــان و گفتوگۆمان لەگەڵدا دەکردن. بیســتنی خەبات و ئەزموونی ئەوان و ســەرکەوتنی شۆڕشــی ئۆکتۆبەر؛ ئێمەی خســتە ســەر ئەو باوەڕەی کە ئێمــەش دەتوانین لــە بەرامبەر زوڵم و ستەمدا بەرگریی بکەین و سەرکەوتنیش بەدەست بهێنین.

لــە ناوچەکــەی ئێمەدا حەفتــا گوند هەبوو، ڕۆژێــک هەموو خەڵکی گونــدەکان کۆبووینــەوە تاکو بڕۆین بۆ مەراغە بــۆ یادی ڕۆژی یەکی ئایار، ئەوکات ئۆتۆمبێل نەبوو، ناچار هەموومان بە پیادە ڕۆیشتین.

لە پڕێکدا حەوت هەشــت ئۆتۆمبێلی پڕ لە چەکدار گەیشــتنە لامان، منیش دەمانچەیەکم پێبوو، دەمانچەکەم دەرکرد و پێشم بە ئۆتۆمبێلەکان گــرت، چەکدارەکان دابەزیــن و چواردەوریان گرتین، منیش بە زوویی دەمانچەکەم دایە دەست حاجی ئاغایەک، کە تا ئێستاش لە ژیاندا ماوە و لــە گوندەکەی خۆمــان دەژی. چەکدارەکان چەند کەســێکیان گرتین و ســواری ئۆتۆمبێلیــان کردیــن و بردیانیــن. ئاخــر ئێمــە تەنها چەند کەســێک نەبووین، ژمارەمان زۆر بوو، کە دوو هەزار کەس دەبووین، ژمارەیەکــی زۆرمــان بــە پــێ هاتبووین. لەنێــوان میانــدواو و بناو و

مەراغـەدا چوارڕێیانێک هەیە، لەوێ لێپرسـراوی چەکدارەکان دابەزی و چوو بۆ لای لێپرسراوی ئەو ناوچەیە. لەوێ ئاماژەیەکی بۆ من کرد و گووتـی: ئەو کەسـەیان دەمانچەی لێ ڕاکێشـاوین. ئەو لێپرسـراوە بۆئەوەی تەمبێمان بکات، گووتی: ئادەی دەسـت لە ملی یەکتری بکەن و یەکتری ماچ بکەن. لە مەراغەوە ڕۆیشتین بۆ لای جەنەڕاڵ (کەبیری) و بەسـەرهاتەکەم بـۆ گێڕایـەوە. ئەویش گووتی: هیچ کێشـە نییە، تۆ دەتوانیت دەمانچە هەڵبگریت.

لە سەرەتای شۆڕشی (١٣٥٧) زۆر شت ڕوویداوە، کە من نەمتوانیوە باسـی بکـەم. لەو کتێبەی کە لـە ئەڵمانیا چاپ کراوە، زۆر شـت هەیە باسم نەکردووە. من ناوەڕۆکی ئەو کتێبەم بەدڵ نییە، زۆربەی وتەکان قسەی بەهرۆزە و هی من نییە. ئەوکات هەلومەرجەکە وای دەخواست کە هەندێک شت هەیە باسی نەکەم، بەڵام ئەوەی ئەوکات نەمگووتووە، ئێسـتا دەیڵێم. ئێسـتا ئەو سـەردەمە نەماوە. ئێستا پێیان خۆشە باسی بکەم و ڕاستییەکان بڵێم.

**عەلی ئەشـرەف دەروێشیان: سـەفەرخان، بێلایەنانە هەرچی دەزانیت بۆم باس بکە؟**

**سـەفەرخان:** بەڵـێ، باسـی دەکـەم، بەهەرحـاڵ ئەو شـەوەی کە خزمەتکارەکانـی ئاغا بووکەکەیان بـرد بۆ ماڵی ئاغا، ئێمە بڕیارمان دا چەک هەڵبگرین. من و حەیدەرخانی ئافاقی و محەمەد نوری و ئەحمەدی فەخـری نەژاد بوویـن. ئەو کاتە لە مەراغە کەسـێک هەبـوو بە ناوی (داداش تەقـی زادە)، ئەو لە کۆچەرییەکان بوو لە باکۆوە گەڕابووەوە، نـە نووسـینگەیەکی هەبوو، نە ئیدارەیەک، بە خـۆی و بە جانتایەکەوە گوند بە گوند و شار بەشار دەگەڕا و پڕوپاگەندەی کۆمۆنیستی دەکرد. ڕۆژێک هەواڵ هات کە داداش تەقی زادە لە مەیدانی موسلیم بە ئاشکرا لە دژی دەرەبەگەکان و حکومەت وتاری داوە و جوێنی بە دەرەبەگ و حکومەت داوە و پۆلیسیش کاریان بەسەرەوە نەبووە. ئێمەش گووتمان

مانای بەچی ئەو کەسە جوێن بە دەرەبەگەکان و بە شا بدات و پۆلیس کاریـان بەسـەرییەوە نەبێت، دواتر هۆکارەکەشـی دەرکەوت کە چی بووە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: هۆکارەکەی چی بوو؟**

**سەفەرخان:** ئەو لەلایەن چەند کەسێکی زەحمەتکێشەوە هاندرابوو، تەنانەت چەند کەسێکیش لە دەرەبەگەکان کە لە ئەنجامی خوێندنەوە و هۆشـیاریی چینایەتییەوە نەفرەتیان لە ئاغاکان دەکرد و هانیان دابوو. هەندێـک لەو دەرەبەگانە لـە گوندەکانی خۆیان زۆرێک لە موڵکەکانیان بەسـەر جووتیارەکاندا دابەشـکردبوو. لەو ڕێگایەوە خۆیان پەیوەست کردبـوو بە جووتیارەکانەوە. یەکێک لەوانە دەرەبەگێکی گەورە بوو بە ناوی (سەید مەهدی هاشمی)، کە خەڵکی سەراب بوو، دواتر لەسەر ئەو هەڵوێسـتەی ماوەی (٢٣) سـاڵ زیندانیی کرا. یەکێکی تریشیان (میرزا ڕەبیعی کەبیری) بوو، کە لە کۆتایی ساڵەکانی (١٣٢٢/١٩٤٣) لە مەراغە چووە ڕیزی جەماوەرەوە و دەستی کرد بە خەبات و جووتیارانی هان دەدا دژی ئاغا و دەرەبەگەکان بوەستنەوە.

ئێمەش کە ئەو هەواڵەمان بیسـت، بە چەکەوە و بە نهێنی ڕۆیشتین بۆ مەراغە و پەیوەندییمان کرد بە داداش تەقی زادەوە. چووینە لای و گووتمان دەمانەوێت لای تۆ ببین بە ئەندام. ئەویش زۆر خۆشحاڵ بوو، کارێکی وای لە خودا دەویست، منیش ئەو کاتە وەک ئێستا نەبووم کە تۆ دەمبینی، ئەو کات بە سەفەرخان، سەفەرخان بانگیان دەکردم.

**عەلی ئەشـرەف دەروێشیـان: ئێستاش تۆ سـەفەرخانیت، تۆ هەمیشە سەفەرخانیت.**

**سـەفەرخان:** نا، ئەو کاتە چەکدارم هەبـوو، خەڵکم لەگەڵدا بوو، بە کورتـی هەموو شـتێکم هەبوو. ئەو (تەقی زادە)یە لە خوای دەویسـت ئێمـە لەگەڵـی کەوین، ئەو پێـی گووتین بڕۆین کۆمیتەیـەک پێکبهێنین.

ئەومـــان لەگەڵ خۆماندا هێنا بـــۆ گوندەکەی خۆمان، لەوێ وتاریکی دا، ئەوەندە بە حەماســـەوە قســـەی دەکرد؛ ئاو بە دەمیدا دەهاتە خوارەوە، کەســێکی زۆر لێهاتـــوو بوو، لە کتێبەکاندا زۆر لەســـەر شـــەهامەت و لێهاتوویی ئەو نووسراوە.

کاتێک دەســتگیر کرا و بردیان بۆ گوللەبارانکردن، ئاگر و عەشــقی لێ دەباری.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: هەمان داداش تەقی زادە؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، هەمان داداش تەقی زادە.

**عەلی ئەشـــرەف دەروێشـــیان: ئەو هیچ پەیوەندییەکی هەبوو لەگەڵ حەسەن تەقی زادەی سەردەمی مەشروتە؟**

**ســـەفەرخان:** نەخێـر، ئـــەو جووتیارێک بـــوو خەڵکـــی دێهاتەکانی دەوروبـــەری مەراغـــە بـــوو، بۆ کارکـــردن ڕۆیشـــتبوو بۆ باکـــۆ. هیچ پەیوەندییەکـــی بـــەو تەقـــی زادەیـــەوە نەبوو، ئـــەم خەڵکـــی گوندەکانی دەوروبـــەری خۆمـــان بـــوو. ئێمـــە کۆمیتەمـــان دروســـتکرد و خەڵکی بەلێشـــاو دەهاتن خۆیان ناونووس دەکرد، خەڵکی ڕیزیان بەستبوو بۆ خۆناونووســـکردن، وەک چۆن ئێستا خەڵکی ڕیز دەگرن بۆ وەرگرتنی مریشـــک و هێلکـــە. خەڵکەکـــە دەیانگـــوت: ناوی ئێمەش بنووســـن. لە هەمووی ســـەیرتر ئەوە بوو نە حکومەت، نـــە پۆلیس، نە دەرەبەگەکان کاریان بەســـەر هیچـــەوە نەبوو، بە هیـــچ کەســـێکیان نەدەگووت ئێوە بۆچـــی وا دەکـــەن. دیارە ئەوەش ئاکامی ئـــەو هەموو زوڵمە زۆرە بوو کە لە خەڵکی دەکرا. ئێمە دەمانویست لە دەست چەوسانەوەی ئاغاکان ڕزگارمـــان ببێـــت و بیرمـــان لـــە دوارۆژی خۆمان نەدەکـــردەوە، ئێمە ئـــەو چوار کەســـە کە بە چەکەوە هاتبووین بـــۆ مەراغە، تەقی زادەمان دۆزییـــەوە و پێمـــان گووت: ئێمە لەگـــەڵ تۆداین و هەرچـــی تۆ بیڵێیت ئێمە لە قســـەت دەرناچین، ئەویش زۆر خۆشـــحاڵ بوو کە ئەو هەموو

خەڵکــە لــە دەوری کۆبوونەتــەوە. ئیتــر ئێمەش چووینە نــاو تیپەکەی ئــەوەوە. (میــرزا ڕەبیع کەبیری) هەبــوو، ئەویش یەکێک بــوو لە ئاغا گەورەکانی مەراغە (٧٠ تا ٨٠) گوندی هەبوو، لە سەردەمی مەشروتەدا هەموو گوندەکانی فرۆشــتبوو و دابووی بــەو خەڵکە و خواردبوویان. ئەو لایەنگری مەشــروتە بوو، ئــەو لەلایەن حکومەتەوە نازناوی ڕەبیع دەولەی پێدرابوو، هەم دەرەبەگ بوو هەم سەید، قائیمقامی ئەردەبێلیش بوو. کاتێک خەڵکی بینییان کەبیری هات و پەیوەندیی بە تیپەکەوە کرد، ئیتر هەموو خەڵکی هاتن و پەیوەندییان کرد.

**عەلــی ئەشــرەف دەروێشــیان: قائیمقامی مەراغــە بوو، یان ئەردەبێل؟**

**ســەفەرخان:** قائیمقامــی ئەردەبێل بوو، مــن ئەو کاتــە تەنها یەک ئۆتۆمبێلــم بینیبوو، ئەویش ئەو ئۆتۆمبێلە بوو کە حکومەت دابووی بە ئەو. کاتێک ئەو هاتە ناو تیپەکەوە، ئیتر خەڵکی دێهاتەکانی (١٨) ناوچە هاتــن و ئەوانیش کۆمیتەیەکیــان دامەزرانــد و هەڵبژاردنێکیان کرد و دوانزە کەســیان هەڵبژارد، ئەم دوانزە کەســەش بڵاوبوونەوە بەســەر دێهات و شارە بچووکەکاندا، کۆمیتەی ناوچەییان دروستکرد و خەڵکیی ســەردانی دەکــردن و خۆیان ناونــووس دەکرد. بــۆ نموونە کۆمیتەی ناوچەی ئێمە لە عەجەبشــێرە بوو، لە ئازەرشــەهر و بناویش کۆمیتەی ناوچەیــی کرابوونــەوە. لــە ئازەربایجان ڕۆژانە کــۆڕ و کۆبوونەوە و ســیمینار هەبــوو. دەرەبەگــەکان متمانــەی خۆیــان لەدەســت دابوو، ڕۆژێکیان ئاغایەک لەو دەشــتەوە بە ســواری ئەسپەکەی گەڕایەوە بۆ گوند، یەک کەس لەبەری هەڵنەســتا. بەناو گونددا بڵاوببووەوە کە ئاغا لە دەشــت گەڕاوەتەوە و هیچ کەســێک لەبەری هەڵنەستاوە. بەم کارە خەڵکــی زۆر دڵخۆش بوون و دەیانگووت ســەیرکەن چ گۆڕانکارییەک ڕوویــداوە. پێشــتر ئێمە بە ســواری ئەســپ دەڕۆیشــتین بۆ شــاری عەجەبشێر، ئاغاکانیش هەر بە سواری ئەسپ لە عەجەبشێرەوە دەهاتن،

که دەگەیشــتینە یەکتری، دەبووایە ئێمە لە ئەســپەکانمان دابەزین تاکو ئەوان تێدەپەڕن. دوایی ئێمە دووبارە سوار دەبووینەوە و دەڕۆیشتین، ئەوکات یاسای ئاغاکان ئاوها بوو.

**عەلــی ئەشــرەف دەروێشــیان: هەر لــەو ســاڵانەدا بوو کە هاوسەرگیرییت کرد؟**

**ســەفەرخان:** بەڵــێ، پێیان گووتــم دەبێت ژن بهێنــم، منیش ئەوەم کەوتبــووە بەر گوێ کە بەم نزیکانە شــۆڕش دەســت پێــدەکات. زۆر هەوڵیــان لەگەڵ دام، بەڵام من قبووڵم نەکــرد، لە کۆتاییدا ژنیان لە مل بەستم و ئەو ژنە داماوەشیان بەهۆی منەوە بێ چارە کرد، هەرچۆنێک بێت ڕۆیشتم و هاوسەرگیرییم کرد. ساڵی (١٣٢٤/ ١٩٤٥) بوو. ڕۆژێکیان جەنەڕاڵ (ئاتا چیف) ســەرۆکی هێزە چەکدارەکانی ســۆڤیەت لە ئێران داوای کردبوو من و حەیدەر ئافاقی و کەبیری بڕۆین بۆ تەبریز. ئێمەش ڕۆیشتین و داوای لێکردین کە ڕاهێنانی سەربازیی ببینین. ڕاهێنانیان پێ کردین و بە نهێنی هەریەکە و دەمانچەیەکی پێداین و گووتی: لە ئێستا بە دواوە ئەگەر پۆلیس هاتە سەر ڕێگاتان، ئێوە بیانگرن، یان بیانکوژن، بە هیچ جۆرێک خۆتان نەدەن بە دەستەوە. ئامۆژگاریی کردین کە چی بکەین و چی نەکەین. ئەوکات بەری تەمەنی گەیشــتبووە هەشــتا ساڵ، بەڵام ئێمە گەنج بووین. (کەبیری) کەســێکی ناسراو بوو، ئەویش پلەی بەرز بوو، فەرماندە بوو، لەدواییدا شا لەسێدارەی دا. ڕۆژێک (کەبیری) داوای لــە ئێمە کرد هاوکاریی مەلا مســتەفا بکەین و ڕێنمایی بکەین و بیبەین بۆ تەبریز. ئێمە ئەو ســێ کەســەمان گەیاندە تەبریز. واتە مەلا مســتەفا و کوڕەکــەی و پیشــەوەری. بردمانن بۆ لای جەنــەڕاڵ (ئاتا چیف) لە ئیدارەی کۆنسوڵگەریی سۆڤیەت. دیارە نەیانهێشت ئێمە بچینە ژوورەوە و لە دەرەوە ماینەوە. مەلا مســتەفا لە قازی محەمەد ناڕازی بــوو، هــەر بۆیــە پەیوەندیی بە (کەبیــری)ەوە کرد و پێــی گووت ئێمە دەمانەوێــت بێین لــە ئازەربایجان خزمەت بکەیــن. کەبیری ڕازی بوو،

ئێمەی ڕاسپارد هاوکارییان بکەین، ئێمەش بۆ بنەماڵەی مەلا مستەفا و هاوڕێکانی (١٦) ئۆتۆمبێلی بارییمان بەکرێ گرت تاکو ئەوان بهێنین بۆ ئازەربایجان و لە نزیک میاندواو لە گوندی (کوپراتۆ) نیشتەجێیان بکەین و خواردن و ژیانیان بۆ دابین بکەن. ئۆتۆمبێلەکان ڕۆیشتن و هەموویان هێنان بۆ ئازەربایجان.

لە لایەکی ترەوە، داوایان لە ئێمە کرد کە لە تەبرێزەوە دەست بکەین بە هەڵگیرسانی شۆڕش، ئێمەش بەڵێنمان دا و بەرنامەمان دانا، بەرنامەکەش بەو جۆرە بوو، ئەوان بە ئۆتۆمبێلێک ژمارەیەکی زۆری چەک بۆ ئێمە بنێرن، منیش شوێنێک دیاریی بکەم بۆ وەرگرتنی چەکەکان و بە سواری ئەسپێکی سپی بچمە سەر ڕێگای ئۆتۆمبێلەکە، لە عەجەبشێر شوێنێک هەیە بە ناوی (خانیان)، کە ئێستا پایگای عەجەبشێرە، لە خانیان جێگایەکم دەستنیشان کرد کە ئۆتۆمبێلە پڕ لە چەکەکە بێتە ئەو شوێنە و ئێمە چەکەکانیان لێ وەربگرین. ئێمەش ڕۆژی پێش گەیشتنی ئۆتۆمبێلەکە ئەو کەسانەی کە خزمەتی سەربازییان کردبوو، ناونووسمان کردن و ئاگادارمان کردن شەو لە شوێنی دیاریکراو ئامادەبن؛ تاکو چەکداریان بکەین. لە باخێکی گەورە، کە کۆشکێکی تێدا بوو، هەموویانمان کۆکردەوە. من و دوو کەسی تر لەگەڵ کەسێک کە زمانی ڕوسی دەزانی لە چاوەڕوانی ئۆتۆمبێلەکەدا بووین، بڕیار بوو ئۆتۆمبێلەکە کاتژمێر (١٢)ی شەو بگاتە لای ئێمە، ئێمەش تا کاتژمێر (١٢)ی شەو لە نزیک جادەکە چاوەڕوانمان کرد، بەڵام ئۆتۆمبێل نەهات، لەپڕێکدا گوێم لە دەنگی پێی ئەسپ بوو، پۆلیس زانیبوویان کە ڕووداوێک لە ئازەبایجان ڕوودەدات. تەنانەت تارانیان لەو هەواڵە ئاگادار کردبووەوە، کە جەنەڕاڵ (کەبیری) خەڵکی چەکدار کردووە و دەیەوێت شۆڕش بەرپا بکات. سات بەسات هەواڵەکەیان دابوو بە تاران. بەهەرحاڵ لەکاتی دیاریکراودا ئۆتۆمبێل نەهات، کاتێک پۆلیسەکان تێپەڕین، من ترسم لێنیشت، تەنها دەمانچەیەکم لەگەڵ خۆمدا بردبوو، ناچار هەڵسام و گەڕامەوە بەرەو گوندەکەی خۆمان،

واتــە بۆ لای هێزەکــەی خۆمان. لە نیوەی ڕێــگادا حەیدەرخانی ئافاقی زاوامــان منــی بینی، بــە تووڕەییــەوە گووتی: بۆ کــوێ دەچیت؟ منیش گووتــم: ئۆتۆمبێلی چەکەکان نەهات، ئەی تۆ بۆ کوێ دەچیت؟ گووتی: چەند پۆلیســێک دەیانەوێت بە شــوێن ئێمەدا بێن و بمانکوژن، ئێمەش دەبێــت ڕووبەڕوویــان بوەســتینەوە. منیــش گووتــم: هەرچۆنێک بێت دەبێت ئێمە خۆمان بپارێزین و تەقە نەکەین، چونکە بە دەنگی تەقەکان ئاشــکرا دەبین و بەرنامەکەمــان هەڵدەوەشــێتەوە. قەناعەتم پێکرد کە ئــەو کارە نــەکات، چەنــد جوێنێکی پێــدام و گەڕایەوە بــۆ باخەکە. لە بەردەمی باخەکەدا ویستی تەقە بەرەو لای پۆلیسەکان بکات، دیسانەوە ڕۆیشــتم بۆ لای و گووتــم: تۆ ئەگەر ئەوان بکوژیت، پۆلیســەکانی تر بەئــاگا دێنی و بەرنامەکەمان هەڵدەوەشــێتەوە. ئیتر ئێمە گەڕاینەوە بۆ هەمــان باخ، واتە هەمان شــوێنی یەکەمجارمــان. ئەوەندەی پێ نەچوو ئۆتۆمبێلێکــی باری هات. ئۆتۆمبێلەکە دەڕۆیشــت و دەگەڕایەوە. منیش گووتم: ئەوە ئۆتۆمبێلەکەی ئێمەیە، بۆیە بە ســواری ئەسپێکی سپییەوە ڕۆیشــتم بەرەو جادەکە. شــۆفێرەکە دابەزی و نــاوی نهێنی منی هێنا، گووتم: بەڵێ منم. بە تووڕەییەوە گووتم: بڕیار بوو کاتژمێر (١٢)ی شەو بگەیتە ئێرە، ئێســتاش وا بەرەبەیانە، مــن چی لەم چەکانە بکەم؟ چەند شــوێنێکم پێ گــووت تاکو چەکەکان ببەینە ئەو شــوێنانە. شــوفێرەکە زمانی تورکــی دەزانی. گووتی: ئەوە هیچ پەیوەندییەکی بە منەوە نییە، مــن دەبێــت چەکەکان بدەم بە تۆ، تۆش خــۆت دەیزانی چی لێدەکەیت. گووتم: زۆر باشە! ئۆتۆمبێلەکان بهێننە ناو باخەکە. واتە هەمان شوێن کە خەڵکەکەمان لێ کۆکردبووەوە. ئیتر کات بوو بە بەرەبەیان، خەڵکی ورە وردە لە ماڵەکانیان دەهاتنە دەرەوە و دەڕۆیشتن بۆ ئەملاو ئەولا. دوو ئۆتۆمبێلی پڕ لە چەک بوون؛ هاتین بۆ ناوەندی عەجەبشێر، کە پڕ بــوو لە پۆلیس، تایەی یەکێک لــە ئۆتۆمبێلەکان کەوتە جۆگە ئاوێکەوە. بــە هەزار زەحمەت تــا ئۆتۆمبێلەکەمان لە قوڕەکە دەرکرد. گەیشــتینە نێــو باخەکە. من ڕامکرد بۆ ناو کۆشــکەکە، تاکو بانگی برادەران بکەم

و بین و چەکەکان داگرین. سـەیرم کرد تەنها حەوت هەشـت کەس لە کۆشـکەکەدا ماون. گووتم: ئەم سێسەد کەسـە چییان لێهات! گووتیان ئۆتۆمبێلـەکان نەهاتن و کاتیش بوو بە بەرەبەیان، ئەوانیش ترسـان و ڕۆیشتن. بەو چەند کەسەم گووت کە لەوێ مابوون، گووتم: چەکەکان دابگـرن و لـە دەوری باخەکـەدا ئێشـک بگـرن، هەمـوو چەکەکانیان داگـرت. چەکەکانیـش هەموویان (بڕنەو) بـوون، یەکێک لە بڕنەوەکانم هەلگرت سـەیرم کرد لە ڕۆن هەڵکشـاوە. چەکەکانم جێهێشت و لەگەڵ حەیدەرخانی ئافاقی بەرەو گوندەکە ڕۆیشـتین، لە ڕێگا هەر کەسێکمان دەبینـی دەمانگـووت بڕۆ بۆ باخەکـە و چەک وەربگرە. بـاش بوو لە مـاوەی نیو کاتژمێردا بـرادەران کۆبوونەوە، ئەوانەی ڕۆیشـتبوون و خەوتبـوون هەموویان گەڕانەوە. لە پێشـدا ڕۆیشـتین گەڕاین بەدوای پۆلیسەکاندا، سەرەتا ئەوانەی لە ماڵەکانیاندا بوون، هەموویانمان چەک کـرد، ئەوانەی لە دەوروبـەری چایخانەکانیش بـوون چەکەکانمان لێ وەرگرتن. هاوڕێیانمان هەموویان سەربازییان کردبوو و شارەزا بوون لـە بەکارهێنانی چەکدا، بـە زوویی چەکەکانیان پاککردەوە و ئامادەیان کـردن. بە فەرماندەیی حەیدەرخانی ئافاقی ڕۆیشـتین گەمارۆی بنکەی پۆلیسـی عەجەبشـێرمان دا، شـەڕە تەقە دەسـتی پێکرد، پۆلیسـەکان لـە پایگاکەیانـەوە تەقەیـان لێدەکردین، لە کاتژمێر حەوتـی بەیانییەوە تاکـو کاتژمێر پێنجی ئێوارە پۆلیسـەکان بەرگرییـان کرد، دوایی چەند ڕیشسپییەکیان بە قورئانەوە ناردە لامان و سوێندیان خوارد کە خۆیان ڕادەسـت دەکەن، تەنها مەرجیان ئـەوە بوو کە ڕێگەیان بدەین مەراغە ئـاگادار بکەنـەوە، کە دەبێت چی بکەن. گووتم ئێمە ڕێگەتان پێ نادەین پەیوەندیی بە مەراغەوە بکەن و ئاگاداریان بکەنەوە، بەڵام لەبەرئەوەی قورئانتان بە دەستەوەیە هیچتان پێ ناڵێین. ئیتر ئەوان تەسلیم بوون و چەکەکانمان لێ وەرگرتن، ڕۆیشتین پۆلیسەکانی بەندەری ئورمیەشمان چەک کرد، واتە ئەو شـوێنەی کە کەشتییەکان لە ئورمیەوە دەهاتن بۆ عەجەبشـێر، بە کارمەندانـی بەندەرەکەمان گووت: ئێمە پاسـەوانین و

هیچ کارێک ناکەین، تەنها لێرە ئێشک دەگرین و کارمان بەسەر ئێوەوە نییــە، بەڵام دواتر هێنامانن و زیندانییمان کردن، دوایی ئاگادارکراینەوە کــە بیانگوازینەوە بۆ (خوجەمیر)، کە هێزەکەی جەنەڕاڵ کەبیری لەوێ بوو، ئێمە تەواوی ئەو پۆلیســانەی دەســتگیرمان کردبوو، بردمانن بۆ ئــەوێ، دواتر هەواڵیان بۆ ناردین کە جــادەکان بگرین. ئێمەش جادەی نێــوان تەبرێز و مەراغە و مەهابادمان گرت، ئەو ســەردەمە ئۆتۆمبێل زۆر کــەم بوو، ئەوەی هەبــوو ئۆتۆمبێلی باری بوو، ئۆتۆمبێلی تایبەت بوونی نەبوو.

ئاغاکانی ئێمە زۆربەیان لە گوند بوون و لە کۆشــکە هاوینەکانیاندا بوون، ئێمە بە زوویی ڕۆیشتین دەوری کۆشکەکانمان گرت، چووین لە ژوورێکدا دانیشــتین و گووتمان بەڵێ ئەمە کۆتایی زوڵمەکانتانە، ئێستا ئێــوە پاداشــتی خراپەکاریتــان وەردەگرنەوە، ئەوان زۆر ترســابوون. ئەوانمان لە ماڵەکانی خۆیاندا زیندانیی کرد و شەو ئێشکمان لێ گرتن. بــرای یەکێک لە ئەوانەی کــە زیندانییمان کردبوون، لــە نزیک مەهاباد گوندێکی هەبوو ڕۆیشــتبوو بۆ سەردانی گوندەکەی، ئەو لەوێ هەواڵی زیندانییکردنی کەسەکانی زانیبوو، دەڕوات و هەواڵ دەدات کە تەواوی کەســەکانی زیندانیی کراون. ئەم هەواڵە بە ئێمەش گەیشــتەوە. ئێمەش بە دووســەد بۆ سێســەد چەکدارەوە بــەرەو مەراغــە بەڕێکەوتین، لە ڕێــگا بینیم کە ئــەم ئاغایە لەگەڵ قازی محەمەد-دایــە و بەرەو تەبرێز دەڕۆن. منیش هیچم نەگووت، چونکە زانیم لەگەڵ قازی محەمەد-دایە. ئــەو ئاغایە خزمایەتی لەگەڵ قازی محەمــەد-دا هەبوو. قازی محەمەد هەواڵــی بۆ (کەبیری) ناردبوو کە ئێــوە برادەرانتان ئاگادار بکەنەوە لە عەجەبشــێر و شیشــوان ئازاری ئاغاکان نەدەن، هەڵەی ئێمە ئەوە بوو کە لە هەمان ژووردا ئاغاکانمان نەکوشت. بەهەرحاڵ ئەوانیان سواری ئۆتۆمبێــل کرد و بردیانن بۆ تەبرێز. کوردەکان لەگەڵ ئاغاکانی گوندی ئێمە خزمایەتییان هەبوو، ژنی محەمەد حوســێن خانی سەیفی قازی لە ئاغاکانی گوندی ئێمە بوو. محەمەد حوسێن سەیفی قازی هەم وەزیری

پێشـــمەرگەی کوردســـتان بوو، هەم جەنەڕاڵ بوو. ئیتر ئێمە نەمانتوانی هیـــچ لەگەڵ ئاغاکاندا بکەین، تەنها ئەســـپەکانیانمان برد، دووســـەد بۆ سێســـەد ئەســـپیان هەبوو، هەموویمان بـــرد تاکـــو چەکدارەکانمان بۆ ســـواری بەکاریان بهێنن. ئێمە ناوچەکەمـــان ئارامکردەوە و ئاغاکانمان هەمـــوو چەک کرد. ڕۆژێک هەمـــوو ئاغاکانمان دەســـتگیرکرد و چەند ڕۆژێـــک ناوچەکە لەژێـــر کۆنترۆڵی ئێمەدا بـــوو. جادەکانمان کۆنتڕۆڵ کردبـــوو، ڕۆژێکیـــان ئۆتۆمبێلێک هـــات هەموو سەرنشـــینەکانی فارس بوون، ئێمە ئەوانمان گرت و ڕۆیشـــتم لە عەجەبشـــێرەوە تەلەفۆنم بۆ تەبریـــز کرد، ئەوان لـــە وەڵامدا گووتیان کارتان بەســـەریانەوە نەبێت، ڕێگەیان بدەن با بڕۆن بۆ کوردســـتان، بۆئەوەی مەشقی سەربازیی بە کوردەکان بکەن.

ڕۆژێـــک هەواڵمان بۆ هات کە ئەفســـەرێکی پلەباڵایان بە برینداریی هێناوەتـــە گوندەکەمـــان، ئـــەو ئەفســـەرە ڕۆیشـــتبوو بـــۆ مەراغە تاکو جەنەڕاڵ کەبیری دەســـتگیر بـــکات، بە هاوکاریی ڕوســـەکان جەنەڕاڵ کەبیری لە دەستی ئەو ئەفسەرە و سوپاکەی ڕزگاری ببوو، ئێمە هێشتا مەراغەمـــان نەگرتبوو، بەڵام دەرورووبەری شـــارەکە لەژێر دەســـەڵاتی ئێمەدا بوو، میاندواو و ئازەرشەهر و تەواوی شارە بچووکەکان لەژێر دەسەڵاتی حکومەتدا بوون.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: مەراغەش لەدەست حکومەتدا بوو؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، مەراغە لەژێر دەسەڵاتی حکومەتدا بوو، بنکەیەکی بەهێزیـــان هەبـــوو، بەڵام ئێمـــە تەواوی شـــارەکانمان گەمـــارۆ دابوو، تەواوی شارەکان گەورە و بچووک گەمارۆ درابوون، ئێمە چاوەڕوانی ئەوە بووین کە هێرش بکەین. بەهەرحاڵ ئەو ئەفسەرەی ڕۆیشتبوو بۆ دەســـتگیرکردنی (کەبیری)، خۆی لە تێکهەڵچوونەکـــەدا بریندار دەبێت. خەڵکـــی دەیانگووت: یەکەم بڵێســـەی شۆڕشـــی ئازەربایجان لە گوندی شیشوان بووە. ئێمە، (١٦) گوند ڕاپەڕین و خۆمان چەکدار کرد.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەوە ساڵی چەند بوو؟**

**سەفەرخان:** ساڵی (١٣٢٤/ ١٩٤٥) بوو. بەهەرحاڵ ئەفسەرە بریندارەکەیان هێنا و بردیان بۆ کۆشکی ئاغاکان، گوایە ئەم ئەفسەرە دەڕۆیشت بۆ سەفارەت تاکو (کەبیری) و ئەوانی تر ببینێت و مۆڵەتیان لێوەربگرێت، کە سەربازەکانی ببات بۆ شیشوان و ئەو پۆلیسانەی کە چەککراون، ڕزگاریان بکات، بەڵام لە سێ ڕێیانی مەراغە و بناو و میاندواو ڕوسەکان پێشیان پێ دەگرن، لە ئۆتۆمبێلەکانیاندا چەند ئەفسەرێکی تێدا دەبێت. نامەیەکیان پێبوو کە کارمەندانی ڕێگای تەبریز (سۆڤیەتییەکان) نووسیبوویان ئەم کەسانەی وا دێن، کارتان بەسەریانەوە نەبێت، بەڵام لە شوێنێکی ترەوە فەرمان دەکەن کە ئەوانە دەستگیر بکەن، ئەوانیش تەواوی جادەکانیان گرتبوو. سەرنشینانی ئەو ئۆتۆمبێلە کەسانی باش نەبوون. ئازەرشەهر لەدەست ئێمەدا بوو، کاتێک ویستیان لە ئازەرشەهرەوە تێپەڕن، ئەو کەسە خراپە دەبینن و دەناسن، تایەی ئۆتۆمبێلەکەی پەنچەر دەکەن و کەسەکە دەستگیر دەکەن و هەر لەوێ جووتیارەکان چەند فیشەکێکی پێوە دەنێن و دەیکوژن.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: هەر هەمان ئەو ئەفسەرە بریندارە.**

**سەفەرخان:** بەڵێ، هەمان بریندار.

**هاوسەری سەفەرخان:** سەرهەنگ موعین ئازاد.

**سەفەرخان:** دوایی کە دەستگیر کرام و خستیانمە زیندان، ئەو تاوانەیان خستە ئەستۆی من، چونکە ئازەرشەهر لەژێر دەسەڵاتی ئێمەدا بوو، دەیانگووت من فەرمانی ئەو کارەم کردووە. لەکاتێکدا کە جووتیارەکان دادگاییان کردبوو و کوشتبوویان، هەر بەو هۆیەشەوە چەند کەسێک لە هاوڕێیانی ئێمە لەسێدارە دران. خۆ ئەگەر لە شوێنێکی وەک ماکۆ تۆیان دەستگیر بکردایە، پێیان دەگووت کە تۆ دەستت

هەیە لە کوشتنی سەرهەنگ موعین ئازاد. ئەوە بوو کوشتنی سەرهەنگ موعین ئازاد بوو بە ناوێک و ناوی لە دۆسـیەی تەواوی زیندانییەکاندا هەبوو، یەکێک لەوانە من بووم، کە دەیانگووت تۆ فەرمانی کوشتنیت دەرکردووە، بەڵام من فەرمانم نەدابوو، بەڵکو ڕوسەکان فەرمانیان دابوو بە کوشتنی، گووتبوویان ئەو کەسە دەیەوێت بڕوات بۆ تاران و لەوێ پڕوپاگەندە بکات، بەهەرحاڵ دادگای بیابانیان پێکهێنا و کوشتیان.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەم سەرهەنگ موعین ئازادە کەسێکی چۆن بوو؟**

**سەفەرخان:** هەموو دەسەڵاتێکی لە لەشکری مەراغەدا هەبوو، هەواڵەکانی مەراغەی دەدا بە تاران، وەک پێشتر گووتم ڕۆیشتبوو بۆ لای جەنەڕاڵ (کەبیری) تاکو مۆڵەتی بدات و بڕوات بۆ شیشوان، بۆئەوەی ئەو چەکانەی کە خەڵکی لە پۆلیسەکانیان وەرگرتبوو، ئەو وەریان بگرێتەوە. ئەم کارەش لە ڕوانگەی جووتیارەکانەوە تاوانێکی گەورە بوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: بۆچی بریندار ببوو؟**

**سەفەرخان:** گووتم: کە موعین ئازاد ڕۆیشتبوو بۆ لای ڕوسەکان، ویستبووی کۆنسولگەر بێنێتە دەرەوە. یەکێک لەو کەسانەی کە ئێمە بۆ پاسەوانیی ناردبوومان، پێی دەڵێت بوەستە و تەقەی لێدەکات. سەرهەنگ بریندار دەبێت و فەرمانداریش کە لەلایەوە دانیشتبوو فیشەکێکی بەردەکەوێت و دستبەجێ دەمرێت. من ناوی ئەو سەربازەی کە تەقەی لێکردبوو، لە ڕۆژنامەدا خوێندمەوە، ئێستا ناویم لە یاد نەماوە، ناوی فەرمانداریشم بیرچووەتەوە.

**عەلـــی ئەشـــرەف دەروێشـــیان: تۆ بەهـــۆی ئـــەو ڕووداوەوە دەستگیرکرایت؟**

**ســـەفەرخان:** من لە لەشـــکری ئازەربایجان؛ فەرماندەی فیداییەکان بووم.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: دەزانم دوای ئەوەی ئەو کوژرا، تۆ دەستگیرکرایت؟**

**هاوسەری سەفەرخان:** دوای یـــەک ســـاڵ لە دامەزراندنی حکومەت ئەو دەستگیرکرا.

**سەفەرخان:** حکومەت لە دەستی خۆماندا بوو، ئەو کوژرا و لێبووەوە، دوای ئەوەی ئەو کوژرا؛ حکومەت ماوەی یەک ســـاڵ لە دەستی ئێمەدا بوو، من ئاگاداری ئەو ڕووداوە بووم، بەڵام پەیوەندییم بە کوشتنەکەیەوە نەبوو، ڕوسەکان بەڵگەی جاسوسییان پێ گرتبوو، خەڵکیش کوشتیان. خەڵکی توڕە بوون و زۆر کەســـیان گوللەباران کرد، یەکێکیش لەوانە ئەو بوو، من ئەفســـەر بووم، فەرماندەی ناوچەیەک بووم، ڕۆیشـــتم بە هـــەزار زەحمەت حەفتا ئاغام دەســـتگیرکرد و هێنامن بۆ تەبرێز، لەوێ دووانیـــان لەسـێدارەدران. واتە عەلی ئەشـرەف خان و ســـەمەدخانی ئیفتیخـــاری و ئەوانـــی تریش ئازادکـــران، هەربۆیـــە تاوانبارکردنی من، تاوانێک و دوو تاوان نەبوو، خۆ ئەگەر نەڕۆیشتمایە بۆ عێراق، هەر لە هەمان شـــوێن دەستگیر دەکرام و دەیانکوشتم. میاندواو و ئازەرشەهر و تەبرێز گەمارۆدرابوون، ئێمە خۆبەسەر ئەم کارەمان کرد، گووتم با دەســـت بەسەر ئازەرشـــەهردا بگرین. دووسەد بۆ سێسەد چەکدارمان کۆکـــردەوە و بەڕێکەوتیـــن، پڕی یـــەک ئۆتۆمبێل چەکمـــان پێبوو. ئێمە گەیشتینە ئازەرشەهر و بووین بە دوو بەشەوە، بەشێک بۆ لای چەپی شـــار و بەشێک بۆ لای ڕاستی شار. نزیکی بەرەبەیان بوو، شەوەکەی لە گوندێک بە ناوی (شـــیرامین) پشـــوومان دا. گەیشتینە ئازەرشەهر و هەردوو بەشـــەکە لە یەک شوێن کۆبووینەوە، ڕاست و چەپ گەیشتینە

ئەو شــوێنەی کە بنکەی پۆلیس و سوپای لێبوو، کاتێک ئێمە گەیشتین، ئەوان تەقەیان دەســتپێکرد. لــە تەبرێزیش ئەو هەواڵەیــان زانیبوو کە ئێمە ڕۆشتبووین بۆئەوەی دەست بەسەر شاری ئازەرشەهردا بگرین، پۆلیســێکی زۆر کۆببوونەوە. ئێمە پۆلیســەکانمان گەمارۆ دا، شوێنەکە وابوو ئەوان لە بەرزیی بوون و ئێمەش لە خوارەوە، بەبێ ئەوەی ئێمە ئاگادار بین دەســت بەسەر شــارەوانیدا گیرابوو، فەتحی ناوێک هەبوو لێپرســراوی تیــپ بوو، شــەریف زادەیەکیش هەبوو کە ئەفســەر بوو، ســەیرم کــرد فەتحی وا خەریکە شــەریف زادە دەکوژێــت. بە فەتحیم گووت: ئەوە چی دەکەیت؟ ئەو پاسەوانە، با پلەکەشی ئەفسەر بێت. من ئەوم ڕزگار کرد، ئەو کارەشــم حوکمی منی ســوک کرد و لە حوکمی لە ســێدارەدانم کەمی کردەوە. ئەوان تا نزیکی نیوەڕۆ بەرگرییان کرد. چەند ناوچەیەکمان لەناو شاردا گرت، دواتر ئێمە سوێندمان بۆ خواردن کــە گیانیــان پارێزراو دەبێت و ئەوانیش خۆیان دا بەدەســتەوە و ئێمە سواری ئۆتۆمبێلمان کردن و بەڕێمان کردن بۆ گوندی (خوجەمیر)، ئیتر لە (١٨)ی ئازەر بەدواوە شــار لەژێر دەســەڵاتی ئێمەدا بوو. بەردەوام لــە تەبرێزەوە فەرمانمان بــۆ دەهات کە نەهێڵین تاڵانیی لە شــارەکەدا ڕووبــدات و نانەواکان بکەینەوە و نەهێڵیــن خەڵکی ئازار بدرێن. چەند پۆلیســێک دیواری ماڵە حاجییەکیان کون کون کردبوو ڕۆیشتبوون بۆ دزی، ئێمەش ئەوانمان دەســتگیر کرد، دواتر ڕوون بووەوە کە حاجی خۆی دەســتی هەبووە لە هاوکاریکردنیان، بۆیە هیچمان بە پۆلیسەکان نەگووت و هیچیشمان بە حاجی نەگووت.

ڕۆژی ١٨ی ئازەر بوو کە فەرمانمان بۆ هات بڕۆین بەرەو تەبرێز، ئێمــەش بەڕێکەوتیــن، تەواوی هێزەکانی تر لە مەرەند، میانە، ســەراب کۆبوونــەوە و ئەوانیــش بــەرەو تەبرێــز بەڕێکەوتن و شــاری تەبرێز گەمــارۆدرا. ســەرەتا بە ئێمەیان گووت لەســەر جادەکان بە ســواری ئەسپ بسووڕێینەوە، دواتر پەشیمان بوونەوە و گووتیان ئەوە کارێکی باش نییە، ئێمە ماوەی حەوت هەشت ڕۆژ لە (سەردرود) بووین، دواتر

فەرمانیـــان پێکردیـــن لە (مارەڵان)ەوە هێرش بکەین بۆ ســـەر بازگەکە. ســـەرتیپ درەخشـــانی فەرماندەی لەشـــکری تەبریز بوو، بە دوو جۆر باســـی ســـەرتیپ درەخشـــانی دەکرا. یەکێکان ئەوەبوو دەیانگووت ئەو پیـــاوی ڕوســـەکانە، ئەوی تریـــان دەیانگووت لەبەرئـــەوەی نەیتوانیوە بەرگریـــی بـــکات، فەرمانیـــان پێکردووە تەسلیم ببێت. بـــە هەرحاڵ لە تەبریز شـــەڕە تەقە دەســـتی پێکـــرد، دواتر فەرمانیان کـــرد ئاگادار بن خراپەکاریی لە شـــارەکەدا ڕوو نـــەدات و خۆتان ڕێک بخەن و مەهێڵن هیچ کەســـێک خوێنـــی لێبێت، بـــا دوکانەکانیش کراوە بـــن. ئێمە بەرەو کێوەکانی (مارەڵان) ڕۆیشـــتین. شـــەڕ دەســـتی پێکرد و گەیشـــتینە ناو ســـەربازگاکە، ســـەیرم کرد ســـەربازگاکە کەســـی تێدا نییـــە، بەڵام پڕ پـــڕە لە چـــەک. کەســـێک ئەســـپەکەی مرداربیـــووەوە، ئەســـپێکی تری گرتبـــوو بە زوویی چەکدارەکانی ئێمە تەقەیان لێکرد و کوشـــتیان. ئەو ئەســـپەکەی خۆی مرداربیووەوە ئەسپێکی تری حکومەتی گرتبووەوە. ئێمە لە ســـەبازگاکەدا نزیکەی دوو هەزار کەس دەبووین. پیشـــەوەری گەیشـــتە لامـــان و بە زاواکەی ئێمەی گووت: تـــۆ بۆ ماوەی دە خولەک لێپرسراوی ئێرەیت. هەندێک کەس بۆ دزیی و تاڵانیکردن ڕۆیشتبوون، هەندێکیان چەک و فیشەکیان بەردەست کەوتبوو. هەر لەناو حەوشەی ســـەربازگەکەدا دوو کەس گوللەباران کـــران، چونکە چەکیان دزیبوو. پیشـــەوەری بـــە ئێمەی گـــووت: بڕۆین بەرەو گوندی (مـــارەڵان) کە لە نزیـــک تەبریـــز بوو. گووتی: بـــڕۆن و منیش کاتی عەســـر وتار دەدەم. بەو شـــێوەیە هەرکەســـێک لە هـــەر ڕێگایەکەوە هاتبـــوو، دەبووایە لەو ڕێگایـــەوە بگەڕێتەوە. تەنانەت ڕێگایان پێ نەداین بچینە ناو شـــارەوە. ئێمە زۆربەمان ســـواری ئەســـپ بووین و گوێمان بە قســـەکانیان نەدا. بەهەمان شـــێوە شـــەقامەکەمان گرت. نازانم شـــەقامی پەهلەویی بوو، چی بوو. هاتن ڕێگایان پێ گرتین و گووتیان لە کام ڕێگایەوە هاتوون، هـــەر لەو ڕێگایەوە بگەڕێنەوە. ئێمـــەش گەڕاینەوە و ڕێگامان گرتە بەر بـــە هەمان ڕێگای کە پێیدا هاتبووین. (میر ئەژدەر باقرۆف) ســـەرۆکی

پۆلیسی تەبریز بوو. بە تووڕەییەوە هات و گووتی: سەروان ئەمانە کێن؟ منیش گووتم: منم، ئەویش گووتی: منم، هەرکەسێک هەیت، خۆت بناسێنە. باقرۆف گووتی: ئەگەر یەک جاری تر بێیتە ئێرە بڕیار دەدەم کەلەپچەت بکەن، تۆ مافی ئەوەت نییە قاچ بخەیتە ناو تەبریزەوە، لە هەمان شوێنەوە کە هاتوویت، هەر لەوێوە بگەڕێرەوە، بڕۆن بۆ هەمان ئەو گوندەی کە پیشەوەری بۆی دەستنیشان کردوون. ڕێگاکە زۆر سەخت بوو، هەموو کێو و شاخ بوو، ڕۆیشتن پێیدا زۆر ئەستەم بوو. ڕوومان کردە کێوەکە، کاتێکمان زانی لە دەرەوەی تەبریزین. عەسری ڕۆژی (٢١)ی ئازەری (١٣٢٤/ ١٩٤٥) پیشەوەری کابینەی حکومەتەکەی لە ئازەربایجان بەم شێوەیە ڕاگەیاند:

١-سەرۆک وەزیران: سەید جەعفەری پیشەوەری.

٢-جەنەڕاڵ کەبیری، وەزیری ڕێگا و پۆستە و گەیاندن.

٣- غولام یەحیای دانشیان، وەزیری بەرگریی.

٤-دکتۆر سەلامولڵای جاوید، وەزیری وڵات.

٥-تودەیی جەعفەری کاویان، وەزیری سوپا.

٦-دکتۆر مهتاش، وەزیری جووتیاران.

٧- محەمەد بیریا، وەزیری ڕۆشنبیریی.

٨-دکتۆر ئاورنگی، وەزیری تەندروستی.

٩-غولام ڕەزای ئیلهامی، وەزیری دارایی.

١٠-یوسف عەزیما، وەزیری داد.

١١-ڕەزای ڕەسوڵی، وەزیری بازرگانی.

١٢-وەزارەتی کار، تا وەزیری بۆ دابین دەکرێت، سەرۆک وەزیران سەرپەرشتی دەکات.

١٣- فەرەیدوونی ئیبراهیمی، وەزیری ماف.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: وەزیری دەرەوەتان نەبوو؟**

**سەفەرخان:** نەبابە، خۆ ئێمە وڵات نەبووین.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشیان: باشــە، کاویان وەزیری جەنگی تیپێک** بوو؟

**سەفەرخان:** بەڵێ، غولام یەحیای دانشیان هەموو شتێک بوو، تەواوی چەکدارەکان لەژێر دەسەڵاتی ئەودا بوون. سەربازەکان لەگەڵ (کاویان) دا بوون. غولام یەحیا باوکی پێشمەرگەکان بوو. دواتر ئێمە گەڕاینەوە بۆ گوندەکەمان. شیشوان گوندێکی ناسراو بوو، خەڵکەکەشی زۆر ئازا بوون، لەوێ برووسکەیەکمان بۆ هات کە بە زوویی بڕۆین بۆ مەراغە. ڕۆیشــتین بۆ مەراغە و دەســتمان بەسەر شــارەکەدا گرت، لە ڕاستیدا زیندانییەکانمــان ئازاد کــرد و خۆمان گەڕاینەوە بــۆ بنکەکانی خۆمان لــە هەمان گوندی شیشــوان. فەرمانمــان بۆ هات کە بــەرەو میاندواو بڕۆین. ڕۆیشــتین و دەستمان بەسەر میاندواویشدا گرت. لەوێ یەکێک بــە جەنەڕاڵ (کەبیری) گووت: کەبیری بەڕێز، تــۆ کە ئازەربایجانت لە دەستی دەرەبەگەکان ڕزگار کرد، ئەی بەرنامەت چییە بۆ ڕزگارکردنی لوڕ و بلوجەکان؟ (کەبیری) گووتی: ئێرە بۆ شۆڕش گونجاو بوو، بۆیە لێرەوە دەســتمان پێکــرد. زۆر هۆکاریش هەبوون کە ئێمەی تووشــی شکست کرد، پێویستە ئەگەر کات هەبێت بەوردیی باسی بکەین.

**عەلی ئەشرەف دەروێشــیان: هەرچییەکت پێخۆشە باسی بکە، من لە خزمەت تۆدام.**

**ســەفەرخان:** مەبەســتم ئەوەیە بە ڕۆژێک و دوو ڕۆژ ئەو باســە کۆتایی نایات.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشیان: هیچ کێشە نییە، ئەگەر ساڵێک و دوو ساڵ بکێشێت من ئامادەم.**

**ســەفەرخان:** بەڵێ، لە دووریی (٤٥) کیلۆمەتر لە گوندەکەی ئێمەوە کێویــک هەیە بە ناوی (گوردن ئاداســن) بە مانــای دوورگە. ئەم کێوە

لە ناوەڕاستی دەریاچەی ئورمیەیە، لە سەردەمی کۆندا بزنە کێوییان بردووە و لەو کێوە بەرەڵایان کردوون. ئەو شوێنە پڕ بووە لە مێگەلە بزنە کێویی. ئێستا ئەم سروشتە ببینە، لەناو ئەم دەریاچەیەدا یەک دانە ئاژەڵ نابینی و هەمووی خوێیە، بەڵام لە ناوەڕاستی کێوی ناو دوورگەکە کانیاوێک هەیە، کە ئاوەکەی شیرینە. لە کۆندا زستانان بۆ لەوەڕاندن مەڕەکانیان دەبرد بۆ ئەو کێوە و هاوینان دەیانهێنانەوە، ئەو کێوە هەمیشە سەوزە و لە نزیک شیشوانی گوندی ئێمەیە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: دوای ئەوەی کە تەبریز و مەراغە و میاندواو و شارە گەورە و بچووکەکانی دەوروبەر کەوتنە ژێر دەستی دیموکراتەکان، ئێوە چیتان کرد؟**

**سەفەرخان:** ئێمە گەیشتینە میاندواو، نازانم میاندواوت بیرە، یان نا، شارێکە نیوەی دانیشتووانەکەی کوردن و نیوەکەی تری تورکن. ڕووبارێک بە ناوی (جەغاتو) بە ناوەڕاستی شارەکەدا دەڕوات و شار دەکات بە دوو بەشەوە. ئەم ڕووبارە لە زاگرۆسەوە هەڵدەقوڵێت و دێتە شاری سنە و دواتر دەڕژێتە دەریاچەی ئورمیەوە. ئێمە لە میاندواو بووین کە فەرمانمان بۆ هات بڕۆین بەرەو ئورمیە. لەوێ سەرتیپ زەنگەنە بەرگریی دەکرد. دیموکراتەکان دەستیان بەسەر هەموو شوێنێکدا گرتبوو، بەڵام ئەو لەوێ بەرگریی دەکرد. کوشتارێکی زۆری کردبوو، لە سوپاکەی خۆشی کوژراوێکی زۆر هەبوو، ژمارەیەکی زۆریش لە لایەنگرانی شا هاوکاریی ئەویان دەکرد، هەربۆیە ئێمەش ئاگادارکراینەوە کە بە زوویی بڕۆین بۆ ئورمیە و دەست بەسەر شارەکەدا بگرین. دوای ماوەیەکی کەم هەواڵ هات کە بە تەواویی دەست بەسەر شاری ئورمیەدا گیراوە و زەنگەنەش دەستگیرکراوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: کێ گرتی؟**

**سەفەرخان:** دیموکراتەکان.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشــیان: لەو کاتەدا دەرەبەگەکان چییان دەکرد؟**

**ســەفەرخان:** لــە نزیک میانــدواو بەرەبابێــک دەژین پێیــان دەڵێن (چاردولــو)، نازانــم هیچ لەبــارەی ئەوانــەوە دەزانیت، یان نــا. ئەوانە زمانێکــی تایبەت بە خۆیــان هەیە، بەڵام زمانی تورکیش دەزانن، ئەوان نزیکە (٥٠٠-٦٠٠) گوند دەبن، ئەوان لە هەر ناوچەیەکدا خانێکیان هەیە. لەوێ خانەکان کۆبوونەوە و بەرگرییان دەکرد. ئێمە ڕۆیشــتین بەرەو لای تیکاب، بەڵێ، کە ســەیرمان کرد خانەکان و دەرەبەگەکان بەرگریی دەکــەن، ئەوان چەکدارێکی زۆریان هەبوو. هــەر ئاغایەک (٢٠٠-٣٠٠) چەکداری هەبوو، شــەڕێکی باشــیان لەگەڵ کردین، بەڵام دواتر توانای شــەڕکردنیان نەمــاو هەڵاتن بەرەو تیــکاب. ئێمەش ڕۆیشــتین بەرەو تیکاب کە لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی شادا بوو. دیارە ئەوان هەموویان نەڕۆیشــتبوون، هەندێکیان وا هەســتیان دەکرد کە هیچ کەسێک کاری بەسەر ئەوانەوە نییە. ئەوانەی مابوونەوە بە نهێنی کۆببوونەوە، یەکێک لەوانــە (یەمین لەشــکر) بوو، ئەو یەکێک بوو لــەو ئاغایانەی کە (٣٠٠) گوندی هەبوو، خەڵکەکەش هەروەکو خودا ئەویان دەپەرست، خەڵکەکەی ئــەوان وەک خەڵکی لای ئێمە نەبوون، هۆکارەکەشــی یــان ئەو ئاغایە کەســێکی باش بووە، یان شــتێکی تر بووە، بە گشتی لە ئەو ڕازیبوون. (یەمین لەشــکر) هەڵات و ڕۆیشت بۆ تیکاب، ئێمەش بەدوای کەوتین و ڕۆیشــتین، گەیشتینە (هۆلاسۆ)، کە وەکو پایتەختیان وابوو. لەو شوێنە کۆشــکێکی هەبوو، هەروەک کۆشکی سوڵتانەکان، کۆشکەکەی پڕ بوو لە فەرشــی گرانبەها. ئەگەر ئەو فەرشــانە ئێستا بفرۆشرانایە هەریەکە و بایــی چــل ملیۆن تومەن[1] دەبــوو. هەموو ئەو مەڕانــەی کە خەڵکی گوندەکــە هەیانبــوو، هەمووی هــی ئەو بوو. ئێمە (هۆلاســۆ)مان گرت و چەکدارمــان تێدا جێگیر کرد. (هۆلاســۆ) لە ئازەربایجاندا شــوێنێکی

١- دیارە چل ملیۆن تومەنی ساڵی ١٩٩٥ی زاینی.

ناســراوه و له (ســاین قه‌ڵا)وه زۆر نزیکه. هه‌ر له‌و ناوچه‌یه‌دا شوێنێک هه‌یه به ناوی (قه‌ڵای جیقه)، که پێشــتر میرنشــین بووه. ژنێکی پیر به چه‌نــد منداڵێکــه‌وه له‌وێ فه‌رمانڕه‌وایی ده‌کرد. ئــه‌و ژنه یه‌کێک بوو له ژنه‌کانــی عیزه‌ت ده‌ولــه. ئێمه تا نزیکی تیکاب پێشــڕه‌وییمان کردبوو، شــه‌ڕمان له‌گه‌ڵدا کردبوون، کات زســتان بوو، له نزیک تیکاب گوندێک هه‌بوو به ناوی (سه‌بخ ڕود)، که ئێمه گه‌یشتینه ئه‌وێ شه‌ڕ گه‌رم بوو، شــاخه‌کان هه‌موو به‌فر بوون. له‌و شــوێنه‌دا هه‌واڵمان بۆ هات که ئیتر پێشڕه‌ویی نه‌که‌ین.

به‌شــێکی ناوچه‌که به‌ده‌ســت (ســه‌رهه‌نگ ئارام)ه‌وه بوو، به‌شێکی تریش به‌ده‌ســت ئێمه‌وه بوو. ئه‌و سه‌رهه‌نگه ئه‌رمه‌نی بوو، فه‌رمانده‌ی ئه‌و به‌شــه‌ی جه‌نگ بوو، ئێمه نزیکه‌ی پێنج مانگ له‌و ناوچه‌یه بووین، داوامان کرد ئێمه بگۆڕن، پێشمه‌رگه‌کانمان ماندوو ببوون. شوێنه‌که‌مان به که‌سانی تر سپارد و خۆمان گه‌ڕاینه‌وه بۆ ناوچه‌کانی خۆمان. دوای چه‌ند ڕۆژێک هه‌واڵمان بۆ هات که ده‌ره‌به‌گه‌کان، واته منداڵانی (سوڵه‌ت سوڵته‌نه)، که دواتر ڕه‌زا شا به چێشتی ژه‌هراویی ئه‌وی کوشت، له‌گه‌ڵ ده‌ره‌به‌گه‌کانی تر ده‌ســتیان تێکه‌ڵ کردبوو و ده‌ستیان به‌سه‌ر هه‌ندێک له بنکه‌کانی ئێمه‌شــدا گرتبوو، پێشــمه‌رگه‌کانیان چــه‌ک کردبوو. ناچار ئێمه‌ش گه‌ڕاینه‌وه بۆیان و ماوه‌ی چل ڕۆژ له‌گه‌ڵیاندا له شه‌ڕدا بووین.

**عه‌لی ئه‌شره‌ف ده‌روێشیان: له‌گه‌ڵ ده‌ره‌به‌گه‌کاندا؟**

**ســه‌فه‌رخان:** به‌ڵێ، له‌گــه‌ڵ ئه‌و ده‌ره‌به‌گانــه‌دا، ئــه‌وان ته‌نها چه‌ند که‌ســێک نه‌بوون، ئه‌وانه بوون کــه هه‌ڵنه‌هاتبوون و به‌رگرییان ده‌کرد. ئێمــه‌ش ماڵ و زه‌وی و ئاژه‌ڵه‌کانیانمان هه‌موو به‌ســه‌ر جووتیاره‌کاندا دابه‌شــکرد. ئێمــه ماوه‌ی چــل ڕۆژ لــه‌و ناوچه‌یه‌دا له شــه‌ڕدا بووین. جاده‌یه‌کــی خۆڵ لــه میاندواوه ده‌ڕۆیشــت بــه‌ره‌و تیــکاب. ڕێگایه‌کی کوێستانی بوو، به دێهاته‌کاندا تێده‌په‌ڕی. ئێمه زۆرباش له ئاغاکانمان دا و تاکو نزیک تیکاب ڕاومانانن. ئیتر له‌وێ پێیان گووتین چیتر پێشڕه‌ویی

نەکەین. (کەبیری) و ســەرهەنگ (جاویدانی) فەرمانداری مەڕاغەشــمان لەگەڵدا بوو. چووینە (قەلاچین) و دواتر گەڕاینەوە بۆ مەڕاغە. ڕۆژێکی پێ نەچوو هەواڵمان بۆ هات کە ئاغاکانی (چاردولو) و (نەقشــارەکان) لەگــەڵ تیپەکانــی ئێمــەدا کەوتوونەتە شــەڕەوە، ئێمــەش چەند هەزار کەســێک بە ســواری و بە پیادە بەرەو لای شەڕەکە ڕۆیشتین. لەنێوان هۆلاســۆ و ســاین قەڵاوە گوندێک هەبوو، لەو گوندەدا قەڵایەکی کۆن هەبــوو، چووینە ناو قەڵاکەوە. تەواوی خەڵکی ناوچەکە چەکدار بوون، بــەڵام نەیاندەتوانی هێرش بکــەن. (عزە)خانم لەوێ بوو، ئەو پیرەژنێک بــوو، چووین بۆ لای ئەو. ئەو گلەیی لــە (کەبیری) دەکرد، کە گوایە لە کۆنــدا جەنەڕاڵ کەبیری ئاغا بووە و لەگەڵ ئەواندا بووە، بەڵام ئێســتا هەڵگەڕاوەتەوە.

**عەلی ئەشرەف دەرویێشیان: لەگەڵ عیزەت دەولەدا، هەمان ژن؟**

**ســەفەرخان:** بەڵــێ، هەمــان ژن. ئاخــر (کەبیــری) پێــش ئــەوەی بەرگریــی لە خەڵکی بکات و تەواوی دارایــی و داهاتی لەپێناو خەڵکیدا خەرج بکات، لە ســەردەمی ئاغایەتی خۆیدا دژی مەشــروتە بوو. ئێمە کۆبوونەوەیەکمــان کــرد و بــە (کەبیری)مــان گــووت: پێویســتە ئێمە هەرچۆنێــک بێت، ئەوان چەک بکەین. ئاغاکان هەموویان کۆبوونەوە و دەیانویســت لەناو خۆیاندا وتووێژ بکەن. من و هاوڕێکانم و (کەبیری) دەمانگــووت ئەوانە بە فێڵ لــە دەوری یەکتری کۆبوونەتەوە. (کەبیری) گووتــی: با لە ژوورەکانیاندا هێرشــیان بکەینە ســەر، بەڵام ئێمە ڕازی نەبووین، گووتمان ئەوان تۆ دەکوژن، چونکە هەموویان چەکدارن. بڕیار بوو هەڵســین و بڕۆین بۆ (هۆلاسۆ)، کە (٣٠) کیلۆمەتر لە (باجوق)ەوە دوورە. ئێمــە ئاغاکانمان بــۆ گفتوگۆکردن بۆ ئەوێ دەعوەت کرد. هەر لەوێ پێمان گووتن ئێوە بڕۆن بۆ لای ئەوانی تر کە لە ئازەربایجانەوە ڕۆیشــتبوون، پێیان بڵێن بگەڕێنەوە و لە شــوێنی خۆیان نیشتەجێ بن، بەڵام نەخشــەی ئەوان جۆرێکی تر بوون. یەمین لەشکر و ئاغاکانی تر

دەیانویست ناوچەکە لەژێر دەسەڵاتی خۆیاندا بمێنێتەوە. خۆ ئەگەر لەژێر دەسەڵاتیاندا بووایە، ئەوا لەگەڵ کوردستان هاوسنوور دەبوون. هەندێک لە (چاردولو)ەکان پەیوەندییان بە قازی محەمەدەوە کرد تاکو بەرگرییان لێ بکات، چونکە ئەوانیش کوردزمان بوون. کەسێک هەبوو کە بیستبووی شۆڕش دەستی پێکردووە، چوو بووە سەر شاخێک و جێگایەکی چاک کردبوو لەوێ مابووەوە، ئەو چەند کەسەی لەگەڵیدا بوون بە نهێنی لەسەر شاخەکەوە دەهاتنە خوارەوە تاکو خواردنی بۆ بەرن، ئەو ماوەی یەک ساڵ لەوێ مایەوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان:** ناوی چی بوو؟

**سەفەرخان:** سام لەشکر، بەڵێ، ئەو لە ناوچەی کوردستان بوو، ئێمە مافی ئەوەمان نەبوو بڕۆین بەرەو کوردستان و ئەو دەستگیر بکەین، یان شەڕی لەگەڵدا بکەین. ئیتر ئێمە ئاغاکانمان دەعوەت کرد کە بێن بۆ ماڵی (عزە دولە) تاکو لەوێ بەیەکەوە گفتوگۆ بکەین. نزیکەی سی چل ئاغا هاتن. ئێمە لە (هۆلاسۆ) ماڵی (یەمین لە شکر)مان کردبووە بنکەی خۆمان. ئاغایەکی زۆر خراپ هەبوو بە ناوی (سەمەدخانی ئیفتخاری)، کەسێکی بەتەمەن بوو، ئەو زانیبووی بەرنامەکە چییە، بۆیە نەهاتبوو بۆ کۆبوونەوەکە، دواتر ناردمان بە شوێنیدا و بە ناچاریی هات، ئەو نەیدەزانی لە ژوورەکەی پشتەوە چی بەرنامەیەک دانراوە. ئێمە لە (هۆلاسۆ) بڕیارمان دا یەکە یەکە ئاغاکان لە ژوورەوە بانگ بکەینە دەرەوە. بۆ نموونە بڵێین فلان کەس تۆی دەوێت. عەلیزادەیەکمان هەبوو ئەو کارەمان بە ئەو سپارد، کە ئاغاکان یەک یەک بانگ بکات. بەهەرحاڵ یەک یەک بانگمان کردنە دەرەوە و چەکەکانمان لێوەرگرتن و دەمانکردنە زیندانەوە. سەروەرخانی ئیفتخاری کە لە دەرگاکەوە هاتە دەرەوە؛ تێگەیشت بابەتەکە چییە. ئەو بە نزیکەی بیست چەکدارەوە هاتبوو. میلی تفەنگی هێنایەوە و ڕووی کردە پاسەوانەکەی ئێمە کە لەبەر دەرگاکە وەستابوو. هاوڕێیانی ئێمە بە زوویی دەوریان گرت و

چەکیان کرد، واتە بە زیندوویی دەستگیریان کرد. هەمان ڕۆژ هەموو ئاغاکانمان نارد بۆ تەبریز، کە نزیکەی حەفتا ئاغا دەبوون. خستماننە ناو ئۆتۆمبێلی بارەوە و چادرێکمان بەسەردا دان. لە تەبریز سەمەدخان و کوڕەکەی عزە دەولە و سێ ئاغای تریان لەسێدارە دا. ئەوانی تریش هەریەکە و دە ساڵ و پێنج ساڵ حوکمی زیندانیی دران، کە دواتر خۆیان ئازادیان کردن و فریای ئەوە نەکەوتن حوکمی شا ئازادیان بکات، کاتێک ئازادکران گووتیان ئێمە لە جێگایی خۆمان دەمێنینەوە و ئێوە چی بڵێن ئێمە ئاوها دەکەین.

دوای کوشتنی کوڕەکەی، عزە دەولە وەک سەگی هاری لێهات، هەمان ژن کاتێک ئازەربایجان کەوتەوە دەست ڕژێمی شا لە هەر شوێنێک چەکدارێکی دیموکراتی بدیتایە؛ دەیکوشت و ماڵەکەی تالان دەکرد، ئەو پیرەژن بوو، بەڵام خزماتکاری زۆری هەبوو. تا ناوچەکەی ئێمە دەهات و دەیگووت کێ کوڕەکەمی لەسێدارە داوە؟ دواتر ئێمە گەڕاینەوە بەرەو میانە و قافلانکۆ.

ڕۆژێک لەگەڵ (کەبیری) دەڕۆیشتین بۆ هۆلاسۆ. کەبیری گووتی: ئێمە ئەگەر لەگەڵ قازی محەمەد بووینایە، ئێستا دەستمان بەسەر تەبریزدا دەگرت و هەموو چەکدارەکانمان چەک دەکرد. ئێمەش گووتمان ئەم قسەیە چییە؟ خۆ تەبریز بەدەست خۆمانەوەیە، ئەویش پێکەنی و گووتی: باسی مەکەن با ئەوانی تر نەزانن کە دۆخەکە گۆڕاوە.

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان: دۆخەکە گۆڕابوو، ئێوە پێتان نەزانیبوو؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، دکتۆر (جاوید) و چەند کەسێکی تر ڕۆیشتبوون بۆ تاران، لەوێ بە گەرمی پێشوازییان لێکرابوو، بڕیار بوو ئێمەش لەگەڵ (کەبیری)دا بڕۆین، بەڵام لە تاران بڕیارێک درابوو، کە هێواش هێواش هێزەکانی ئێمە بکشێنەوە. دیارە وا ڕێکەوتبوون ئۆتۆنۆمییەک بە ئێمە بدرێت. ستالینیش پەیامی ناردبوو کە لە شۆڕشدا هەوراز و

نشیو هەیە، ئێستاش بۆ ئێوە کاتی نشێوە. بەڵێ، ئەوان دەڕۆن بۆ تاران و بڕیار لەسەر ئەوە دەدرێت لە تارانەوە چەند سەربازێک بنێردرێت بۆ تەبریز و لەوێ هەڵبژاردن بکرێت و تەبریز نوێنەری هەڵبژێردراوی خۆی بنێرێت بۆ تاران. دکتۆر جاوید کە لێپرسراوی هێزی چەکداریی بوو، لەلایەن حکومەتی شاوە وەک پارێزگاری تەبریز دەستنیشان کرابوو، ئەمەش وەک تەسلیمبوونێک وابوو. دواتر چەکە قورسەکانیان کۆکردەوە و بردیان. سەدری قازی ئامۆزای قازی محەمەد، ئەندام پەرلەمان بوو، ئەو پارێزبەندیی هەبوو، دەینێرن بۆ لای قازی محەمەد کە شەڕ نەکات و ئێمە کوردەکانمان عەفو کردووە، بەڵام کە سەدری قازی دەگاتە مهاباد دەستگیری دەکەن.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان:** کوردەکان دەستگیری دەکەن؟

**سەفەرخان:** نەخێر، حکومەتی ئێران دەستگیریان کردبوو، ئێمە تێکشکابووین، هێزەکەی حکومەتی شا لە پێشدا گەیشتە ئازەربایجان و هێشتا نەگەیشتبووە کوردستان. کوردستان هێشتا بەدەست کوردەکانەوە بوو، حکومەت توانای ئەوەی نەبوو ڕوو بکاتە کوردستان، هەربۆیە سەدری قازی-یان نارد بۆ لای قازی محەمەد، کە پێی بڵێت شەڕ نەکەن و ئێمە لە ئەوان خۆش دەبین، ئیتر مهاباد خەریک بوو دەکەوتە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی شاوە.

حکومەت لەوە دەترسا قازی محەمەد هاوکاریی مەلا مستەفا بکات و لە کوردستاندا بەرگریی بکرێت. ئەو ناپیاوانەی حکومەتی شا سەدری قازییان گرت و لەسێدارەیان دا، لەکاتێکدا ئەو نوێنەری پەرلەمان بوو و پارێزبەندیشی هەبوو، قازی محەمەد بەرگریی دەکرد، بەڵام سەید عەلی حیجازی کە فەرماندەیەکی سوپای عێراق بوو، دێت بۆ لای قازی محەمەد و لەسەر سنوور یەکتری دەبینن، پێی دەڵێت وەرە با بڕۆین بۆ عێراق، ئەگەر لێرە بمێنیتەوە حکومەتی شا دەتکوژێت، ڕوسەکانیش سەردانی دەکەن و پێی دەڵێن با بڕۆین بۆ سۆڤیەت. قازی محەمەد قسەی هیچ

یەکێکیان قبوڵ ناکات و دەڵێت ئەگەر بمرم با لەناو گەلەکەی خۆمدا بمرم.

زۆرباشـــە، ئیتر حکومەت هێرشـــی دەست پێکرد و گەیشتنە زنجان، وەک ئەوەی هاتبن بۆ هەڵبژاردن. ئەوان هێرش دەکەنە سەر تیپی یەک، ئیتر هێرش لە ئاسمان و لە زەوییەوە دەست پێدەکات. غولام یەحیا لە (قافلانکۆ) بـوو، پردێک لە نزیک قافلانکۆ هەیە و پردەکە دەتەقێنێتەوە. ئەو پردە ئێســـتاش هەر بە وێرانەیی ماوە. ئیتر ســـوپای شـــا دێتە سێ فەرســـەخی تەبریز. ســـوپا لەو شـــوێنە دەمێنێتەوە و ژمارەیەکی زۆر لە سەرســـەربی و چەقۆکێشـــەکان بە جلوبەرگی مەدەنییـــەوە دەنێرنە نـــاو شـــاری تەبریـــز، ئەوانیش لە ماوەی ســـێ چـــوار ڕۆژدا (٢٥٠٠٠) کـــەس دەکوژن، هەرکەســـێک دەبینـــن، دەیکوژن. (فرۆدۆســـت)یش لە یادەوەرییەکانیدا ئەوەی نووســـیبوو، ئەویش لەگەڵ دار و دەستەی شا هاتبوو، لەگەڵ ئەفســـەرەکاندا قســـەی کردبوو، چونکە ئەوان یەکتریان دەناســـی. ئەفســـەرەکان گووتبوویان ئەم قســـانە بـــەکاری ئێمە نایات. ئەوانیـــش ئەفســـەرەکانیان دەســـتگیر کردبـــوو. ئێمە لەبـــەرەی جەنگ بوویـــن، لە شـــوێنێک کە پێی دەڵێن (حوشـــتر چارئولمـــاخ)، کە بریتییە لـــە حەوت هەشـــت ناوچـــە. ڕۆژێک ســـەیرم کرد دوو ســـەرباز بەرەو لام دێـــن. گووتم ئێوە لـــە کوێوە دێن؟ گووتیان مەگەر نەتزانیوە ســـێ چوار ڕۆژە ســـوپا هاتووە و هێرشـــی دەســـتپێکردووە و ئێمە شکاوین و هەڵاتووین. ئێســـتا ســـوپا گەیشـــتووەتە میاندواو، تەبریزیش گیراوە. بەڵـــێ، ئێمە لە هەموو شـــتێک بێ هەواڵ بوویـــن، نە تەلەفۆن هەبوو، نە ئۆتۆمبێل. ئێمە (٧٠٠-٨٠٠) کەســـێک دەبووین لە ناوچەکەدا، کە لەگەڵ دەرەبەگەکاندا لە شـــەڕدا بووین. کاتێک ئـــەم هەواڵەمان زانی؛ هێواش هێواش دەســـتمان کرد بە پاشەکشـــە. هێشـــتا خەڵـــک و دەرەبەگەکان نەیانزانیبوو کە ئازەربایجان گیراوە. چووم بۆ لای هاوڕێکانم و قسەم لەگەڵدا کردن کە چی بکەین، ئایا بەرگریی بکەین و لە کێوەکاندا خۆمان پەنابگرین؟ کێوی ســـەهەند کێوێکی بڵندە و چڕە، دەوروبەریشی پڕ لە دێهاتە، لەوێ بمێنینەوە تاکو بزانین چارەنووسمان بەچی دەگات. ئاخر

بڕیارەکە وابوو ئەوان بێن و هەڵبژاردنێکی ئازاد بکرێت، بەڵام ئێستا وا دێن و کوشت و کوشتار دەکەن. ئاخر ئەمە هەڵبژاردنە، یان کوشتاری خەڵکـی ئازەربایجانە؟ زۆرێک لە هاوڕێیانمان ڕازی نەبوون بچینە پاڵ شـاخەکان، هەرکەسـە و لەگەڵ چەند کەسـێک لە خزم و کەسەکانیان ڕۆیشـتنەوە بەرەو ناوچەکانی خۆیان. ئێمـەش هاتین بۆ دەوروبەری مەراغـە. لەو ناوچەیە جووتیارەکان دۆسـتمان بـوون، ئەوان هاتن بۆ لامـان و گووتیان ئێوە لێرە چی دەکەن؟ خۆ مەراغە گیراوە، ئێمە دوو فرسەخ لە مەراغەوە دوور بووین. گووتیان: دەتانەوێت بۆ کوێ بڕۆن؟ بـە لای مەراغـەدا تێپەڕین و هاتین بۆ عەجەبشـێر و ناوچەی خۆمان. عەجەبشـێر کەوتووەتە نێوانی مەراغە و ئازەرشـەهر و تەبرێز. هاتینە ئەوێ و بە هاوڕێکانم گووت: هەرکەسێک هەواڵ بنێرێت بۆ ماڵی خۆی و بزانێت هەواڵ چییە؟ ئێمە هێشتا نەماندەزانی کە لە ئازەربایجان چی ڕوویداوە.

ئێمـە بریتـی بوویـن لـە مـن و حەیدەرخانـی ئافاقی و ئەسـغەر نـوری و محەمـەد فەخری نەژاد و مەحمودی مهاجـر. خۆ ئەگەر ئێمە دەستگیربکراینایە، هەر لە هەمان شوێن دەیانکوشتین. دواتر هەموومان بەیەکـەوە ڕۆیشـتین بۆ ماڵە ئاشـنایەکمان لە گونـدی (کوهە). کوهە؛ گوندێکی حەوت هەشـت ماڵی بوو. ئاغای ئەو گوندە ئاشـنای من بوو. (مـن لە ماڵی ئەواندا سـێ ئەسـپ و چەند چەکێکم دانابـوو)، هات بۆ لامـان و گووتـی: کارمەندانی حکومەت هاتوون بـۆ ماڵەکەم و هەموو شـتەکانیان بردووە و خۆشمیان دەسـتگیر کردووە، دوای لێکۆڵینەوە زانییان لەگەڵ ئێوەدا نیم، ئازادیان کردم.

من سێسـەد چەکدارم هەبوو، پێم گووتـن هەریەکەتان بڕۆنەوە بۆ ماڵی خۆتان، ئێمەش چووینەوە بۆ گوندی (کوهە)و چووینە ماڵی میرزا ئاغـا خـان. لەوێ لە یەکتـری جیابووینـەوە، من و ئەسـغەر نوری و مەحمـود مهاجـر چووینە ئەو ماڵـە. مەحمود مهاجر یەکێـک بوو لەو کۆچەرییانەی کە لە سۆڤیەتەوە گەڕابووەوە. لەوێ زانیمان کە ئاغاکان

تــەواوی خەڵکە چەکدارەکانیان چەک کــردووە و بە فەرمانی ئاغاکان ماڵەکانیــان تــاڵان دەکرد، خەڵکەکەشــیان دەســتگیر دەکــردن و بەبێ تــاوان دەیانخســتنە زیندانەوە و دارکارییان دەکردن. من ڕۆیشــتم بۆ شیشــوان و بۆ ماڵی خۆمان، لەوێ گووتیان بۆچی هاتوویتەوە، مەگەر ئــاگاداری هەواڵەکان نیت؟ من ئەو کاتە زۆر ســەرگەرم بووم، لاوێکی چــالاک و بزێو بووم، لەلای ماڵەکەمانەوە مزگەوتێک هەبوو، ئێســتاش ئــەو مزگەوتــە هەر ماوە، گووتیان لە گوندەکانی ترەوە مەلاکان دێن و لــە مزگەوت کۆدەبنــەوە و لەگەڵ خەڵکانی تردا دەڕۆن بۆ پێشــوازیی سەرهەنگ (زەرابی)، کە لە مهابادەوە دەچێت بۆ تەبریز.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: بڕۆن بۆ پێشوازیی؟**

**ســەفەرخان:** بەڵێ، ژمارەیەکی زۆر شاپەرســت هەبــوون، ئەوان نزیکەی دووسەد بۆ سێسەد کەس دەبوون. ئەم هەواڵە بە ئێمە گەیشت، من کەسێکی زۆر سەرگەرم بووم، کاتێک ئەوان لە گوندەوە بەڕێکەوتن لــە دواوە تەقەم لێکــردن، یەکێک لە ئەوان کەوت بــە زەویدا و ئەوانی تریــش هەڵاتــن و خۆیان گەیانــدە بناو. لەوێوە برووســکەیان کردبوو بۆ مەراغە و گووتبوویان پێشــمەرگەکان لە گوندی شیشوان بەرگریی دەکەن و تەسلیم نابن. لەکاتێکدا کە ئێمە تەنها دوو کەس بووین. کاتی عەسر بوو سەیرم کرد هێزێکی زۆر لە عەجەبشێرەوە هاتن، بە زوویی لە عەجەبشێرەوە سەربازیان ناردبوو تاکو ئێمە دەستگیر بکەن.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: گووتت مانگی ئازەر بوو؟**

**ســەفەرخان:** بەڵــێ، مانگــی ئــازەر بــوو، هاتــن و گووتیــان لــە عەجەبشێرەوە ئێمەی ڕیشسپیانیان ناردووە، لە فڵان سەرهەنگیشەوە پەیاممــان پێیــە کــە هەرچی چەکێکتان هەیــە تەســلیمیان بکەنەوە، لە بەرامبــەردا پارەتــان پێ دەدەن و ژیانێکی باشــتان بــۆ دابین دەکەن. ئەوانەی کە هاتبوون یەکێکیان بەنی هاشمی بوو، ئەو نوێنەری ئاغایەک

بوو بە ناوی مەهدی خانی بەسیر پور، عەجەبشێر موڵکی ئەو ئاغایە بوو. ڕۆژێک ڕاپەڕین، تازە حیزب دامەزرابوو. خەڵکی دەیانویست بڕژێنە سەر ماڵی ئەو ئاغایە، منیش پێشم پێ گرتن. خەڵکی ڕێزیان لە ئێمە دەگرت، من پێشم پێ گرتن و نەمهێشت بڕۆن. گووتم: ڕاستە ئەمە ئاغایە و پێی دەڵێن ئاغا، بەڵام کەسی ئازار نەداوە و زوڵمی لە کەس نەکردووە و کەسێکی باشە. ئەویش ئەو پیاوەتییەی لەبیر مابوو، نوێنەرەکەی خۆی، واتە بەنی هاشمی ناردبوو بۆ ناوبژێکردن. حەوت هەشت کەس هاتبوون، کە ئەگەر من خۆم بەدەستەوە نەدەم، ئەوا دەستگیرم دەکەن. من تەنها بووم، بەڵام ئەوان نەیاندەوێرا بێن و دەستگیرم بکەن. عەجەبشێر تاکو شیشوان نزیکەی یەک کیلۆمەترە. ئەوان وایان هەست دەکرد کە تەواوی گوندی شیشوان چەکدارن. بەسیر پور پەیامی ناردبوو بە سەفەرخان بڵێن، کێشەکەی گرانە، تەنانەت محەمەدخانی ئەمیر پەرویزیش کە لێپرسراوی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی ئازەربایجانە و دەسەڵاتی زۆری هەیە، ناتوانێت ئەو ڕزگار بکات. بە سەفەرخان بڵێن لێرە نەمێنێت و بڕوات. من ئەو پەیامەم قبووڵ نەکرد، بە ئەوانم گووت: ئەوەندە مۆڵەتمان پێ بدەن تاکو چەکەکانمان کۆبکەینەوە و خۆمان دەناسێنین. بەڵێ، لەو کاتەدا سەرگەرمییەکانم پێیان دەگووتم لە جێگای خۆت دانیشە و مەڕۆ. کاتی شەو ئەوان ڕۆیشتن و خەڵکی گوندەکەی خۆمان ئاخوند و مەلا و ڕیشسپییەکان هاتن و گووتیان: ئێمە لە عەجەبشێرەوە هاتووین. ئەوان تۆپیان هێناوە دەیانەوێت گوندەکە تۆپباران بکەن. چەکداریشیان هێناوە تاکو بەدوای ئێوەدا بگەڕێن. تکایە بڕۆن و گوندەکە جێبهێڵن. شەو من و ئەسغەر نوری و مەحمود مهاجر لەگەڵ برا بچووکەکەم و کەسێکی تر هەر پێنجمان هەڵساین و ڕۆیشتین بۆ کێوەکانی نێوان عەجەبشێر و ئازەرشەهر. نێوان ئەو دوو شارە هەموو شاخ و کێوە. دێهاتەکانی دەوروبەریشیان لە دەریاچە دەچن. ڕۆیشتین بۆ گوندێک کە سێ چوار ماڵ زیاتر نەبوون. بە ویژدانەوە هیچ ماڵێکیان لەگەڵ

ئێمــەدا خــراپ نەبوون، خواردنیــان پێداین و جێگایــان کردینەوە. لەو کاتــەدا مەحمود مهاجر گووتی: ئێوە کەســتان هەیــە تاکو بەرگریتان لــێ بکات، بــەڵام ئەگەر من بگیرێم یەکڕاســت دەکوژرێــم. چەکەکەی دانــا و مۆڵەتــی لە ئێمە وەرگرت و گووتی: من لە قەرەداغ و ئاراس و بــاران برایەکم هەیە دەڕۆم لەوێ دەمێنمەوە. لەوێ هیچ کەســێک من ناناسێت. ئەو لەسەر ڕەزامەندیی ئێمە ڕۆیشت بۆ قەرەداغ. بۆ گەیشتن بــە قــەرەداغ دەبووایە لە تەبریــزەوە بڕوات. لە ڕێگادا خەڵکی باســی چەکــداران و هەڵاتووانــی ئێمەیــان کردبوو. دەیانگووت هەرکەســێک چەکدارێــک بگرێت و تەســلیمی بــکات، خەڵاتێکی باشــی پێ دەدرێت. مەحمود مهاجر بە بیستنی ئەو قسانە قاچەکانی شل دەبێت و ناتوانێت بــڕوات و دەگەڕێتــەوە بــۆ هەمان ماڵ کــە بەیەکەوە بوویــن. ئێمە لە یەک جێگا نەدەماینەوە. دەڕۆیشتینە کێوەکان و خۆمان دەشاردەوە و دەهاتینەوە گوندەکان نان و خواردنمان لە جووتیارەکان وەردەگرت و دەڕۆیشتینەوە بۆ کێوەکان.

مانگی ئازەر بوو، ســەرمای توند دەستی پێکردبوو، سەربازەکان بە شوێنماندا دەگەڕان، دەیانزانی ئێمە لەو ناوچەیەداین. ئەو چەکدارەی کە هەمیشــە لەگەڵ مندا بوو، ناوی مەشــهەدی عەبــاس بوو. دەچووە گونــدەکان و خــواردن و هەواڵی بۆ دەهێناین. جارێکیــان هەواڵی هێنا و گووتی: ســەربازەکان لە دەوروبــەری کێوەکانن و ئاگاداری خۆتان بــن. هەمــوو جیهانمان لەبەر تەســکبووەوە. گەڕاینەوە بــۆ گوندەکەی خۆمان کە دوانزە ماڵە ئاغای تێدا بوو. هەمان شازادە و منداڵانی ئیمام قولی میرزا کە پێشــتر باســم کرد. ئەوان چەکدارێکــی زۆریان هەبوو. کات شــەو بوو، چووینە ماڵی ئەفســەر نوری. چی بکەین چی نەکەین. ئەفســەر نوری کەســێکی ڕۆشــنبیر بوو، گووتی: من ناتوانم چیدی بە شــاخەکانەوە بم. خراپەم لەگەڵ کەســدا نەکردووە. لە سەردەمی شادا ماوەیەک ســەرۆکی شــارەوانی بووم. تەنها یەک شەپازلەم لە کەسێک داوە. منیــش پێــم گووت: ئــەی بیر لەوە ناکەیتەوە تۆ ئەفســەر بوویت

لــە تیپدا. لە ڕاپەڕیندا ڕۆڵت هەبوو، لــە گوندی (تاهیراوا) تۆ مووچە و خواردەمەنیــت دەدا بە بارزانییەکان و ئەفســەری پلەبەرز بوویت و لە (کەبیــری)ەوە زۆر نزیک بوویت، تەنانەت نووســەری ئێمەش بوویت، لەکاتی شۆڕشدا لە تۆ خوێندەوارترمان لەگەڵدا نەبووە. ئەی چی لەمانە دەکەیت؟ تۆ تەنها حســاب بۆ ئەو شەپازلـەیە دەکەیت کە وەشاندووتە! ئیتــر پێم گووت کە دەبێت ئێمە بە زوویی جێگەکەمان بگۆڕین. ئێســتا دەبێت بچین بۆ ماڵی ئەو کەسەی کە زۆر پەیوەندییمان لەگەڵیدا نەبووە و تــا ڕادەیەک دژایەتیمان کردووە، بەڵام ئەو کەســە کەســێکی خراپ نەبوو، ئێمەش چارەمان نەبوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەو ماڵەتان هەڵبژارد؟**
**سەفەرخان:** بەڵێ، نەدەکرا بڕۆین بۆ ماڵی خزم و کەس.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشیان: دواتر مەحمود مهاجر گەڕایەوە بۆ لای ئێوە؟**

**ســەفەرخان:** نەخێر. مەحمود مهاجر گەڕایەوە بۆ ئەو گوندە و بۆ هەمــان مــاڵ، کە لە ئێمە جیابووەوە. کەســێکی ناپیاو بــە ناوی عەلی خەیــات، یــان مەشــهەدی عەلی خەیات، کــە بۆ ڕاوکردنــی بزنەکێویی ڕۆیشــتبوو بــۆ کێــو. کاتێک لــە ڕاوکــردن دەگەڕێتەوە بۆ ئــەو ماڵە. مەحمود مهاجریش هەر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ماڵە، عەلی خەیات لوولەی تفەنگەکەی دەخاتە ســەر سنگی و دەســت و قاچی دەبەستێت، خاوەن ماڵیــش ناوێرێت قســە بکات. بەهەرحاڵ ســواری حوشــتری دەکات و لەسەر حوشترەکە دەست و قاچی دەبەستێت و دەیبات بۆ عەجەبشێر و تەســلیمی دەکات. ئێمــە کــە چووینە ئــەو ماڵە حەوت هەشــت ڕۆژ لــە ماڵیــان بووین، خــاوەن ماڵ ناوی حوســێن خانی موشــفەقی بوو. دوای ئــەوەی لە زیندان ئازادکرام، هێشــتا ئەو پیاوە مابوو، چاوم پێی کەوتەوە، دوو هاوســەری هەبــوو، زۆر هاوکارمان بوو. ڕۆژێک کاتی

نیــوەڕۆ نامەیەکمان لەلایــەن (فەخرولعولیا)وە بۆ هات، کە فەرمانداری بنــاو بوو. ئەو (فەخرولعولیا)یە نــە دژی ئێمە بوو، نە لایەنگرمان بوو، بەڵام لایەنگری حکومەت بوو، یەکێک بوو لە ئاغاکانی گوندەکەی ئێمە. ژنەکەشــی خەڵکی گوندەکەی ئێمە بوو، بەڵام ئەو لە ئاغا زۆردارەکان نەبوو، چەند ڕۆژێک بەدواماندا دەگەڕێن و شوێنەکەمان دەدۆزنەوە و نامەکەمان بۆ دەهێنن.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لە نامەکەدا چی نووسیبوو، داوای چی دەکرد؟**

**ســەفەرخان:** نامەکە بۆ من و ئەســغەر نوری نووسرابوو، داوایان لێکردبووین کە بچین بۆ مەراغە و خۆمان تەسلیم بکەین. بەڵێنیان دابوو پارەمان پێ بدەن و ژیانمان دابین بکەن، هەر قســەکانی پێشــووتریان دووبارە کردبووەوە، کە بڕۆین و تەســلیم بیــن. ئەوان دەیانزانی ئێمە لــە کێوەکانەوە دێینــە خوارەوە، بەڵام لەبەرئەوەی ناوچەکە دارســتان بــوو، نەیاندەتوانــی ڕووبەڕوومان ببنەوە، دەنا شــەڕ ڕووی دەدا، یان دەیانکوشتین، یان دەستگیریان دەکردین. دوای خوێندنەوەی نامەکە ئەم ئەســغەر نورییە دووبارە دەستی پێکردەوە و گووتی: من هیچ کارێکی خراپــم نەکردووە، تەنها شــەپازلەیەکم لە کەســێک داوە. من دووبارە کەوتمەوە قسەکردن بۆی و پێم گووت وریای خۆت بە هەڵنەخەڵەتێیت، بــە دڵنیاییــەوە دەتکوژن. گووتــی: بەخوا من ناتوانم بــەم جۆرە بژیم. گووتم: زۆرباشــە ئەوە مەیلی خۆتە. بەرەبەیان بوو ئەو بە جلوبەرگی ئەفســەری و دەمانچەکەی لاقەدییەوە ڕۆیشت بۆ ماڵی (فەخرولعولیا)، هەر لەوێ دەســتگیری دەکەن و ڕەوانەی مەراغەی دەکەن. کاتێک ئەو ڕۆیشــت، منیش لە ماڵەکــە هاتمە دەرەوە و ڕووم کردە دارســتانەکە. کاتێک هەواڵی دەســتگیرکردنی ئەوم بیســت لەلایەن چەند کەسێکەوە، هەوڵێکــی زۆرم دا، پــارەم دا بــە زۆر کەس تاکــو ڕزگاری بکەم. ئەو کەســەی کە ئەوی بردبوو تەســلیمی کردبوو. بەڕاســتی نەیویســتبوو

ئــەو بەکوشــتن بــدات، نەیزانیبوو کە دەیکــوژن. واتــە (فەخرولعولیا) وای هەســـتکردبوو کە ئەوان بەڵێنەکانیان ڕاســـتن، تەنانەت بەو ئاکامە گەیشتبوو کە ببێتە کەفیلی.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: واتە فەخرولعولیا ببێتە کەفیلی؟**

**سەفەرخان:** بەڵــێ، ئەو ویســـتبووی کەفالەتی بکات، بەڵام ئاغاکانی ناوچەکەی ئێمە لە هەواڵی دەستگیرکردنی ئەسغەر نوری ئاگادار دەبن، چەندین ئیمزا کۆدەکەنەوە و ئەو دەکەن بە شێر، بەڵام ئەو پیاوی چەک نەبوو، ئەو کەســـی قەڵەم و نووســـین بوو. ئاغــاکان گووتبوویان ئەمە ئــەو تاوانبارەیە کە ئێوە دەتانەوێت ئــازادی بکەن. پێش کۆکردنەوەی ئیمزاکان حکومەت دەیویست بە کەفالەت ئازادی بکات.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: دوای ئەوە تۆ بە تەنها مایتەوە؟**

**ســـەفەرخان:** بەڵـــێ، مــن لــە کێــو و لەنــاو دارســـتانەکاندا بووم، جووتیــارەکان هاوکارییان دەکردم، دەچوومە هەر گوندێک مەترســـیم لەســـەر نەبوو، نانم وەردەگرت و دەڕۆیشـــتم، شـــەوانە لە هیچ ماڵێک نەدەمامـــەوە. هەندێک کات لەو ماڵانـــە دەمامەوە کە زۆر باوەڕم پێیان هەبوو. هەموو شوێنێک لەژێر چاودێریدا بوو، ئاغاکان و نۆکەرەکانیان چاودێریـــی هەمـــوو شـــوێنێکیان دەکـــرد. نۆکـــەر و کاسەلێســـەکان لە ئاغاکان خراپتر بە شوێن مندا دەگەڕان. من ماوەی یەک مانگ بە تەنها سەرگەردانی ئەو شاخ و دۆڵە بووم، دەڕۆیشتم بۆ لای ئەو کوورانەی کە خەڵوزیان لێ دروست دەکرا، لەوێ خۆم گەرم دەکردەوە و شەوانە لـــەوێ دەخەوتـــم، یان لەنـــاو باخ و خانـــووی ناو باخـــەکان دەخەوتم. ڕۆژێکیان ڕۆیشتم بۆ ماڵی خوشکەکەم، واتە ژنی حەیدەرخانی ئافاقی، کە تازە لەسێدارەیان دابوو. خوشکەکەم کردی بە هاتوهاوار و نەیهێشت لـــەوێ بمێنمـــەوە و گووتی: بەزوویی بڕۆ، ئێســـتا دێن و دەســـتگیرت دەکەن، بە بەرچاوی منەوە دەتکوژن. ڕۆیشـــتم سەردانی ماڵی خۆمانم

کرد. دایکیشم بەهەمان شێوە دەستی کرد بە هاتوهاوار، ئیتر لە هەموو شـــوێنێک نائومێد بووم. ئومێدم تەنها بە چەکەکەم بوو، گووتم: ئەگەر بـــۆم بێن، تا دوایین فیشـــەک شـــەڕ دەکەم و دەکوژم. ئەگـــەر گرتیانم و کوشـــتیانم ئیتر ڕزگارم دەبێت. هاتمە دەرەوە و ڕۆیشـــتم بۆ ســـەر ڕێگایەک، کە بەرەو گوندێک دەڕۆیشـــت، ســـەرم گـــەرم بوو، بێ ترس دەڕۆیشتم. گەیشتمە لای باخێک و وەستام، گوێم لە دەنگی پێی ئەسپ بوو، پۆلیس بوون و دەڕۆیشـــتن بۆ گونـــدەکان. لە دڵی خۆمدا گووتم: ئیتر کارم تەواو بوو، خۆم دا بە زەویدا و تفەنگەکەم بەدەستمەوە بوو. خۆشـــبەختانە باخەکە دیواری هەبوو، ئەوان منیان نەبینی و ڕۆیشـــتن. هەر لەوێوە ڕۆیشـــتم بۆ ماڵی یەکێک لە جووتیارەکان. ئەو ماڵە بەر لە من هەڵاتوویەکی تریان لە ماڵەکەی خۆیاندا شاردبووەوە. ئەو هەڵاتووە ئەفســـەرێکی تیپ بـــوو، کە ئەویان گرتبوو، ناســـیبوویانەوە و ئازادیان کردبوو، ئەویش هاتبوو بۆ ماڵی هەمان جووتیار کە من بۆی ڕۆیشـــت بووم، ئەو ئەفســـەرەش ناوی حاجی ئاغای باقر پوور بوو. ئاشـــناکانم زۆربەیان چەکدار بوون. براکەم ڕۆیشتبوو بۆ مهاباد بۆ ماڵی کەسێک کـــە چەکدار بوو، لەوێ بە خاوەن ماڵ دەڵێت: فڵان کەســـیش هەڵاتووە و باسی منی بۆ دەکات، ئەو کەسە کوردەش ناوی ئەحمەد کاژاو بوو. زۆری پـــێ نەچوو خاوەن ماڵەکـــە پێی گووتم: کە ئەحمەد هاتووە تاکو تۆ بەرێت بۆ مهاباد، چونکە مەلا مســـتەفا لە کوردســـتان جەنگ دەکات و ناوچەکەش ئازادە. من پێنج دانە چەکم هەڵگرت و حاجی ئاغای باقر پوورم لە کادێنەکە هێنایە دەرەوە و سێ بەسێ بەڕێکەوتین.

**عەلی ئەشـــرەف دەروێشیان: ئێوە ســـێ کەس، پێنج چەکتان پێبووە، واتە هێشتا ژمارەیەکی زۆر چەکتان هەبووە؟**

**سەفەرخان:** ئێمـــە بیست هەزار چەکمان هەبوو، هەموویان بردبوو، بەڵام هێشـــتا لەملاو ئەولا هەندێک شـــتمان شـــاردبووەوە. دەمانچەی تیابوو، تفەنگ بوو، فیشـــەک بوو. من پێنج ڕەشاشـــم شـــاردبووەوە بە

یەک سـندووق فیشـەکی گەورەوە. ئەوانە تاکو ئەم دواییەش مابوون. دواتـر باوکم شـوێنەکانی دۆزیبوونەوە و بردبوونی و فرۆشـتبوونی و ژیانـی خـۆی پێ دابینکردبوو. فیشـەک دانەی بە یـەک تومەن بوو، بەڵام ڕەشاشـەکان کڕیاریان نەبوو. دواتر ڕەشاشـێکم نارد بۆ عێراق، دانەیەکیشـیان بەر دەسـتی پۆلیس کەوت. سێ دانەکەی تریش بێسەر و شـوێن کران. ئیتر ئێمە سـێ کەس ئامادە بووین بڕۆین بۆ لای مەلا مستەفا. ئەو کەسەی ئێمە لە ماڵەکەیدا بووین، پێشتر چەند ئەسپێکم لای ئـەو دانابوو، بەڵام هەموویان بردبوو. ئەو خۆی یەک ئەسـپی هەبوو. گووتـم: ئەو ئەسـپە بدە بە من، من نەمدەتوانی ئـەو هەموو ڕێگایە بە پێ بڕۆم، ئەو جووتیارە ئەگەرچی کەسـێکی باش بوو، بەڵام دەترسـا. گووتی: ئەگەر تۆیان دەسـتگیرکرد پێم دەڵێن بۆچی ئەو ئەسـپەت پێ داوە؟ منیش گووتم: ئێمە دەمانەوێت بڕۆین و لێرە نەمێنین. خۆ ئەگەر دەستگیریش بکرێم، خۆم قسەیەک دەکەم. خۆ ناوی تۆ لەسەر ئەسپەکە نەنووسـراوە، دەڵێم ئەسپی خۆمە. بەهەرحاڵ ئەو ئەسپەکەی پێداین و ئێمەش بەڕێکەوتین بەرەو کوردستان.

کاتەکە زسـتان بوو، گەیشـتینە سـەر ڕووباری (جەغاتو) لەسەر ڕووبارەکـە بە (کەڵەک) خەڵکیـان دەپەڕانـدەوە. هەروەکو دەریاچەی ئورمیـە بەندەرێکـم دەزانـی، بـەڵام نەماندەتووانی لەوێـوە بڕۆین و پێیـان بڵێین سـوارمان بکەن و بمانپەڕێننەوە. زسـتانێکی زۆر سـارد بوو، هەموو شـتێک بەستبووی. ئێمە شەو گەیشتینە سەر ڕووبارەکە. دارسـتانێکی زۆر لـە قـەراغ ڕووبارەکە هەبوو، نەدەتوانـرا لە هەموو شوێنێکی ڕووبارەکە بپەڕینەوە. کەمێک ڕۆیشتینە پێشەوە و شوێنێکمان دیـاری کـرد بـۆ پەڕینـەوە. جلەکانمان دانا و من سـواری ئەسـپەکە بـووم و ئـەو دووانەکەی تریـش هەریەکەی لە لایەکەوە دەسـتیان بە ئەسـپەکەوە گرت، ئەسپی بێ چارە ئێمەی لە ڕووبارەکە پەڕاندەوە، لە نزیـک ڕووبارەکە گوندێک هەیە بە نـاوی (جەعفەرئاوا) من لەو گوندە ئاشـنام هەبوو، ڕۆیشتینە ماڵەکەی و جلەکانمان وشککردەوە و نانمان

خــوارد، بەڵام ئەو گوندە شــوێنێکی ئارام نەبوو. لــە گوندێکی ئەولاتر ئاشــنایەکی تــرم هەبــوو، وابزانم گوندەکــە ناوی (ئاقاتەپــە) بوو، ئەو گوندە بەشی کوردستانە. ئەو ڕۆژە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان بوو. کــوردەکان زۆر گرنگی بە جەژنی قوربــان دەدەن. لە هەمووماڵێک و چێشــت لێدەنرێــت و چەند ڕۆژێک گۆشــت و برنج دەخــۆن. ئەو کاتە هەمــوو کەس گۆشــتی نەدەخوارد، واتــە نەیاندەتوانی گۆشــت بکڕن، تەنها پۆلیســەکان گۆشــتیان دەخوارد. کوردەکان لە جەژندا ژنەکانیان جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگ دەپۆشن و لەو دەشت و دەرە شایی دەکەن و هەڵدەپەڕن. ئێمــە لەناو گوندەکەدا بووین، لەپڕێکدا هەواڵیان بۆ هێناین کە چەند چەکدارێک بە ســواریی بەرەو ئێرە دێن. لە پشتی گوندەکەوە گردێکی بڵند هەبوو. ئێمەش چەکەکانمان هەڵگرت و ڕۆیشتین بۆ سەر گردەکە و ســەنگەرمان گرت. دوایی هەواڵیان هێنا، کە ئەوانە کۆمەڵێک ژن بوون و ڕۆیشتوون بۆ ئەو دەشتە بۆ شایی و هەڵپەڕکێ. کە شەو داهات لەوێوە بەڕێکەوتین، ڕۆیشتین بۆ گوندێکی تر، لەوێش ئاشنایەکم هەبوو، کە نۆکەری ئاغا بوو. پێشــتر ئەســپێکم لەلای ئەو دانابوو. پێم گووت ئەســپەکەم بدەرەوە، ناتوانین بە پیــادە بڕۆین. ئەویش گووتی: ئەگــەر ئاغا بزانێــت دەمکوژێت. ئێــوەش چەکەکانتان لەگــەڵ خۆتاندا مەبەن و لای من جێیان بهێڵن. گووتم: ئێمە ئێستا چەکەکانمان بدەین بە تۆ و تۆش دوایی پێمانی نەدەیتەوە. دیارە ئەو چەکی پێ نەبوو، ئێمەش چەکدار بووین، گوندەکەمان جێهێشــت و ڕۆیشــتین. شــەو بە ڕێگاوە بووین، کەســێکی شارەزا پێشمانکەوت و ئێمەی لەگەڵ خۆیدا برد، ئەو کەســە ناوی ســۆفی ئەحمەد بوو، ئــەو لە ناوچەکەدا ئاشــنای زۆری هەبــوو. بە ڕۆژ ئێمەی دەبرد بۆ ماڵە کوردەکان. بەڕاســتی کوردەکان بەڕێز و میواندۆست بوون. دیارە ئەوان ئێمەیان نەدەبردە ژوورەکانی خۆیــان، بەڵکــو دەیانبردین بۆ گــەوڕی ئاژەڵەکانیــان. دوای پێنج ڕۆژ ڕۆیشــتین گەیشــتینە نەغەدە و چووینە گوندی (قاڕنــێ)، لەوێوە تاکو سنووری عێراق بەدەســت کوردەکانەوە بوو. دیارە شەڕ نەبوو، ئەولا

بەدەست سـەربازەکانەوە بوو، ئەملاش بەدەست بارزانییەکانەوە بوو. مـن و سـۆفی ئەحمەد هەریەکەمـان دەمانچەیەکمان پێبـوو. لە ڕێگادا بارزانییـەکان ئێمەیـان گرت و گووتیان ئێوە جاسوسـن. گووتم: کاکە ئێمـە ئەفسـەر بووین و ئێسـتا هەڵاتوویـن، باوەڕیان پـێ نەکردین و بردیانین بۆ نەغەدە.

مەلا مسـتەفا بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ شـادا ڕۆیشـتبوو بۆ تاران و شێخ عوبەیدوڵڵای کوڕی لە جێگای دانیشتبوو. ئێمە کە گەیشتینە ئەوێ، سـەیرم کرد ئەوێ پڕە لە کەسانی ئێرانی، ماچ و مووچ دەستی پێکرد. کوردەکان نامەیان نووسیبوو بۆ ئازەربایجان، کە هەرکەسێک دەیەوێت بێـت بـۆ لای ئێمە، ئێمە پێشـوازیی لێ دەکەین. ئیتـر ئێمەش دووبارە گەڕاینـەوە بۆ گوندی (قارنێ). لـەوێ چەکەکانمان هەڵگرت و هاتینەوە بۆ نەغەدە. لە نەغەدە نزیکەی بیسـت کەسی تری ئازەربایجانی لێبوو، کە هەموومان یەکتریمان دەناسی، هەموومان لەناو شاردا بە ئازادی و بە چەکەوە دەسوڕاینەوە. نزیکەی یەک مانگ دەبوو کە شا بانگهێشتی مەلا مستەفای کردبوو بۆ تاران. کاتێک کە کوردەکان لە مهاباد تەسلیم دەبن؛ مەلا مسـتەفا لـە بۆکان دەبێت، لەوێ ژمارەیەک لە ئەفسـەرانی خوراسـان مەشقی سەربازییان پێ دەدەن. کاتێک کوردەکان لە مهاباد تێکدەشکێن، مەلا مستەفا دەچێتە لای قازی محەمەد و پێی دەڵێت: ئەوە من و ئەوە تەواوی چەکدارەکانم، کۆماری ئازەربایجان تەسـلیم بووە، بەڵام ئێمە لەگەڵ تۆداین، وەرە با لە کوردستان بەرگریی بکەین. قازی محەمەد هەمان وتەی کە پێشـتر گووتم، دووبارەی دەکاتەوە و دەڵێت: ئەگـەر بمـرم با لەگەڵ گەلەکەمدا بمرم، ئەگـەر زیندووش بم با لەگەڵ میللەتەکەمدا بم. قازی محەمەد هەموو هاوکارییەکی مەلا مستەفا ڕەت دەکاتـەوە، بەڵام پێی دەڵێت ئەو عەمبـارە پڕە لە چەک، چەندەت چەک دەوێـت لەگەڵ خۆتدا ببیە. بارزانییەکان شـەیدای چەک بوون، هەرچی چـەک بوو کـۆی دەکەنـەوە و لەگەڵ خۆیانـدا دەیبەن. مەلا مسـتەفا دەگەڕێتەوە بۆ نەغەدە. شـا داوای لێ دەکات سەردانی بکات لە تاران.

مەلا مستەفا دەچێت بۆ تاران و شا دوو پێشنیاری بۆ دەکات، یان بیت تەسلیم بێت و لە شیراز زەوی کشتوکاڵی پێدەدات و لەوێ نیشتەجێ ببن و کاری کشتوکاڵی و ئاژەڵداریی بکەن، یان داوا لە عێراق بکەن لێبووردنتان بۆ دەربکات و بگەڕێنەوە بۆ عێراق. شا ئەم دوو پێشنیارە دەخاتە بەردەم مەلا مستەفا، بەڵام مەلا مستەفا پێشنیاری دووەمیان قبووڵ دەکات و بە شا دەڵێت: ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ عێراق، بۆئەوەی دڵنیایی شا بەدەستبهێنێت تەڵاقی بۆ دەخوات کە قبووڵی دەکات. لەناو کوردەکاندا سوێندخواردن بە تەڵاق سوێندێکی گرانە. واتە کەسی سوێندخۆر ئەگەر بەڵێنەکەی نەباتە سەر، یان دەبێت ژنەکەی تەڵاق بدات، یان ژنەکەی لە ئەو حەرام دەبێت. ئەو ڕۆژەی ئێمە گەیشتینە نەغەدە، دوای دوو ڕۆژ مەلا مستەفا لە تارانەوە گەڕایەوە. تا ئەو ڕۆژە حکومەتی شا ئارد و شەکر و چایی دەدا بە بارزانییەکان و ژیانی بۆ دابین دەکردن. بە ئۆتۆمبێل هەموو شتێکیان بۆ دەهات. بارزانییەکان خۆیان هیچ شتێکیان نەبوو. تەنها هەریەکە و تفەنگێکی پێبوو. حکومەت هەموو شتێکی پێ دەدان. لەگەڵ مەلا مستەفادا سەرهەنگێکی سوپای ئێرانیش هاتبوو، سەرهەنگ غەفاری، یان غەفوریان پێ دەگووت.

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان: ئەوان لە تارانەوە هاتبوون؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، لە تارانەوە هاتبوون بۆئەوەی چەکەکان وەربگرن، مەلا مستەفا هەرچەندە ناوێکی گەورە و گرنگ بوو، بەڵام لێرە کەسانی تریش هەبوون کە هاوشانی مەلا مستەفا بوون. فلان خان و فلان خان کە ناویانم بیر نەماوە. هەر تایەفەیەک خانێکی هەبوو. بۆ نموونە ڕواندزییەکان خانێکیان هەبوو، هەموو ئەوانەش لە دەوری مەلا مستەفا کۆببوونەوە. ئێستا پەنجا ساڵ تێپەڕیوە و ناویانم بیرچووەتەوە. لە نەغەدە بە ئێمەیان گووت: بڕۆن بۆ گوندێک لە نزیک شنۆ. ئێمە ڕۆیشتین و لە ماڵی خانێک میوان بووین. دواتر ئێمەیان نارد بۆ ناو شاری شنۆ. ئێمە (١٢) کەس بووین، هەر لە شنۆ بووین کاتێک مەلا

مســـتەفا هات و لەگەڵ ئەو ســـەرهەنگەدا کۆبوونەوەیەکیان کرد. دیارە من بەشداریی کۆبوونەوەکەم نەکرد، بەڵام ئەوانەی لەوێ بوون، دوایی بۆیان باسـکردم کە مەلا مستەفا چەکەکەی خستووەتە سەر مێزەکە و گووتوویەتی لەبەرئەوەی سوێندم بە تەڵاق خواردووە، من ئەم چەکەی خۆم تەسلیم دەکەم، ئێوەش چەکەکانتان تەسلیم بکەن، ئێمە بەڵێنمان بە شا داوە، یان برۆین بۆ شیراز، یان داوای لێخۆشبوون لە عێراق بکەین (دیارە مەلا مســـتەفا پێشـــتر لەگەڵ کوردەکاندا قســـەی کردبوو)، لەناو هۆڵی کۆبوونەوەکەدا بیست بۆ سی کەس هەبوون. دەبێتە دەنگەدەنگ و بە مەلا مســـتەفا دەڵێن: تۆ چیت، تۆ تەنها خۆتیت، چی دەکەیت بیکە، بـــەڵام ئێمە چەکەکانمان تەســـلیم ناکەین و شـــەڕ دەکەیـــن. لەوێ ئەو ســـەرهەنگە تێدەگات کە مەلا مســـتەفا فێڵی لە شا کردووە. لەگەڵ چەند ســـەربازێکدا کە لەگەڵیدا بوون، ســـواری جێبێکی ڕەش بوو و ڕۆیشت. ئەو جێبە هی یەکێک لە هاوشـــارییەکانی من بوو، کە ماوەی دوو ســـاڵ بوو ڕۆیشـــتبوو بۆ شنۆ. سەرهەنگ بە ســـواری جێبەکە ڕۆیشت و بۆ ڕۆژی دواتر حکومەت خواردنی نەنارد و شـــەڕ دەســـتی پێکرد. سوپا بـــە تـــۆپ و فڕۆکەی جەنگی هێرشـــی دەکرد، کوردەکانیـــش بە تفەنگ بەرگرییـــان دەکـــرد. بەدبەختـــی بارزانییەکان لەوەدا بـــوو کە بە ماڵ و منداڵـــەوە هاتبوون بۆ ئێـــران. ئەگەر مرۆڤ تەنها بێت و منداڵی لەگەڵدا نەبێـــت، هەر کارێـــک بییەوێت دەیکات، بەڵام بە ماڵ و منداڵەوە کارێکی دژوارە، مرۆڤ نازانێت چی بکات. جەنگ دەستی پێکرد و سوپای ئێران گوندەکانی تۆپباران دەکرد. (تەفریشیان) ئەم ڕووداوانەی لە کتێبەکەیدا نوســـیووە. مەلا مستەفا بە (تەفریشـــیان) دەڵێت: سوڵتان تەفریشیان لە دەوروبەری (نەلۆس) سوپای حکومەت تۆپباران بکە.

**عەلی ئەشرەف دەرێشیان: مەلا مستەفا تۆپبارانیان بکات؟**

**سەفەرخان:** نەخێـــر، هەمان تەفریشیان کە تۆپچی بوو، ئەفسەرێکی پلەبـــاڵای ســـوپای ئێران هەبوو، لەو شـــەڕەدا بریـنـدار دەبێت و دواتر

خـۆی دەکوژێـت، ئـەو ئەفســەرە نـاوی (کلاشــی) بوو. ئـەو هێزەی حکومەت تەسلیم بوون و فەرماندەکەشیان کوژرا، لەو شەڕەدا دەست بەســەر چەکێکی زۆردا گیرا. هۆکاری ئەوەش کـە لە زینداندا ئەوەندە (تەفریشــیان) هێشــتەوە، بەهۆی لێکۆڵینەوەبوو لەســەر ئەو ڕووداوە. ئەویش دەیگووت: ئەوە شــەڕ بووە و ئەو فەرماندەیەش لە شــەڕەکەدا کــوژراوە. تەفریشــیان کەمێک لــە حیزبی تودە ناڕازیی بــوو. لەوانەیە بەو هۆیەشــەوە بووبێت کە لە مانگی ئازەری (١٣٢٩)دا کە تودەییەکان هەڵاتن و بڕیار بوو ئەویش لەگەڵ خۆیاندا ببەن، چونکە (تەفریشــیان) تاوانەکــەی گەورە بوو، ئەویان نەبرد. (تەفریشــیان) لە کتێبەکەیدا ئەم وتانــەی نووســیوە، دیارە هۆکاری تریــش هەبوو کە لــەو کتێبەکەیدا نووسیویەتی... ماندووبووم.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان:** ماندووبوویت؟

**سەفەرخان:** با کەمێک پشوو بدەم.

## یەکەم دەستگیرکردن و زیندانیکردن (١٣٢٥–١٣٢٧)

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان:** سڵاو سەفەرخان، ئەگەر ئامادەیت با بڕۆینەوە سەر باسەکەمان.

**سەفەرخان:** بەڵێ، چەند ڕۆژێک تێپەڕیبوو، کە بەڕێوەبەری پۆلیسی شنۆ (سەرۆک عیزەت) داوای ئێمەی کردبوو، دیارە پێش ئەوەی کە شەڕ دەست پێ بکات، ئەو داوای ئێمەی کردبوو. گووتبووی ئێوە ئەو دوانزە کەسەتان سەرتیپ (زەرابی) داواتان دەکات، بەتایبەتی دەڵێت کە (سەفەری قارەمانیان) سەرهەنگ موعین ئازادی کوشتووە.

**هاوسەری سەفەرخان:** سەفەرخان و ئەوانی تریش.

**سەفەرخان:** ئەوانی تر چەکدار و ئەفسەر بوون، ناو و ناوبانگێکی ئەوتۆیان نەبوو. مەلا مستەفا برا گەورەیەکی هەبوو، ئەو هەموو دەسەڵاتێکی هەبوو. ناوی شێخ ئەحمەد بوو، ئەو لەوێ کە چاوی بە ئێمە کەوت، پێی گووتین: کە ئێمە ناوی خۆمان بگۆڕین و لەگەڵ ئەواندا بڕۆین بۆ ناوچەکەی ئەوان، لەوێ ترێ و هەنجیر زۆرە و لەوێ بژین. ئێمەش لەگەڵ حەفتا کەسی تر بە فەرماندەیی خەیروڵڵا ئەفەندی کە ئەفسەرێکی عێراق بوو، هاتبوو بۆ هاوکاریکردنی مەلا مستەفا، بەرەو سنووری عێراق بەڕێکەوتین. لە نەغەدە و شنۆوە چوار ڕۆژ بەناو بەفردا بە ڕێگاوە بووین تا گەیشتینە گوندی قاسملو، بەفرێکی زۆر باریبوو، تا پشتێنمان دەهات، ئێمە یەک یەک بەدوای یەکدا دەڕۆیشتین. شەوانە لە گوندەکان لە ماڵی خەڵکی دەماینەوە، کاتێک گەیشتینە گوندی قاسملو شەو بوو، بەیانی زوو پێیان گووتین بڕۆین بۆ کێوەکەی پشتەوە. (بە ناوی دمدم- جمجم) تازە شەڕ گەیشتبووە لای کێوەکە. زورار بەگ و

هاوڕێکانی لەوێ لەگەڵ سوپای ئێراندا لە شەڕدا بوون، بارزانییەکانیش هاوکارییان دەکردن، هیچ شتێک نەدەگەیشتە کێوەکە. نە تۆپ، نە تانک، تەنها فڕۆکە دەیگەیشتێ. کێوەکە زۆر بەرزە، دوو کاتژمێری دەوێت تا سەر دەکەویتە سەرەوە. ئێمەیان بەڕێکرد بۆ سەر کێوەکە، چەند ڕۆژێک لەوەو پێش چەند کەسێک لە پێش ئێمە ڕۆیشتبوونە سەر شاخەکە و بنکەیەکیان دامەزراندبوو. ئەوان کە چاویان بە ئێمە کەوت، گووتیان دوو سێ ڕۆژە خواردنمان پێ نەگەیشتووە، بنکەکانیان تەسلیم بە ئێمە کرد و خۆیان ڕۆیشتن خواردن بهێنن، ئەوان ڕۆیشتن و ئێستاش نەگەڕانەوە. لایەکی دۆڵی قاسملو بەدەست زورار بەگ و هاوڕێکانییەوە بوو، لایەکی تری بەدەست بارزانییەکانەوە بوو، هەردوو لایان دژی سوپای ئێران دەجەنگان. بەردێک لە شاخەکەوە هاتە خوارەوە و بەردەکە بەر کەسێک کەوت و برینداری کرد، منیش کردمە کۆڵم و بردم لە پەنایەکدا دامنا.

دۆڵی قاسملو دۆڵێکی چڕە و لە هەردوو لاوە کێوەکان ڕۆیشتوون بە ئاسماندا. لەنێوان هەردوو کێوەکەدا دۆڵی قاسملوە، کە تەنها ڕێگایەکی کاروانی پێدا تێپەڕ دەبێت. ئێمە چاومان لێبوو تانکەکان دەهاتن بەرەو دۆڵەکە. ئێمەش ئەو چەند کەسە بڕیارمان دا بڕۆین بەرەو خوار، ئێمە بێ هەواڵ بووین لەوەی کە هەم بارزانییەکان و هەم زورار بەگ پاشەکشەیان کردبوو. کەسێک نەبوو هەواڵمان پێ بدات و پێمان بڵێت هێزەکەمان تێکشکاوە و ئێمە پاشەکشەمان کردووە و ئێوەش بکشێنەوە، ئێمە سێ لامان لێ گیرابوو، تەنها دوو ئەسپمان لابوو، یەکێکیان لای براکەم و ئەوی تریان لای هاوڕێکانی ترم بوون، لە خوارەوە ئاگاداریان دەکردین، بەپەلە هاتمە خوارەوە و سواری ئەسپەکەم بووم، هەردوو کەس و سواری ئەسپێک بووین. بەخێرایی ئەسپەکانمان لەنێوان کێوەکانەوە تاودا، کەمێک لە سەرباز و تانکەکان دوورکەوتینەوە و لە چاوی ئەوان ون بووین. ماوەیەک ڕۆیشتین، بینیم زورار بەگ وەستاوە، بە بینینی ئێمە خۆشحاڵ بوو،

زورار بەگ لە ئورمیە کەسێکی ناسراو و خۆشەویست بوو، ئەو یەکێک بــوو لە کوردە هەرکییەکانــی عێراق. گووتی: زۆر نیگەرانی ئێوە بووم، مــاوەی ســێ کاتژمێرە لێــرە چاوەڕوانتانــم. ئێوە بە زوویــی بڕۆن و خۆتان بگەیەننە گوندەکە، من لێرە چاوەڕوانی ئەو برادەرانە دەکەم کە هێشتا بە کێوەکەوەن، ئێوە وا هەست نەکەن کە من هەڵاتووم و ئێوەم جێهێشــتووە. ئێمەش ڕۆیشــتین بۆ گوندەکە، تەواوی خەڵکی گوندەکەماڵیان جێهێشــتبوو، خۆیــان هەڵاتبوون و ڕۆیشــتبوون. لە گوندەکەدا یــەک کــەس نەمابوو، هێشــتا تەنوورەکەیان گەرم بوو و تــازە نانیان کردبوو. مریشــکمان ســەربڕی و نانێکی زۆر هەبوو، نانمان خوارد و بەرەو لای شــنۆ بەڕێکەوتین، بەرەو لای ئورمیە نەڕۆیشــتین. هەموو چەکدارەکان لە شنۆ کۆببوونەوە، هەم چەکدارەکانی زورار بەگ و هەم چەکداری بارزانییەکان.

کێوەکانی ئەو ناوچەیە ئەوەندە بڵندن کە ســەربازەکان نەیاندەتوانی پێیدا ســەربکەون. ئێمە ســەر جادەکانمان گرتبوو، سەرباز و تانکەکان نەیاندەتوانــی پێیــدا بڕۆن. دۆڵێک کــە هەردوو لای کێــوی بڵندە، ئێمە ڕێگاکەمان بە تەواوی بەستبوو، ناوچەکە چۆڵیی بوو، گوندی لێ نەبوو، ئێمەش خواردنمان پێ نەدەگەیشــت. بــەردەوام فڕۆکە جەنگییەکان بە ئاســمانەوە بوون، بەڵام لە کێوەکەدا هیچیان پــێ نەدەکرا. فڕۆکەکانی ئەو سەردەمە وەکو فڕۆکەی ئێستا نەبوون. بە گشتی ئێمە ماوەی یەک مانگ لەو شــوێنە ئێشــکمان دەگرت، هێزەکەی زورار بەگ و هێزەکەی بارزانیش کە لەگەڵ ســوپادا لە شــەڕدا بوون. هەموومان زۆر برســی بووین. ئەگــەر مەڕێک، یان گوێرەکەیەکمان دەســتبکەوتایە بە زوویی ســەرمان دەبڕی و کەوڵمان دەکرد و دەمانخوارد. لە ســەروو ئێمەوە چەنــد گوندێک هەبوو، ئــەوان هەندێک خواردەمەنییان لــە ماڵەکانیاندا جێهێشتبوو، ئێمە ئەو خواردنانەشمان خواردن و تەواومان کردن، ئیتر هیچ خواردنێکی ترمان دەست نەدەکەوت. ڕێگاکانی ئورمیەش گیرابوون، هاتوچــۆ نەبوو تاکو بڕۆن لەوێ خواردەمەنی بکڕن و بیهێنن. هەرچی

لــە گوندەکەدا هەبوو لە مانگا و مەڕ و مریشــک هەمووومان ســەربڕی و خواردمان. دوای یەک مانگ گەیشــتینە زێوە. زێوە گوندێکە لە نزیک عێراق. مەلا مستەفاش هات بۆ ئەوێ و بەرنامەی ئەوە بوو ئەو گوند و ماڵانەی کە هەموو کوردی عەشــایەر بوون، لە زێوەوە تاکو سنووری سۆڤیەت یەک بخات. لە نزیک زێوە کێوێک هەیە کە تورکیا و عێراق و ئێـران لە یەکتری جیا دەکاتەوە. ئێمەیان نارد بۆ ئورمیە و گەمارۆمان دا، دیــارە نــاو شــاری ئورمیە نا، بەڵکــو دێهاتەکانــی دەوروبەری. لە دێهاتەکانــدا لەگەڵ ســەربازەکاندا لە شــەڕدا بووین. دواتر ڕۆیشــتین بــۆ گونــدی دیانە کە خاوەندارێتی ڕەشــید بەگ بوو. ئێمــە لەو گوندە بووین، مەلا مســتەفا لەگەڵ هەر خاوەن گوندێک پەیمانی دەبەســت و ئێمەی دەنارده ئەو گوندە و بۆ خۆیشی دەڕۆیشت بە سۆراخی خاوەن گوندێکــی تر و بەهەمان شــێوە لەگەڵ خاوەنی ئــەو گوندەش پەیمانی دەبەست تاکو دەگەیشتە سنووری سۆڤیەت. ئێمە لە ماڵی ڕەشید بەگ بووین، لەوێ خواردنیان پێدەداین، لەو ماڵە بووین کە شەوێک کەسێک بە ناوی ئەحمەدخان هات بۆ لامان. ئەحمەدخان ماوەیەک لەگەڵ سمایل خانی ســمکۆدا بوو، ئەو خزم و کەســێکی زۆری هەبوو. شــکاکەکان هەموویان سەر بە ئەو بوون. ئەحمەدخان لەسەر داوای شا ڕۆیشتبوو بۆ تاران، لەوێ شــا نامەیەکی پێدابوو تاکو بیگەیەنێتە ڕەشــید بەگ، لە نامەکەدا شا داوای لێکردبوو کە بە کوردەکان بڵێت دەست لە شەڕکردن هەڵگرن. ڕەشــید بەگ بە خوێندنەوەی نامەکە ڕەنگی تێکچوو. تا ئەوێ مــەلا مســتەفا لە کۆکردنــەوە و یەکگرتوویی کوردەکان ســەرکەوتوو بوو، بەڵام ئەم نامەیە هەموو بەرنامەکانی هەڵوەشــاندەوە. بەیانی زوو ڕەشید بەگ ئێمەی لە گوندەکە کردە دەرەوە و گووتی: بڕۆن بۆ شەڕ. شــەڕێکی سەخت دەستی پێکردبوو، مەلا مستەفا و زرار بەگ لەلایەک و حکومەتیــش لەلایەکی تر. ئێمە لە دەوروبەری ئورمیە بووین، لەوێ پێیان گووتین بڕۆن بۆ دیانە، کوردەکان وایان دەزانی ڕەشــید بەگ لە دیانەیە. گووتیان بڕۆن لەوێ خواردن و فیشــەک و پێویســتییەکانی تر

بهێنن. ئێمە هاتین بۆ دیانە، سەیرم کرد دیانە چۆڵە و یەک کەسێکی تێدا نییە. لەوێ پێیان گووتین لێرە بڕۆن، ئێمەش بە ناچاریی گەڕاینەوە. لە ڕێگا سەیرم کرد نزیکەی دووسەد کەس بە سواری ئەسپ لە ئورمیەوە بەرەو لای ئێمە دێن. ئەوان لەو بارزانییانە بوون کە لەگەڵ حکومەتدا لە شەڕدا بوون. ئەو نامەیەی کە هاتبوو کاری خۆی کردبوو، ڕەشیدخان چەکی دانابوو. ئێمەش کەسێکمان نارد بۆ لای هێزەکەی ڕەشیدخان. ئەوان گووتیان ئێمە شەڕ لەگەڵ ئێوەدا ناکەین، نە دۆستتان دەبین و نە دوژمن، شەڕ لەگەڵ حکومەتیشدا ناکەین. ئێستا خۆتان دەزانن چی دەکەن. ناچار ئێمەش بەرەو لای شەڕەکە گەڕاینەوە، بەڵام ڕێگا گیرابوو. هێزەکەی ئێمە گەمارۆدرابوون و نەمانتوانی پەیوەندییان پێوە بکەین. گەڕاینەوە و گەیشتینە دامێنی کێوێکی بڵند. ئێمە چوار کەس بووین و لە دامێنی کێوەکە سەرگەردان بووین، ناشارەزا بووین و خەڵکی ناوچەکە نەبووین. سواری ئەسپەکانمان بووین و فڕۆکەکان، هاتن، بەڵام کاریان بەسەر ئێمەوە نەبوو. ئەوان چییان بەسەر چوار کەسەوە هەبوو. یەکێک لە هاوڕێکانمان گووتی: وا باشە بگەڕێینەوە بۆ گوندەکەی خۆمان. ئەو گوندەی کە هێزەکەی مەلا مستەفای لێبوو، لەلای تەرگەوەر و مەرگەوەڕ، بەڵام تاکو ئەوێ زۆر دوور بوو، دەستمان کرد بە مقۆ مقۆ یەکێک دەیگووت بە شەو بڕۆین و یەکێک تر دەیگووت بە ڕۆژ بڕۆین. کەسێک ناوی پولادخان بوو. یەکێکی تر ناوی بولودخان بوو، ئەوان خەڵکی سۆڤیەت بوون و لە سەردەمی بەلشەویکەکانەوە هەڵاتبوون و هاتبوون بۆ ئێران. منداڵ بوون کە هاتبوون بۆ ئێران. هەر لە ئێران گەورە ببوون، ئەوان دوو کەسی زرنگ و وریا بوون، دوای شەهریوەر ئەوان لە ناوچەی مەراغە خۆیان بەڕێوە دەبرد. هەر لەوێ ماوەی سێ مانگ لەگەڵ حکومەتدا لە شەڕدا بوون، دواتر تێکشکان و ڕۆیشتن بۆ کوردستان و لەوێ مانەوە. ئەوان سەرەتا لەگەڵ ئێمەدا بوون.

بڕیارمان دا بەڕێ بکەوین، ڕێگاکە شارەزا بووین لە هەمان شوێنەوە

که هاتبووین، گەڕاینەوە. خەڵکی ئەو گوندە هەموویان چەکدار بوون و هەمووشـیان ڕۆیشتبوون بۆ شـەڕەکە، کە ئاغای گوندەکە ناردبوونی. گوندەکە چۆڵ بوو، کەسـێک نەبوو بێت بـە دەنگمانەوە. ئیتر بە هەزار دەردەسـەریی هاتین تاکو گەیشتینەوە بە هاوڕێکانی خۆمان. برازاکەی مـەلا مسـتەفا فەرمانـدەی ئەوان بوو، بەسـەرهاتەکەم بۆ باسـکرد و گووتم: برادەرانی ترمان گەمارۆدراون. دوای دوو ڕۆژ ئەو برادەرانە لە گەمارۆکە ڕزگاریان بوو و هاتنەوە بۆ لای ئێمە. ئێمە لەوێوە دەستمان کرد بە پاشەکشەکردن. ئێستا ئێمە گەیشتووینەتە ناوچەکانی تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ، کە سێ فرسەخ لە ئورمیەوە دوورە. خەڵکی ئەو ناوچەیە هەموویان کوردن، شـوێنێکی دڵنشـین و خۆشە. خەڵکی بۆ سەیران و کاتبەسەبردن ڕووی تێدەکەن. لەپڕێکدا گوێم لە دەنگی تەقەکردن بوو. برازاکەی مەلا مستەفا نازانم ناوی شێخ چی بوو. بە ئێمەی گووت: بڕۆن بزانن ئەو تەقەکردنە چییە. ئێمەش ڕۆیشـتین بـەرەو کێوەکە، کێوەکە زۆر بەرز نەبوو، سـەیرم کرد کەسـێک بە خێرایی بە سـواری ئەسپ بەرەوڕوومان دێت. کە لێمان نزیکبووەوە سـەیرمان کرد مەلا مستەفا بوو، کە چاوی بە ئێمە کەوت، گووتی: وا هێزەکەی حکومەت دێتە پێش، وا من دەڕۆم لەسـەر کێوە بەرزەکە سـەنگەر دەگرم و ئەوانی تریش ئـاگادار بکەنـەوە بەزوویی بێن بۆ لای من. نـوری بەگ یەکێک بوو لە خاوەن گوندەکانی ناوچەکە، ئەو پێشتر لەگەڵ مەلا مستەفادا بوو، بەڵام دوای نامەکەی شا و لێبووردنی شا، خۆی خستە پاڵ شا. مەلا مستەفا لە نامەکەی شا بێ هەواڵ بوو، چەکدارەکانی نوری بەگ گەمارۆی مەلا مستەفایان دابوو، ئەویش گەمارۆکەی شکاندبوو، خۆی گەیاندبووە ئەو شوێنەی کە ئێمەی لێبووین، واتە هەمان کێوی تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ. ئەو سـەرکەوتە سەر شاخەکە و سـەنگەری گرت، هێزە پیادەکەی کە لەدوایـەوە بـوون، ئەوانیش گەیشـتنە لامان و ئێمـە ڕێنوێنیمان کردن کـە بڕۆن بۆ سـەر شـاخەکە و پەیوەندیـی بکەن بە مەلا مسـتەفاوە. بەڕاسـتی مەلا مسـتەفا بە تەنهـا دەیتوانی ڕووبەڕووی دووسـەد بۆ

سینســەد کەس بوەستێتەوە. سوارچاکی وەک و ئەو دروست نابێتەوە. لەو کاتەدا نامەیەک لەلایەن ســەرهەنگ (شــەراقی) فەرماندەی ســوپا، بۆ مەلا مســتەفا هات. داوای لێکردبوو کە بێت و خۆی تەسـلیم بکات، چونکــه بــە تەواوەتی گەمــارۆدراوە. نامەکەیان دا بە مــن تا بیگەیەنم، چونکە من ســواری ئەســپ ببووم. کاتێک لە کێوەکە ســەرکەوتم تاکو نامەکەی بۆ بەرم، سەیرم کرد لەو شوێنە چەندین تەرم کەوتووە. مەلا مســتەفا و چەکدارەکانی بە ساغ و سەلامەتی لەوێ بوون. دوو کەسی ســەید لەلایەن نوری بەگــەوە هاتبوون تاکو تەرمــەکان بەرنەوە. مەلا مستەفا پێی گووتبوون، لەبەرئەوەی ئێوە سەیدن و لەبەر خاتری ئێوە ڕێگــە دەدەم تەرمەکان بەرنەوە، بەڵام بە نوری بەگ بڵێن ئەگەر لەژێر هەوری ئاسماندا خۆی بشارێتەوە، دەیگرم و دەیکوژم. بەڵێ، ئێستا مەلا مستەفا گەمارۆدراوە و سێ هەزار بارزانی بە ماڵ و منداڵەوە لە هەمان کێو برسی و تینوون، هیچ شتێک بۆ خواردن پەیدا نابێت، ئەو ناوە تەنها شاخ و بەردە. خوار کێوەکەش هەڵدێرە و بە سەربازی ئێرانی تەنراوە. فڕۆکە دەهاتــن و بۆمبارانیان دەکرد، تانک دەهات و تۆپبارانی دەکرد. ئەگەر بڕۆشتینایە بەرە و تورکیا ڕێگەیان پێ نەدەداین، ئەگەر شەڕمان بکردایە نەماندەتوانی بەرامبەر بە ســوپایەکی وا گەورە بوەســتینەوە، ئەوان بەهێز بوون و ئێمەش چەند پارتیزانێک. مەلا مستەفا داوای (٢٤) کاتژمێر مۆڵەتی کرد تا هێزەکەی کۆبکاتەوە و تەسـلیم بێت، کە ئێوارە داهــات پێیان ڕاگەیاندین تــەواوی هێزەکەمان کۆبکەینەوە و لە کێوەکە بڕۆینــە خــوارەوە و بڕۆیــن بۆ تەرگــەوەڕ و مەرگــەوەڕ. هەرچۆنێک بێــت هاتینــە خــوارەوە و لە گوندەکەدا مــەلا مســتەفا کۆیکردینەوە و وتــاری بۆ داین. گووتی: ئێوە تەواو شــەکەت بوون، چەکێکی زۆرتان بەدەســتهێناوە، هەســت دەکەم ئێــوە دەتانەوێت بڕۆن بــەرەو عێراق، مــن لێرە پێتــان دەڵێم ئەگەر ئێوە بــڕۆن بەرەو عێراق، هــەر ژنێکتان دەکەوێتە بەر دەســتی دە پۆلیسی عێراقی. هەرواش بوو، پێشبینی ئەو ڕاســت دەرچوو، بەڵام ئێمە ژمارەیەکی زۆرمان لە ســەربازانی ئێران

بەدیل گرتبوو. مەلا مستەفا بە ئێمەی گووت لەبەرئەوەی ئێوە لە زمانی ئـەم دیلانە تێدەگەن، هەر ئێسـتا بیانبەن بۆ شـنۆ. کوڕی (سـەبهەبید جهانیـان)، واتە حەمید جهانیان یەکێک بوو لە دیلەکان، ئەو شـارەزای ڕێگاکە بوو. حەمید جهانیان گووتی: ئێوە ئێمە بگەیەننە ئەو شوێنەی کە سـوپای ئێرانی لێیە، من باوکم سەرلەشـکرە و ئەو ئێوە عەفوو دەکات و کارئاسـانیتان بۆ دەکات. ئێمە قبووڵمان نەدەکـرد. بەردەوام فڕۆکە بەسـەر سەرمانەوە بوو، ئێمەشـی دەبینی، دەیزانی هەموو سەربازن، بۆردوومانی نەدەکردین. ئێمە گەیشـتینە ناو شاری شنۆ، کە سەیرمان کرد یەک کەس لەناو شـاری شـنۆ نەماوە، شنۆ بە فڕۆکە بۆردوومان کراوە و خەڵکەکە هەمووی داویەتییە کێوەکە. ئەو کەسەی کە بڕیاربوو دیلەکانی تەسـلیم بکەین، گووتی: ئاخر ئێمە چی لە ئەمانە بکەین؟ ئێمە خۆشـمان چارەنووسمان نادیارە، نازانین شەڕ بکەین، یا ڕابکەین، چی بکەیـن؟ ئێوە ئەمانە بگەڕێننەوە بۆ ئەو شـوێنەی کـە هێناوتانن. ئێمە سـێ ڕۆژ بـوو ئـەو دیلانەمان هێنابـوو، لەوێ نـان و ئازووخە پەیدا نەدەبوو. تەواوی دێهاتەکان کەوتبوونە بەردەسـتی سەربازانی ئێرانی، ئێمـە تەنها چەند گوندێکمان لەبەردەسـتدا مابوو، هەموو خواردنەکانی ئەوانمـان خواردبوو و تەواومان کردبوون. ڕێگای ئورمیەش گیرابوو، هاتوچۆ قەدەغە بوو. ئیتر بارزانییەکان بڕیاریان دا ڕێکەوتنێک بکەن و بگەڕێنەوە بۆ عێراق.

گەڕانـەوە بـۆ عێراق ڕێـگای ڕۆژێـک و دوو ڕۆژ نەبـوو. ئێمە لە مانگـی ئازەرەوە تاکـو فەروەردینی (١٣٢٦/ ١٩٤٧) لـەو کێوە بووین. شـەش مانگمان بە برسـێتی و بەبێ نان بردە سـەر. تەنها چانسـێک کـە هەمان بوو، ئـەوە بوو کە کوردەکان ئاژەڵەکانیـان لەگەڵ خۆیاندا هێنابـوو. ژمارەیەک لە کـوردە ئێرانییەکان کە هاوکاری قازی محەمەد بوون، ئەوانیش لەگەڵ ئێمە هەڵاتبوون. ئێمە ئاژەڵمان لە ئەوان دەکڕی و سـەرمان دەبڕین و کەوڵمان دەکردن و لە گۆشـتەکەی قاورمەمان دروست دەکرد و قاورمەکەمان لەگەڵ خۆمان دەگێڕا و لە هەر شوێنێک

برسـیمان بووایـە پارووپەکمـان دەردەکرد و دەمانخـوارد. بەردەوام فرۆکە لەسـەر سەرمان بوو، لەلایەک فرۆکەی ئێران، لەلایەک فرۆکەی عێراق، لەلایەکی تریشەوە فرۆکەی تورکیا. هەرسێ وڵات فرۆکەکانیان ئامادەی شەڕ بوون، ئێستا سەیر بکە دەبێت ئێمە لە چی بارێکدا بووبین.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: واتا بەو جۆرە بوون؟!**

**سەفەرخان:** بەڵێ، ئێمە شەش کەس بووین، من و باقر پور، پولادخان، بولودخان، تەفریشـیان و زەربەخت. ئێمە ئەم شـەش کەسە بەردەوام بەیەکەوە بووین، لە شـەڕ و لە پاشەکشەدا هەر بەیەکەوە بووین. ئێمە دوو دانـە بەتانییە کۆنەمان هەبوو، لە شـاخەکاندا ئەشـکەوت هەبوو، ڕۆژانـە لە ئەشـکەوتەکاندا بـەو دوو بەتانییە دەخەوتین، شـەوانەش بەڕێـگاوە بوویـن و شـەڕە تەقەشـمان دەکـرد. مەلا مسـتەفا کوڕی (سـەبهەبید جهانیانی) دەسـتگیر کردبوو تاکو حکومـەت بۆمبارانمان نەکات، بەڵام ئەوان گوێیان بە ئەوە نەدەدا و کاری خۆیان دەکرد. ئێمە دوای چوار ڕۆژ کە بەو کێوەوە بووین و گەیشـتینە سـنووری عێراق. سـەید عەلی حیجازی کە فەرماندە و دەسـەڵاتدارێکی سـوپای عێراق بوو، هات و لەگەڵ شێخ ئەحمەدی برای مەلا مستەفا ڕێککەوتنیان کرد، ڕێکەوتنەکەیـان ئەوە بوو کە بگەڕێنەوە عێراق و چەکەکانیان دابنێن و ئەوانیش لێیان دەبوورن.

ڕووبارێکی گەورە لەسەر سنووری عێراق و ئێران بە ناوی (چۆمی گادەر) لـە پێشـمانەوە بوو، کە دەبووایە لێـی بپەڕینەوە، چەند دارێکی بەرز و گەورەمان بڕییەوە و لەسـەر ڕووبارەکە پردمان دروسـتکرد و پەڕینـەوە بـەرەو عێراق. مـاوەی پێنج ڕۆژ بە ڕێـگاوە بووین، هیچ شتێکمان دەست نەکەوت بۆ خواردن. لەسەر سنووری ئێران و عێراق من سەد تومەنم دا و دەبەیەک ئاردم کڕی، ساجێکم پەیداکرد و لەسەر سـاجەکە نانم دروسـتکرد، هەرکەسـە و بە پێوە پـارووە نانێکم پێدا. ئۆتۆمبێـل نەبوو، ئێمەیان بە پێ دەبرد، ڕێگاکە هەڵدێر و بزنەڕێ بوو،

تەنانەت ڕێگای هێسـتریش نەبوو، بەو شـەکەتییە گەیشـتینە گوندێک، ئـەو شـووێنە گونـد نەبـوو، ناحیە بـوو، نـاوی دیانا بـوو. زۆربەی دانیشـتووانەکەی ئەرمەنی بوون و لە تورکیاوە هەڵاتبوون و ئەوانیش لەگەڵ ئێمە هاودەرد بوون. لەوێ بەڕەڵایان نەکردین، چەندین چادریان بۆ هەڵدابووین دەوری چادرەکانیان بە تەلی دڕکاویی گرتبوو. بەسـەر چادرەکاندا دابەشیان کردین، هەر چادرێک (٨ تا ١٠) کەسی تێدابوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: سەفەرخان داوای لێبووردن دەکەم، باسی ئەوەت نەکرد چۆن لە مەلا مستەفا جیابوونەوە؟**

**سـەفەرخان:** بەڵێ، باسـم نەکرد، پێویسـتە کەمێک بگەڕێینەوە بۆ دواوە، کاتێک ئێمە گەیشـتینە سەر سـنوور، ئێمە ئەو شەش کەسە کە بەیەکـەوە بووین ڕۆیشـتین بۆ لای مەلا مسـتەفا و پێمـان گووت: تۆ کە تەسـلیم بە ئێران نابیت و ناشـگەڕێیتەوە بۆ عێراق، ئەی ئێمە چی بکەین؟ گووتی: ئێوە بڕۆن تەسـلیم بە عێراق بین، ئێمە بەڵێننامەمان بە جۆرێک نووسـیوە کە ئەوانەی ئێرانین وەک پەنابەر لە عێراق بمێننەوە و ئەوانـەی عێراقیـن بچنـەوە سـەر گوندەکانی خۆیان. مەلا مسـتەفا گووتی: من لەگەڵ شـێخ ئەحمەدی برام بەو جۆرە ڕێکەوتووین، بەڵام من خۆم تەسـلیم نابمەوە، بە خۆم و حەوتسەد کەسەوە دەکەوینە ئەو کێـوە و دەڕۆیـن بۆ بارزان. بارزان ناوچەیەکی چڕ و دارسـتانە، مەلا مسـتەفا لـەوێ دژی حکومەتی عێراق جەنگی بەرپا کـرد، ئیتر ئەو بە ئێمەی گووت ئێوە بڕۆن خۆتان تەسلیم بکەن. ئێمە نەمانزانی کە بۆچی ئێمـەی لەگەڵ خۆیدا نەبـرد. هەندێک کەس دەیانگووت ویسـتوویەتی نییەتپاکی خۆی نیشـان بدات کە ئێمە لەسـەر پەیمانـی خۆمانین، ئیتر چەنـد کاتژمێرێک دوای ڕێکەوتنەکە گووتی: مـن دەکەومە کێوەکان و گەڕایـەوە بۆ کێوەکانی ئێران. ئەو کێوانە هاوسـنووری بارزان بوون. ئـەو لە ڕێـگای ئەو کێوانەی ئێـران و تورکیاوە گەڕایـەوە بۆ بارزان. گووتـی: من دەڕۆم، ئەگەر عێراقییەکان و ئێرانییەکان ئازاد نەکەن، من

دەکەومە شەڕ، ئەوەشی گووت: ئێوە هەر وڵاتێکتان پێخۆشە، دەتاننێرم بۆ ئەوێ.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: واتە لە عێراق؟**
**سەفەرخان:** لە پێش ئێمەدا لە عێراق.

**هاوسەری سەفەرخان:** باشە سەفەرخان تۆ گووتت ئەو نەهات بۆ عێراق.
**سەفەرخان:** ئەم قسانەی من ئێستا دەیکەم هی سەر سنوورە، نەک هی ناو عێراق، ئێمە هێشتا نەگەیشتبووینە عێراق. لەو شوێنە دەمانویست لە یەکتری جیاببینەوە.
**هاوسەری سەفەرخان:** مەبەستم ئەوەیە کە ئەو ئێوەی لەگەڵ خۆیدا نەبرد.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ڕاستە سەفەرخان؟**
**سەفەرخان:** بەڵێ ڕاستە، ئەگەر مەلا مستەفا ئێمەی لەگەڵ خۆیدا ببردایە، ئێمە نەدەڕۆیشتین بۆ عێراق. زیندانیش نەدەکرام، تووشی ئەم گرفتارییەش نەدەبووم، نەک تەنها من، بەڵکو زۆر کەسی تری وەک من، ئێمە نزیکەی دە کەس دەبووین کە تاوانبار کرابووین. هەم لە ئێران و هەندێکیش لە تورکیا و هەندێکیش لە سوریا. ئەوانیش هەموو هەڵاتبوون و هاتبوون بۆ لای مەلا مستەفا. ئەو گووتی: من دەڕۆم بۆ بارزان و حکومەتێک دادەمەزرێنم و بارزان دەخەمە ژێر دەسەڵاتی خۆمەوە، ئەگەر ئەوان لەسەر بەڵێنی خۆیان بوون، ئێمەش شەڕیان لەگەڵ ناکەین و دەگەڕێینەوە عێراق و خەریکی ژیانی خۆمان دەبین. لەوانەیە ئەوان بیانەوێت ئێمە ڕازی بکەن. ئەو گووتی: من ئێوە لەگەڵ خۆمدا نابەم، هۆیەکەشی ئەوەیە کە ئێوە لە عێراق هیچ تاوانێکتان نەکردووە، لەگەڵ حکومەتی عێراق شەڕتان نەکردووە،

بۆیــە ئێــوە دەتوانن بڕۆن بۆ عێراق. لەســەر هەمــان چۆمی گادەر کە باســم کــرد، پردمان دروســتکرد، ماوەی یــەک هەفتەی پێچــوو تاکو هەمــوو بارزانییەکان لێی پەڕینــەوە. گادەر ڕووبارێکی زۆر گەورەیە، ســەرچاوەکەی لە وڵاتی تورکیاوە هەڵدەقوڵێت و لە شنۆوە تێدەپەڕێت و دەڕژێتە دەریاچەی ئورمیەوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لە ئێران بەو ڕووبارە دەڵێن چی؟**

**سەفەرخان:** لە ئێرانیش هەر پێی دەڵێن (چۆمی گادەر)، ئێمە لەوێ لە یەکتری جیابووینەوە و مەلا مستەفا بە حەوتسەد کەسەوە گەڕایەوە بۆ ئــەو کێوەی کە لێیەوە هاتبووین. ئەوان هەموویان چەکدار بوون، تۆپ و تانــک و فڕۆکە کاریگەریی لەســەریان نەبوو، لــە کێوەکانی ئێرانەوە خۆیان گەیاندەوە بارزان، ئێمەشیان برد بۆ عێراق. مەلا مستەفا حەوت بۆ هەشــت برای هەبوو، براکانیشــی لە گەڕانەوەماندا بۆ عێراق لەگەڵ ئێمــەدا بــوون. بەداخــەوە ناویانم لەیاد نەماوە. شــێخ محێدین، شــێخ ئەحمەد، نازانم شــێخ چی تر، بە هەموویانیان دەگووت شــێخ، براکانی دەیانزانی کە ئەوان تووشی هیچ کێشەیەک نابن.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: براکانی کێ؟**

**سەفەرخان:** براکانی مەلا مستەفا.

**هاوسەری سەفەرخان: دوایی چی بوو؟**

**سەفەرخان:** کەســێ کە لــەوێ نەبوویێت ناتوانێت ئەم قسانە بکات، بارزانــی کەســێکی ناســراو بوو، ئەوانیــش برای مەلا مســتەفا بوون، هەمووشــیان جەنــگاوەر بوون، ئــەوان لە عێــراق لایەنگرێکی زۆریان هەبــوو، لایەنگرەکانیــان هەواڵیان بۆ نارد کە دەبووایــە نەهاتنایەتەوە، یان لە ســێدارەتان دەدەن، یان زیندانیتان دەکەن. ئەم لێبووردنەش کە بۆی دەرکردوون ساختەیە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشــیان: کێ بە ئێوەی گووت کە دەبووایە نەیەن؟**

**ســـەفەرخان:** بە ئەوانیان گووت، ئەو کوردانەی لە عێراق بوون بە براکانی مەلا مستەفایان گووت، کە دەبووایە ئێوەش نەیەنەوە و لەگەڵ مەلا مســـتەفادا بڕۆیشـــتنایە. لەو برایانە پێنج شـــەش کەسـیان هەڵاتن بـــۆ کێوەکان. ئەوان شـــارەزا بـــوون و ناوچەکە ناوچـــەی خۆیان بوو. ئێمەیان بەدەستی بەستراو نەبرد، بۆ نموونە هەر دووسەد بۆ سێسەد کەسـێک یەک پۆلیســمان لەگەڵدابوو، بەشـێوەیەکی ئازادانــە ئێمەیان بـرد، نـەک وەک زیندانییـەک، ئـەوان هەڵاتن و ڕۆیشــتن بۆ لای مەلا مستەفا، ئێمەشیان کردە ئۆردووگاوە کە چواردەوری بە تەلی دڕکاویی گیرابـوو، لەبـەر دەرگاکـەش پۆلیـس دانرابوون و ئێشـکیان دەگرت. ئێمــە لەبەرئەوەی ئێرانــی بووین و لەگەڵ حکومەتی عێراق شــەڕمان نەکردبوو، دەرۆیشــتین مۆڵەتمان وەردەگرت و دەمانگووت دەچین لە دیانا شتومەک دەکڕین. دەچووینە دیانە و لە چایخانەیەک دادەنیشتین. ئیتر دوژمنایەتی لەناو کوردەکاندا دروست بوو. لەنێوان ئەو کوردانەی کە پێشــتر لەگەڵ مەلا مستەفادا بوون و ئێســتا گەڕابوونەوە عێراق و ئەوانــەی لە عێراق هاوکاریی حکومەتیان دەکرد و دووبارە لەگەڵ مەلا مستەفادا دەکەوتنەوە شەڕ. دوای سێ مانگ ئێمە تەواوی هەواڵەکەمان لە ڕادیۆوە بیست.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ڕادیۆتان لابوو؟ هی کێ بوو؟**

**سەفەرخان:** چایخانەکان، لە هەندێک لە چایخانەکان ڕادیۆ هەبوو.

**هاوســەری ســـەفەرخان:** من لەوەتای بیـرم کردووەتـەوە ڕادیۆ هەبووە.

**سەفەرخان:** ڕاستە، بــەڵام ئەو شــوێنەی ئێمەی لێبووین گوند بوو، نەک شار.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشیان: من تەمەنم چوار ساڵان بوو کە لە کرماشان ڕادیۆم بینیوە، ساڵەکانی (١٣٢٣– ١٣٢٤/ ١٩٤٤– ١٩٤٥).**

**ســەفەرخان:** ئێمــە لــە ســاڵەکانی (١٣٢٦- ١٣٢٧/ ١٩٤٧- ١٩٤٨) لێـرە ڕادیۆمان بینـی، ڕادیۆیەک بە زمانــی ئازەربایجانی بەرنامەکانی بڵاودەکــردەوە، دیارە لە مۆســکۆوە بەرنامەکانی بڵاو دەکردەوە، ئێمە گوێمــان لەو ڕادیۆیــە دەگرت. بەهەرحاڵ مەلا مســتەفا لە ســەرەتای مانگی ئۆردیبەهەشــتی (١٣٢٦) (١٩٧٤/٤) ڕۆیشتەوە عێراق و لە مانگی خوردادی هەمان ســاڵ لــە ڕێگای کوێســتانەکانی تورکیاوە دەچێتەوە خاکــی ئێران. واتــە مــاوەی (٣٦) ڕۆژ بەرگریی کــردووە. دواتر بۆی دەرکەوت کە ناتوانێت بەرگریی بکات و ژمارەیەک لە کوردەکانی ئەوێش خیانەتیان لێکرد، هەربۆیە بڕیاری دا بەرەو سۆڤیەت بڕوات. مانگی تیر و خورداد بــوو، حکومەتی ئێرانیش دەیزانی کە ئەوان گەڕاونەتەوە بۆ عێراق و لەوێ بوونەتە پەنابەر و کاریان تەواو بووە. هێزەکانی خۆیان کە لەســەر ســنوورەوە لە دژی ئێمــە جوڵاندبوویــان، گێڕابوویاننەوە بــۆ دواوە. بۆ نموونە لە ناوچەکانی تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ پێنجســەد تــا هەزار ســەربازیان هەبوو، هەموویــان کۆکردنــەوە و ناردیانن بۆ ئورمیــە، کە لــە فەرماندەیی لەشــکری چوار لەوێ بوو. ســنوورەکان چۆڵکرابوون، ئەو کێوانەش لەســەر سنوور بوون هەر لە شنۆوە تاکو ســنووری ســۆڤیەت چۆڵکرابوون. ئەو کێوانە کە لایەکیان تورکیا بوو، لایەکەی تریشــی ئێران. ئەوان بە پیادە دەڕۆن و گوندنشــینانی ســەر ڕێگاکەیان هاوکارییان کردبوون و نان و خواردنیان پێ دابوون. ئەوان گەیشــتبوونە خوان (شــاپور)، کە حکومەتی ئێران هەســت دەکات مەلا مســتەفا لــە عێراقەوە گەڕاوەتەوە ئێــران. هێزەکانی ئێران دەڕۆن و لە نزیــک گوندی (قەرەزیادین) پێش بە مەلا مســتەفا دەگرن و شــەڕێکی سەخت دەست پێدەکات.

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان: لەگەڵ ئێراندا؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، بارزانییەکان لەگەڵ حکومەتی ئێراندا، لە هەردوولا کوژراوێکی زۆر هەبوو، ئیتر ئەوان ڕۆیشتن و سەربازەکان نەیانتوانی گەمارۆیان بدەن. ئەوان دەکەس دەکەس دابەش ببوون و لەگەڵ سەربازانی ئێرانیدا جەنگی پارتیزانییان دەکرد، تاکو خۆیان گەیاندە کێوەکانی ماکۆ، لەو کێوانە فڕۆکەش هیچ کارێکی پێ نەدەکرا. کوردەکان پاڵدەدەنە کێوەکان و لەوێوە دەچنە سەر ڕووباری ئاراس لەوێ کەڵەک دروست دەکەن و لە ڕووبارەکە دەپەڕنەوە. لەو شەڕەدا کوردەکان ژمارەیەکیان لێ دەکوژرێت و ژمارەیەکیان بریندار دەکرێن و ئەوانی تریش سەلامەت دەبن. ئەوان ڕوو دەکەنە باکۆ لە وڵاتی سۆڤیەت. ئیتر مەلا مستەفا گەیشتە باکۆ و ئێمەش دەگەڕێینەوە سەر بەسەرهاتەکەی خۆمان.

**هاوسەری سەفەرخان: مەلا مستەفا ئێوەی لەگەڵ خۆیدا نەبرد؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، ئێمەی نەبرد، لەوانەیە ئاوهای بە باش زانیبێت، ئاخر بۆچی ئێمە لەگەڵ خۆی ببات، بۆ برسێتی و تینوێتی. ئاو نەبوو، خواردن نەبوو، شارەزا نەبوون، زمانیان نەدەزانی. ئەوان ڕۆیشتن بۆ سۆڤیەت و ئێمە لە دیانە لەناو تەلی دڕکاوییدا زیندانیی کراین، چادریان بۆ هەڵداین و ڕۆژانە کەمێک ئاویان پێ دەداین.

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان: ئەی بەشە خۆراک؟**

**سەفەرخان:** بەشە خۆراکەکە نازانم بڕەکەی چەند بوو، کەمێک خورما و کەمێک شەکریان دەدا، گۆشت هەر نەبوو.

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان: ئەی چایی؟**

**سەفەرخان:** چاییان نەدەدا، تەنها سێ شتیان پێ دەداین: ئارد و شەکر و خورما. خۆشبەختانە چادری بارزانییەکان بە بەتاڵی بۆ ئێمە مابووەوە، ئەوکات مەسعودی کوڕی مەلا مستەفا تەمەنی دوو ساڵ بوو.

**هاوسەری سەفەرخان:** مەنسور؟
**سەفەرخان:** نانا منداڵەکانی مەلا مستەفا، بارزانییەکان.
**هاوسەری سەفەرخان:** ئێ ئەوان. مەسعود و ئیدریس و ئەوانی تر.
سەفەرخان: لەگەڵ ئیدریس و ئەواندا لە یەک خێمەدا بووین، ئەوان ژنەکانیان ڕووخساریان داپۆشراو بوو، ئەوان تاجیان دەخستە سەر سەریان و سی چل کەس پارێزگارییان لێدەکردن، ژنەکانیان بە سواری ئەسپ و هێستر دەبردن. ئەگەر کەسێک لەوێ پارەی پێبووایە، دەیتوانی بۆ خۆی خواردن ئامادە بکات، بیرم دێت دەیانگووت لەم خواردنە بەشی ئەفسەرە ئازەربایجانییەکان بدەن. هەفتەی دوو سێ جار خواردنیان پێ دەداین. ئێمە ماوەی شەش مانگ لەناو ئەو تەلبەندەدا بووین. ئوردووگا بوو، چۆڵەوانییەک بوو، چواردەوری تەلبەند کرابوو. نزیکەی دە هەزار چادر دەبوو کە هەڵدرابوون. ئاخر کە دەڵێین بارزانییەکان ئەوان تەنها چەند کەسێک نەبوون، ئەوان چەندین هەزار کەس بوون، هەموویان بە ماڵ و منداڵەوە بوون. دراوسێکەی ئێمە کە کوردی ئێرانی بوون، ئاردەکەیان بۆ دەکردین بە نان، چاییمان لە عێراقییەکان وەردەگرت. لەوێ دار و چیلکە زۆر بوو، ناوچەکە دارستان بوو، خۆمان چاییمان دروست دەکرد. ئێمە ماوەی شەش مانگ لەوێ بووین، دوای شەش مانگ ناونووسیان کردین و سەد کەس سەد کەس سواری ئۆتۆمبێلیان کردین و خۆمان نەماندەزانی بۆ کوێمان دەنێرن، هەر دەستەیەک دەنێردران بۆ شوێنێک. نۆبەی ئێمەش هات، چەند کەسێکی ئێمەیان نارد بۆ موسڵ، چەند کەسێک بۆ کەرکوک و چەند کەسێک بۆ هەولێر و شارەکانی نزیک بەغدا.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئێوەیان بۆ کوێ نارد؟**
**سەفەرخان:** ئێمە نێردراین بۆ هەولێر.

**عەلی ئەشرەف دەرویێشیان: لە هەولێر ئێوەیان زیندانیی کرد؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، سێ چوار مانگ لە زیندانی هەولێر بووین، هەموو ڕۆژێک سێسەد فلسیان پێ دەداین کە دەیکردە پێنج تومەنی ئەو کاتە.

**هاوسەری سەفەرخان:** ئەو کاتە سەردەمی نووری سەعید بوو؟

**عەلی ئەشرەف دەرویێشیان: نەخێر ، مەلیک فەیسەڵ بوو.**

**سەفەرخان:** نوری سەعید هەموو شتێک بوو، سەید عەلی حیجازی فەرمانــدەی هێزە چەکدارەکانی عێراق بوو، کە لەگەڵ شــێخ ئەحمەدی برای مەلا مستەفا ڕێکەوتنی کردبوو، ئەو کاتەی ئێمە لە زیندانی هەولێر بوویــن، لە عێراق جولانەوەیەکی تازە ســەری هەڵدابوو. (٢٤) کاتژمێر کــۆڕ و کۆبوونــەوە بوو، حەیــدەر نامیەک هەبوو ئــەو هەواڵەکانی بۆ ئێمــە دەهێنا، خواردن و گوێزان و پێویســتییەکانی تــری بۆ دەهێناین، هەواڵەکانیشی پێ دەداین، لە هەولێر کەسێک هەبوو ناوی شێخ محێدین بوو، تەکیەی هەبوو، دەزانیت تەکیە چییە؟

**عەلی ئەشرەف دەرویێشیان: بەڵێ دەزانم.**

**سەفەرخان:** ئەو شێخ محێدینە هات و ئێمەی لە زیندان دەرکرد، بەو مەرجەی تەنها لەناو شــاردا بمێنینەوە و لە شــار نەچینە دەرەوە، ئەو کەفیلــی ئێمە بــوو، مافی ئەوەمان نەبوو بڕۆین بۆ شــارەکانی تر. ئەو خانەقــای هەبوو، لە خانەقاکەی ژوورێکی پێداین، کەســێکی زۆر باش بوو، دەیگووت: من هاتووم بۆ ئێران. ئێمە چەند ڕۆژێک لە خانەقاکەی ئەو بووین، خواردنیان نەبوو، تەنها گەنم و ساوەر و نیسکیان هەبوو، خواردنەکەیــان هەر ئەوە بوو، گۆشــت نەبوو، دوای ماوەیەک خەریک بــوو لەنــاو دەچووین، هەندێــک جار دەڕۆیشــتین لــە دەرەوە نانمان دەخوارد.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: خۆشــیان لەو گەنم و ساوەرەیان دەخوارد؟**

**سەفەرخان:** نازانم ئەوان ژووری خۆیان جیابوو، ئێمەش لە ژوورێکدا بووین و هەندێک ڕۆژ مەراسـیمان هەبوو. دەروێشەکان کۆدەبوونەوە و زیکریان دەکرد، بانگی ئێمەشـیان دەکرد، ئێمەش دەچووین، ئەوەندە هاوهویان دەکرد تاکو بێهۆش دەبوون.

**هاوسەری سەفەرخان:** ئەوان لەسەر مەزهەبی عەلی ئیلاهی بوون؟

**ســـەفەرخان:** نەخێر، ئەوان شێخی تایبەتی سوننەکان بوون، ئەوان لــە زۆر شــوێن هەن، لــە ئێرانیش هــەن، بەڵێ ئێمەش دەڕۆیشــتین و سەیرمان دەکردن.

**هاوسەری ســـەفەرخان:** ئەو کاتەش تێریان لە خۆیان دەدا و بەرد و ئاگریان دەخوارد؟

**ســـەفەرخان:** نەخێــر، تەنها هــات و هاواریــان دەکرد و ســەریان بەملاولادا دەتەقاند.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: دەفیان لێدەدا؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، دەفیان لێدەدا. ڕۆژێکیان من ماندوو ببووم، شێخ هــات و گووتی: تــۆ دەتوانیت درەخت هەڵپاچیــت و بیانبڕیت؟ گووتم: بەڵێ.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: گووتت شارەزام؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، بۆئەوەی بڕۆمە دەرەوە و هەوای پاک وەربگرم و سەیری دەرەوە بکەم.

**هاوسەری سەفەرخان:** بــەڵام شــارەزا بوویت، چونکە پێشتر باخی خۆتان خزمەت کردبوو.

**ســـەفەرخان:** بەڵێ، شــارەزا بووم، دوو چەکداریــان لەگەڵ ناردم تاکو ڕانەکەم، شــوێنەکە نزیکەی یەک کاتژمێر و نیو بە پێ دوور بوو،

ڕۆیشتین تا گەیشتینە گوندێک کە ئەوان چرای ڕووناکییان نەبوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەو گوندە؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، هەمان گوند کە باخەکەی لێبوو، لە ماڵەکانیاندا لەجیاتی چرا، ئاگریان کردبووەوە، لەبەر ڕووناکی ئاگرەکە دادەنیشتین، ئەو کاتە خەڵکی دواکەوتوو بوون. بۆ بەیانی من ڕۆیشتم بۆ هەڵپاچینی باخەکە، بەڵام نەک لەسەر شێوازی ئەوان، بەڵکو لەسەر شێوازی خۆمان. کوێخای گوندەکە هات و گووتی: بەڕاستی ئەم کەسە شارەزاییەکی باشی هەیە لە نەمام بڕین. لەناو باخەکەدا ژوورێک هەبوو منیان برد بۆ ژوورەکە و چاییان پێدام. ئەوان لایەنگری مەلا مستەفا بوون و ڕێزی زۆریان لێگرتم. کارەکە زۆر بوو بە دە ڕۆژ تەواو نەدەبوو، من بە خێرایی دەستبەکار بووم و لە ماوەی سێ ڕۆژدا کاری هەڵپاچینی باخەکەم تەواوکرد. باخەکانی ئەوان وەک باخەکانی ئێمە نین، وەک باخەکانی ئورمیەن.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: داربەستیان بۆ درەختەکانیان نەکردبوو؟**

**سەفەرخان:** داربەستی چی؟ باخەکە پڕ لە بژار بوو. هاتم بە کوێخای گوندەکەم گووت کارەکەم تەواو کردووە. لەگەڵ دوو چەکدارەکە گەڕامەوە. زۆر پەست و خەمبار بووم، یەک کاتژمێر و نیو بە پێ هاتین تا گەیشتینە سەر جادە، لەوێ سواری ئۆتۆمبێل بووین و هاتینەوە بۆ هەولێر.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: بۆ هەمان شوێنی خۆتان؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، ئێمە لە ماڵی شێخ دڵمان ئاسودە نەبوو، پارەمان پێبوو لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی ترماندا ڕۆیشتین جێگایەکمان گرت، ئێرانییەکانی ئەوێ زۆر هاوکارییان کردین. ڕۆژانە دەچووینە لای

ئێرانییەکان دادەنیشتین، ئەوان هەریەکە و کارێکیان دەکرد. وەک وێنەگریی، دارتاشی، کۆپان دروون. قەڵایەکی کۆن لە ناوەڕاستی شاردا هەیە نازانم ناوی چی بوو؟ لە قەڵاکەدا تۆپێکم بینی ئەوەندەی فەرشێکی (٢×٣) دەبوو. ئەو تۆپە هی یەکێک لە پادشاکانی ئێران بوو، کە هاتبوون و عێراقیان داگیرکردبوو، ئەو تۆپە لەوێ جێمابوو. ئێمە دەڕۆیشتین سەیرمان دەکرد. کاتی عەسر دەچووین بۆ سەر گۆڕستانەکان، ئەوان گۆڕستانەکانیان هەروەکو ماڵەکانیان خاوێن بوون. سەردانیکردنی گۆڕستان دڵی مرۆڤ هێور دەکاتەوە. لەو ڕۆژانەدا بیوک خانی سەرۆکی عەشیرەتی (قەرەپاپاخ) هات بۆ عێراق و داوای لە ئێمەی کرد و گووتی: هاتووم ئێوە بەرمەوە، شا لێبووردنی بۆ ئێوە دەرکردووە. ئێمەش گووتمان شوێنەکەمان زۆرباشە و پێویستمان بە لێبووردنی شا نییە. ئەو سەگبابە خۆشی پێشتر لایەنگری ئەفسەرانی تیپی ئازەربایجان بوو، ئەو پلەکەی سەرهەنگ بوو، شاعیریش بوو، هەر ئەو بوو هەموو چەکەکانی لە جووتیاران و پێشمەرگەی ئازەربایجان کۆکردبووەوە و تەسلیمی شای کردبوونەوە و ببووە لایەنگری شا. ڕۆژێکیان ڕۆیشتبووم بۆ حەمام، سەیرم کرد دەوروبەری حەمام ئاسایی نییە و چەکدار دەوری حەمامەکەیان گرتووە. هاتمە دەرەوە سەیرم کرد ئەو چەکدارانە هەموو بارزانییەکانن.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: خۆتان شۆریبوو؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، تەواو ببووین. سەرهەنگ قولی خان هاتبوو، ئەو سەرۆکی عەشیرەتی قەرەپاپاخ بوو، ئەو پێشتر سەرهەنگ تیپ بوو، چەند کەسێکی ناردبوو تاکو ئێمە دەستگیر بکەن. بارزانییەکان هەواڵیان زانیبوو، هاتبوون کە نەهێڵن ئێمە دەستگیر بکرێین.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: دەیانویست ئێوە بۆ کوێ ببەن؟**

**سەفەرخان:** دەیویست بمانبات تەسلیمی حکومەتی ئێرانمان بکاتەوە،

ئاخر ئەو ببووە شاپەرست، ئەو سەگبابە کاتی خۆی ئێمە کردبوومان بە سەرهەنگ، ئەو سەرۆکی عەشیرەتی قەرەپاپاخ بوو. قەرەپاپاخەکان لە قزاقستانەوە هاتبوون، لە سەردەمی جەنگی بەلشەویکەکانەوە هاتبوونە ئێران. ناچار ئێمەش هاڵاتین و هاتینە سەر سنووری ئێران، لەوێ کەسێک هەبوو ناوی شێخ عەبدوڵلا بوو چووینە لای ئەو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: واتە ئێوە لەو ماڵە هەڵاتن، شەو هەڵاتن، چۆن هەڵاتن؟**

**سەفەرخان:** نا، بەو جۆرە نەبوو، لەوێ کێ بە کێ بوو، جارجار دەڕۆیشتین و دواتر دەهاتینەوە و خۆمان دەناساندەوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: دوایی هاتن بۆ لای شێخ عەبدوڵلا؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، شێخ عەبدوڵلا زۆر ڕێزی لێدەگرتین، ئەویش هەر وەکو شێخ محێدین تەکیەی هەبوو، ئەو کەمێک فارسی دەزانی، لەگەڵ ئێمەدا بە فارسی قسەی دەکرد، ئەو لایەنگری سۆڤیەت بوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: واتە ئەو لایەنگری سۆڤیەت بوو؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، لایەنگری سۆڤیەت بوو، ئامۆزایەکی ناجنسی هەبوو، ئەو ئامۆزایەی لایەنگری ئینگلیزەکان بوو، ناوی شێخ عەلادین بوو، ئەو ناپیاوە دەڕۆیشت هەواڵی لێدەداین، ئەو دەیویست ئێمە بچینە لای ئەو و لە گوندەکەی ئەو بمێنینەوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: بۆچی بچنە لای ئەو؟**

**سەفەرخان:** ئاخر لەوێ هەمیشە شەڕ و پێکدادان بوو، ئێمەش کەسانێکی زرنگ و چالاک و چەکدار بووین. ئەوان پێویستیان بە ئێمە هەبوو، بەڵێ، ئەو بەردەوام شکاتی لێدەکردین، ڕۆژێک هاتن و ئێمەیان گرت و بردیانین بۆ پارێزگا و چووینە بەردەم پارێزگار. ئەو لێی

پرســین بۆچی هەڵاتووین؟ ئێمە گووتمان هەڵنەهاتووین، ڕۆیشــتووین بــەدوای پارووە نانێکدا دەگەڕێین. لەو کاتەدا کەســێکی ئێرانی شــیعە هات و گووتی: ئێوە بۆچی دەتانەوێت بگەڕێنەوە بۆ ئێران؟ ئاخر لەوێ دەتانکــوژن. گووتم: کاکە ئێمە نامانەوێت بگەڕێینەوە بۆ ئێران. ئەویش گووتــی: ئەمە دۆســیەکەتانە و دەیانەوێت ئێوە بگەڕێننــەوە بۆ ئێران. ئێمەش بە زوویی گەڕاینەوە بۆ لای پارێزگار.

**عەلی ئەشرەف دەروێشــیان: واتە حکومەتی عێراق دەیانویست ئێوە بگەڕێننەوە بۆ ئێران؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، حکومەتی عێراق دەیویست ئێمە تەسلیم بە ئێران بکاتەوە، باشــبوو ئەو کەسە فارســە هاوکاریی کردین، ئێمە هاتبووینە عێراق و ببووینە پەنابەر، ژمارەیەک لە ئەفســەرانی عێراقیش لە ئێران ببوونــە پەنابــەر، دەیانویســت ئێمە لەگەڵ ئــەو پەنابــەرە عێراقییانەدا بگۆڕنەوە. دیارە ئێمە خۆمان ئاشــکرا نەکردبوو وەکو چەند کوردێکی لادێــی خۆمان ناســاندبوو، جلوبەرگی کوردیمان لەبــەر کردبوو. ئێمە نەمانگووتبوو ئەفســەرین و لــە تیپی چەکداریــی ئازەربایجان بووین، بەڵام جاسووســەکان گووتبوویان لە ڕێگای بەسرەوە لەگەڵ ئەفسەرە هەڵاتــووە عێراقییــەکان بیانگۆڕنــەوە. ئێمە ئەو هەواڵەمــان بەر گوێ کــەوت، بۆیە هەڵاتین و بە ئۆتۆمبێل هاتینە زینوی شــێرێی لای حاجی ئۆمــەران. تەنهــا یەک بەڵگــەی هاتوچۆمان پێبوو کە لێی نووســرابوو ئەمانــە دەتووانن لە ســنووری هەولێر بە ئازادیی بســوورێنەوە. بۆیە نەیاندەتوانــی لیکۆڵینەوەمان لەگەڵدا بکەن؛ کە بۆچی بەو کاتی شــەوە هاتووین. شــەوێکیان لە زینوی شێرێ خەوتبووم، پولادخان هات و لە خەو هەڵیساندم. ئێمە لەو گوندە هەریەکەمان لە ماڵێک بووین، من زۆر نیگەران بووم، چونکە بولادخان لەگەڵ کچێکدا پەیوەندیی هەبوو، گووتم دیارە کارەســاتێک ڕوویداوە، بۆیە هاتووە بە شوێنمدا تاکو کێشەکەی بــۆ چارەســەر بکەم. هەرچەند گووتم: چی ڕوویــداوە، پێی نەگووتم و

گووتـی جـاریّ وەرە لەگەڵمدا، گەیشـتینە ماڵەکە. سـەیرم کرد باوکی بێچارەم لەوێیە، هەموو گیانی دەلەرزی، ڕشـک و ئەسـپێی لێدابوو، بە زوویـی خاوێنم کردەوە و لێی دەپرسـم هەواڵی حەیدەر ئاغاقی چییە؟ گووتی: لەسێدارە دراوە، ئەی مەحمود مهاجر، لەسێدارە دراوە. مەحمود ژاندارم لەسێدارەیان دا. ئەسغەر نوری لەسێدارە دراوە، بۆم دەرکەوت تـەواوی هاوڕێکانم لەسـێدارە دراون و ئێمە ئـاگادار نەبووین. باوکم چەند ڕۆژێک لە لامان مایەوە، باوکم لە ڕێگەی قاچاخچییەکەوە هاتبوو. لە مهاباد ئاشـنایەکمان هەبوو ئەو ڕێنوێنـی کردبوو و بەڕێی کردبوو بۆ لای ئێمە. دوای چەند ڕۆژێک باوکم گەڕایەوە بۆ ئێران. ئێمە حەوت هەشـت کـەس بووین بەرنامەمـان دانا بگەڕێنەوە ئێـران و لە چیاکان بژین و لەوێوە ڕێگایەک بدۆزینەوە و خۆمان بگەیەنینە سـۆڤیەت. ئێمە هەموومـان لەگـەڵ یەکتـری ڕێکنەکەوتین و لە یەکتـری جیابووینەوە و هەریەکـە و بـەرەو لایـەک ڕۆیشـتین. منیش لە نەغەدە ئاشـنایەکم هەبـوو بـە ناوی (برایمـە دزە) چووم بۆ لای ئەو، ئـەو پێی گووتم کە پۆلاد و بولود لێرەن، من لەبەرئەوەی بەڵێنی چەند ڕەشاشێکم بە شێخ عوبەیدوڵڵا دابوو، هەر لەویّ ڕەشاشەکانم بۆ نارد.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ڕەشاشت لە کویّ هێنا؟**

**سەفەرخان:** ئێمە ڕەشاشمان زۆر بوو، لێرە و لەویّ دامانابوون، لە هەر گوندێک کە ئاشـنامان هەبوو، چەند ڕەشاشێک و چەندین فیشەک و چەند ئەسپێکمان بۆ پێویستییەکانی خۆمان دانابوون، لە زۆر شوێن جۆرەها چەک و فیشـەکمان شـاردبووەوە. دواتـر باوکم هەندێک لەو چەکانە دەدۆزێتەوە و دەیباتەوە لە باخەکەی خۆمان حەشاریان دەدات و هەندێکیان دەفرۆشـێت. ڕەشاش و شەسـتیرەکان باش نافرۆشرێن، بەڵام تفەنگ و فیشەکەکان باش دەفرۆشران. لەسەر ئەو چەکانە باوکم دەسـتگیر دەکرێت و ماوەی یەک سـاڵ و نیو زیندانیی دەکرێت، دوای یەک سـاڵ و نیو دووبارە دێتەوە بە سۆراخی چەکەکانەوە. لەو کاتەدا

ماڵەکەمـــان تاڵان کرابـــوو، تەنانەت بزمـــاری دیوارەکەشـــیان بردبوو، ئاژەڵ و هێســـتر و فەرش و نوێن و قاپ و قاچاخ هەرچی هەمان بوو بردبوویـــان، تەنهـــا خانووەکەمان بە بەتاڵی مابـــووەوە، لەو کاتەدا ئەو فیشـــەکانە بۆ باوکم زۆر بەســـوود بـــوون، ئەوانی لە برســـێتی ڕزگار کردبوو. باوکم ئەو فیشەکانەی سەد دانە سەد دانە دەبرد و دەیفرۆشتن و ماوەی یەک ســـاڵ و نیو بە پارەی ئەو فیشـــەکانە ژیابوون. پیاوێکی پیریش هەبوو ئەویش شـــوێنی فیشـــەکەکانی دەزانی، ئەویش باخەوان بـــوو، پار کە ســـەردانی گوندەکەمانم کرد، ئەو گووتی: ســـندووقێک لە فیشـــەکەکانی بـــردووە، ئەو باســـی ئـــەوەی دەکرد کە چـــۆن ئێمە ئەو سندووقە فیشەکانەمان شاردووەتەوە.

شـــێخ عوبەیدوڵڵا زۆر خزمەتی ئێمەی کرد، منیش ڕەشاشەکانم بۆ نـــارد. بیرم دێت کاتێک لای شـــێخ عوبەیدوڵڵا بوویـــن، مانگی ڕەمەزان بـــوو، ئەو پێی گووتین ئێســـتا مانگی ڕەمەزانە و ئێـــوە وەرن لە تەکیە نانـــی پارشـــێو و شـــێوان بخـــۆن، خواردنەکەش تەنها گەنم و ســـاوەر و نیســـک بوو، ئێمـــە نەڕۆیشـــتین. دواتر پێی گووتیـــن بۆچی نەهاتن؟ منیش گووتم: مامەشـــێخ خەجاڵەتییە بۆ ئێمە کە ئەوەندە ئێوە زەحمەت بدەین. ڕاســـتییەکەی ئەوە بوو ئەو نەیدەزانی ئێمە نوێژ ناکەین، لەوێ وا بـــاو بوو هەرکەســـێک نەڕۆیشـــتایە بـــۆ نوێژی هەینـــی، لە حەوزی ئـــاوی مزگەوتیان هەڵدەکێشـــا و دارکارییان دەکرد. شـــێخ عوبەیدوڵڵا کوڕێکـــی هەبـــوو ئەویش نوێـــژی نەدەکرد، بـــەڵام ئێمە ناچـــار بووین بڕۆین بۆ نوێژکردن، ئەگەر نەڕۆیشـــتینایە دەیانگووت ئەمانە موسڵمان نین. جارجار دەڕۆیشـــتین و نوێژمان دەکرد و وەک ئەوان دەســـتمان دەگرت، بەڵام هیچمان نەدەگووت. شـــێخ کوڕێکـــی هەبوو، ناوی عەلی بوو، ئەویش بۆ نوێژکردن هەروەکو من بوو. شـــێخ لێی پرســـیم بۆچی ئێوە کە نوێژ دەکەن دەســـت دەگرن، باشـــە منیش ناچـــار بووم وەڵام بدەمەوە. گووتم: ڕاســـتییەکەی ئەوەیە ئەگەر وەک ئێوە دەست نەگرین پۆلیس و ســـیخوڕەکان دێن و دەمانگرن و دەڵێن ئەم پەنابەرە شیعانە

لیـرە خۆیان شـاردووەتەوە. بۆیـە وا نوێژ دەکەین کە ئـەوان نەزانن ئێمە شـیعەین، بەو جۆرە شـێخم ڕازیکرد. لەبـارەی نانخواردن لەلای ئـەوان، گووتـم: نامانەوێت ڕۆژانە بێین و ببینە ئەرک بەسـەر ئێوەوە. ئەوەنـدەی لەو گوندە بووین بـەردەوام نوێژمان دەکـرد، بەڵام دواتر نوێژمان نەدەکرد. شـێخ عوبەیدوڵڵا و مەلا مسـتەفا بەردەوام نوێژیان دەکرد. ڕۆژێکیان کە لە گوندی مەرگەوەڕ گەمارۆ درابووین و پێشـتر باسـم کرد. بە مەلا مسـتەفایان گووت گەمارۆ دراوین، سـەربازەکان بە تەواویـی گوندەکەیان گەمارۆداوە، مەلا مسـتەفا لەو کاتەدا نوێژی دەکـرد. هەرچەنـدە داوایـان لێکرد نوێژەکـەی ببڕێت و ڕابـکات، یان شـەڕ بکات، ئـەو گوێی پێ نەدان، بەڵام ئێمە زۆر ترسـاین، سـواری ئەسـپەکانمان بووین و چاوەڕوانی ئەومان کرد تاکو نوێژەکەی تەواو بکات. نوێژەکەی تەواو کرد و ئینجا دەسـتی کرد بە شەڕکردن و ئێمە شـەڕێکی باشـمان کرد و گەمارۆکەمان شکاند، مەبەستم ئەوەیە پێتان بڵێم کە مەلا مستەفا کەسێکی زۆر نەترس و بەدین بوو.

**عەلی ئەشـرەف دەروێشـیان: باشە گەیشـتینە ئەوەی کە لە هەولێرەوە هەڵاتن و هاتن بۆ زینوە شێری نزیک حاجی ئۆمەران؟**

**سـەفەرخان:** بەڵێ، هەڵاتین و هاتین بۆ کێوەکانی نزیک ئێران، ئێمە ناچاربووین، ئاخر چی بکەین؟ لە ئورمیە ئاشـنایەکم هەبوو ئەو کاتەی کـە لەوێ شـەڕ بوو، ئەو هەڵاتبوو و هاتبوو بـۆ گوندەکەی ئێمە و لە ماڵی ئێمە بوو. ئەو ئاغا بوو ئێمە هاوکاریمان کردبوو، بۆیە ئومێدەوار بـووم کـە ئەویش مـن بحەوێنێتەوە. باوکم ڕۆیشـتبوو بـۆ ئورمیە و ئەوانـی بینیبوو، ئەوان بە ناچاریی گووتبوویان باشـە با سـەفەرخان بێت، منیش ڕۆیشـتم بۆ ئورمیە. ئەو ئاشـنایە کە چاوی بە من کەوت، نەیگووت با بڕۆین بۆ ماڵی خۆمان، بەڵکو گووتی: حکومەت لێبووردنی دەرکـردووە و لـە چی دەترسـیت، من ڕەوشـەکەم بەو جـۆرە بینی. بیـرم کردەوە کـە چی بکـەم. نەمدەزانی چۆن بەرەو سـۆڤیەت بڕۆم

و شــارەزا نەبووم، ناچــار براکەم نارد بۆ تــاران، تاکو بزانێت حیزبی توده دەتوانن ئاگاداریم بکەن، یان نا. زســتانێکی ســەخت بوو، براکەم لە تاران گەڕایەوە و هیچ کەســێکی نەبینیبوو. گووتی: لە تاران خەڵکی ماڵوێرانن، هیچ کەسێک هاوکاریی هیچ کەسێک ناکات و خەڵکێکی زۆر دەســتگیر کــراون. تەنانەت لە ئورمیەش ژمارەیەک خەڵکیی دەســتگیر کرابوون. من ئەوەم زانیبوو کە چەند کەســێک لە هاوڕێیانی تیپەکەمان لە ترســی ئاغاکان ڕۆیشــتبوون بۆ گوندی (ویلنچــی) لە نزیک نەغەدە و خەریکی کاری کشــتوکاڵکردن بوون، یەکێک لەو هاوڕێیانە هاتە لام و گووتــی: تــۆش وەرە بــۆ لای ئێمە و لــە لای ئێمە بمێنــەرەوە تاکو ڕێــگای عێــراق دەکرێتەوە و ئەوکات بڕۆ بۆ عێــراق (ئەوکات ڕێگاکان گیرابــوون نەدەتوانــرا بڕۆین بۆ عێراق)، دیارە ئــەو هاوڕێیەم گووتی: ئێمە لە گوندەکەدا ناتوانین بۆ ماوەیەکی زۆر ئاگادارییت بکەین. من لە ئورمیــە ژوورێکم بەکرێ گرتبوو، ئەو هاوڕێیانەم هاتن بۆ لام و چەند ڕۆژێک لای من مانەوە. ڕۆژی چوارشەممەی ڕێکەوتی (١٨) ئەسفەندی (١٣٢٧) (١٩٤٧/٣/٨) بــوو، کاتژمێــر نزیکــەی پێنجی دوانیــوەڕۆ بوو، یەکێک لە ســیخوڕەکانی شا منی دەناسی، چونکە پێشتر من لە دەستی ئــەو هەڵاتبووم و ئــەو نەیتوانیبوو من بگرێتەوە، لــە نزیک گوندەکەی خۆمانەوە هەواڵ دەدەن بە پۆلیس کە من لە ئورمیەم و پۆلیسەکانیش بەدوامدا دەگەڕان. هەمان عەسر کە گووتم، ڕۆیشتین بۆ دوکانێک تاکو بەتانــی بکڕین، ئێمــە پێنج کەس بووین دەمانویســت بڕۆین بۆ گوندی (ویلنچی) ئەو گوندەی کە هاوڕێکانمان لەوێ کاری کشتوکاڵیان دەکرد. کاتێک لە دوکانەکە هاتینە دەرەوە، ئێمە گەمارۆدراین. بەڵێ، لەو کاتەدا یەکێــک لــە هاوڕێکانمان هــەڵات و دواتر گرتیانــەوە و زیندانییان کرد ئەویش ئەفسەر بوو لە تیپەکەماندا، تاکو پاریش لە ژیاندا مابوو، هەمان کــەس ڕادەکات و دەڕوات بــۆ گوندەکەمان و هەواڵیــان پێ دەدات کە ئێمە دەستگیرکراوین. ئیتر من و ئەو چەند هاوڕێیەم دەستگیرکراین و بردیانین بۆ بنکەی پۆلیس. سەرهەنگ (بەیات ماکۆ) بەڕێوەبەری پۆلیسی

ئورمیە بوو، کاتێک منیان برد بۆ لای ئەو، جگەرەکەم بەدەستمەوە بوو، ئەو پۆلیسەی لەگەڵمدا بوو گووتی: جگەرەکەت فڕێ بدە. سەرهەنگ بەیاتی گووتی: نا لێیگەڕێ با جگەرەکەی بکێشێت، دوایی پێی گووتم تا ئێستا لە کوێ بوویت؟ ئێمە بەردەوام بەدوای تۆدا دەگەڕاین. منیش گووتم: مەگەر من کێم وا بەردەوام بەدوامدا دەگەڕێن؟ ئەویش چەند شەبازەلەیەکی لێدام. هەواڵی دەستگیرکردنی منیان بە زوویی لە سەرانسەری ئێراندا بڵاوکردەوە. ناسنامەیەکیان لە گیرفانم دەرکرد و گووتی: لێرەدا نووسراوە کە تۆ ناوت ئەکبەرە، دواتر گووتی: تۆ سەفەری قارەمانیانیت. مەگەر تۆ حوکمی لەسێدارەدانت بۆ سەرهەنگ موعین ئازاد دەرنەکرد، مەگەر تۆ نەبوویت کە دەستت بەسەر دەیان پاسگادا گرت و چەکت کردن. دواتر بڕیاری دا کە بمبەنەوە بۆ بنکەی پۆلیس. سەرهەنگ گووتی: کاتێک حوسێن قولی خانمان دەستگیرکرد، ئەویش گووتی: من حوسێن قولی خان نیم، ئەوەتا تۆش دەڵێیت من سەفەرخان نیم. لەکاتێکدا تۆ سەفەریت و هەموو کەس دەتناسێت و تۆ پۆلیسەکانت چەک کردووە، ئەو پۆلیسانە هەموویان تۆ دەناسن. منیان بردەوە بۆ بنکەی پۆلیس لە ژووری تاکەکەسیدا زیندانیی کرام. جەژن بوو، شەوی جەژنی (١٣٢٨/ ١٩٤٨) کەمێک شیرینییان بۆ هێنام، دوای چەند ڕۆژێک بردیانم بۆ لێکۆڵینەوە، حەوت هەشت پۆلیسیان هێنا و لێیان پرسین و گووتیان: ئەم پیاوە دەناسن؟ هەموویان گووتیان: بەڵێ دەیناسین ئەوە سەفەرخانە و ئەو کەسەیە کە هات و ئێمەی چەک کرد، بەڵام هیچ کەسیان نارەزایيان دەرنەبڕی کە من ئازارم دابن، تەنانەت یەکێک لەوانە گووتی: سەفەرخان پێنج تومەن پارەی پێداوم، بەڵێ، ئەمە سەفەرخانە، تەواوی بنکە و بارەگاکان هەر لە (دوشاتە) تاکو تەبرێز ئەو دەستی بەسەرداگرتوون و پۆلیسەکانی چەک کردوون. ئەوان هەرچییەکیان بینیبوو هەموویان باسکردبوو. ماوەی دوو ڕۆژ بەردەوام پۆلیسیان دەهێنا بۆ ناسینەوەی من، نازانم ئەو پۆلیسانە چۆن ئاوها منیان دەناسی. ئیتر منیش بڕیارم دا کە ناو و ناونیشانی

خـۆم بەڕاسـتی بڵێم. ڕۆژی دواتـر ناوی خۆم بە سـەرۆکی زیندانیی ئورمیـە گـووت: کە ناوی (کەرەم ئوغلی) بوو. پێم گووتن من سـەفەر قارەمانیـم و چیتـان دەوێت بیکـەن، کەچی ئەوان بـەردەوام خەڵکیان دەهێنا و ئەوانیش دەیانگووت بەڵێ ئەمە سـەفەرخانە. ئیتر لێکۆڵینەوە دەسـتی پێکـرد. بەڕاسـتی بڵێـم ئەوکاتە فشـار و ئەشـکەنجە نەبوو، بووختـان و جوێن نەبوو، تەنها پرسـیار و وەڵام هەبوو، بەڵام کەمێک بە زمانی زبر. سـەروان (شـەقاقی) لێکۆڵینـەوەی لەگەڵدا دەکردم، ئەو دواتر بوو بە سـەرهەنگ. ماوەی شـەش مانگ لە ژووری تاکەکەسیدا بووم و سـەردانیکردنم نەبوو، یەکێک لەو کارمەندانەی زیندان پێشـتر پێشـمەرگەی تیپ بوو و لەگەڵ خۆماندا بوو، هیچ کەسـێک ڕابردووی ئـەوی نەدەزانی. ئـەو زۆر هاوکاریی دەکـردم، هەواڵی ئێمەی دەبردە دەرەوە بـۆ خـزم و کەسـەکانمان و هەواڵی ئەوانی بـۆ دەهێنایەوە. دەهاتــە لامان و دەیگـووت: چیتان دەوێت بۆتانــی دەهێنم. دوای یەک ساڵ لێکۆڵینەوەم تەواو بوو، بردیانم بۆ دادگای سەربازیی. هەموو باس و هەواڵەکانیـان لە ڕۆژنامەدا بڵاوکردبووەوە. ئەوانەی کە سـەردانیان دەکردم دەیانگووت هەموو شتەکانمان لە ڕۆژنامەکاندا خوێندووەتەوە و زۆر ناڕەحـەت بوویـن بـۆت. کەسـوکارم زۆر ناڕەحـەت بـوون بـۆم، هەرچی هەیانبوو فرۆشـتبوویان و نزیکـەی دە هەزار تومەنیان کۆکردبـووەوە کـە بیدەن بـە حکومەت و من ئازاد بکرێم. سـەرهەنگ بەیاتـی قبووڵی نەکردبوو گووتبووی دەبێت لـە دادگا دادگایی بکرێت، ئیتر بەڕێیان کردم بۆ مەراغە.

دوای دەسـتگیرکردنی مـن ژمارەیـەک لە هاوڕێیانم کـە لایەنگری دیموکرات بوون، لە ناوچەی شیشوان و عەجەبشێر و مەراغە هەڵسان بە کارێکی ئازایانە و سەردانی پۆلیسیان کرد و خۆیان کردە هاوبەشی هەموو ئەو تاوانانەی درابوونە پاڵ من، چونکە تا ئەو کاتە نزیکەی (١٥٠) کەس لەسـەر تاوانی لەسێدارەدانی سـەرهەنگ موعین ئازاد لەسێدارە درابوون، ئیتر ئەو هاوڕێیانە دێن و لە بنکەی پۆلیس خۆیان دەناسێنن.

دادگا ڕووکەشـــەکەی شـــا هەموویان حوکم دەدات لە (٣) ساڵەوە تاکو (١٢) ســـاڵ. ئەمانە بە ئازایەتی خۆیـــان تەواوی حوکمەکەیان لە زیندان تەواوکرد. دوای ئەوەی لە ڕۆژنامەکانی شا هەواڵی دەستگیرکردنی من بڵاوکرایەوە، جگە لە ئاغا و دەرەبەگەکانی مەراغە و هەشتڕود و زنجان و شازادە و مەلیک قاسمی و دەیان شاپەرست و کارمەندی حکومەت، هەر ڕۆژە و ژمارەیەکیان سەردانی فەرماندەی سەربازییان دەکرد، کە گوایە من زێڕ و خشڵی ژنەکانیانم دزیوە. ڕۆژێکیان لە زیندانەوە منیان برد بۆ فەرماندەیی ســـەربازیی، ســـەیرم کرد چەندیـــن پۆلیس ڕیزیان بەســـتبوو، ســـەرهەنگ ئەردەڵان ئاماژەیەکی بۆ من کـــرد و لە ئەوانی پرسی و گووتی: ئەو کەسە دەناسن. ئەوانیش هەموویان بە یەک دەنگ وەڵامیان دایەوە ئەمە ئەو کەسەیە لە پایگاکانی عەجەبشێر و شیشوان و ئازەرشـــەهر ئێمەی چەک کرد. منیش گووتم: ئەوان ڕاســـت دەکەن، بـــەڵام ئەم پۆلیســـانە هاوکاریی ئاغاکانیان دەکرد بۆ چەوســـاندنەوەی جووتیارەکان، هەر کوڕە جووتیارەکان بوون ئەوانیان چەک کرد، نەک من.

دوای هەواڵـــی دەســـتگیرکردنم، جگـــە لەوانـــەی کە پێشـــتر باســـم کـــردن، ژمارەیەکی زۆر ســـەردانی دادگای ئورمیەیـــان کرد، کە گوایە من ماڵەکانیانم تاڵان کـــردووە، بەڵام کاتێک ڕووبەڕووی من بوونەوە، داوای لێبووردنیـــان کـــرد و گووتیان چەند کەســـێک هانیـــان داوین کە بڵێین ئەم کەسە ماڵی ئێمەی تاڵان کردووە.

دوای شـــەش مانـــگ مانـــەوەم لـــە ژووری تاکەکەســـیدا، دادوەری لەشـــکری چواری ئورمیە منی گواســـتەوە بۆ زیندانی گشـــتی. پێشـــتر باســـم کرد کە بنەماڵەکـــەم هەرچی هەمان بوو فرۆشـــتبوویان و بڕی دە هەزار تومەنیان دا بە ســـەرهەنگ بەیاتی تاکو لە دادگای سەربازیی دادگایی نەکرێم. ســـەرهەنگ بەیاتـــی پارەکەی وەرگرتبوو خواردبووی و لە دادگاش من هیچ تاوانێکم لەســـەر نەبـــوو، ئەو تاوانەش کە چەکم هەڵگرتبـــوو، ماوەیەکی بەســـەردا تێپەڕیبوو. من ماوەی هەشـــت مانگ

بەبێ ئەوەی کەسێک سەردانم بکات لە زیندانی مەراغە مامەوە، دواتر دادوەر گووتبووی بۆچی ئەمەتان هێناوە بۆ ئێرە. یەکێک لە دەرەبەگەکانی ناوچەکە سەرۆکی دیوانی وڵات بوو، ئەو دەرەبەگانە زانیبوویان کە لە دادگادا بڕیاری لەسێدارەدانم لەسەر لاچووە، یان ئازاد دەکرێم، یان لە زیندان دەمێنمەوە، ئەوان ڕۆیشتبوون بۆ دیوانی وەزارەتی ناوخۆ و گووتبوویان پێویستە لە دادگای سەربازیی دادگایی بکرێت. ئیتر منیان لە مەراغەوە گواستەوە بۆ تەبریز. لەوێ گووتبوویان بۆچی ئەوەتان هێناوە بۆ ئێرە، دووبارە گەڕاندیانمەوە بۆ مەراغە. ئینجا بە هەوڵی ئاغا و دەرەبەگەکان لە مەراغە منیان پەلکێشی دادگای سەربازیی کرد. ڕۆژێک کارمەندەکان هاتن بە شوێنمدا و ویستیان لەدواوە دەستم ببەستن و بمبەن. منیش ڕێگرییم لێکردن و نەمهێشت لەدواوە دەستەکانم ببەستن. گووتم: لەبەرچی لەدواوە دەستم دەبەستن بۆ لە پێشەوە دەستەکانم نابەستن. منیان برد بۆ تەبریز و یەک قڕان پارەم پێ نەبوو، من ئەوەندە لەو شاپەرستانە دەترسام، تەنانەت لە ناوەکانیشیان دەترسام، ئەو سەگبابەی کە فەرماندەی هەموو سوپای ئازەربایجان بوو، زاواکەشی بە ناوی (وهرام) فەرماندەی لەشکر بوو. گووتم: ئێستا دەمبەن بۆ ژوورەکەی ئەو و لەوێ دەست دەکات بە لێدان و جوێنپێدانم، بەڵام خۆشبەختانە منیان برد بۆ ژوورێکی تر. لەوێ هیچ پرسیار و وەڵامێکیان لێ نەکردم، ئەم جارەیان لە دۆسیەکەمدا نووسیبوویان پێویستە زیندانی تەبریز وەرم بگرێت، ناردنی دۆسیەکەم بۆ دادگای سەربازیی بەهۆی ملهوڕیی محەمەد ڕەزا شا و دەسەڵاتی ئاغاکان بوو لە دامودەزگاکانی حکومەتدا. ئاغاکانی مەراغە ئەوەندەیان ڕەشوە دابوو، کە من مافی ئەوەم نەبوو پارێزەرێک بگرم.

ئیسماعیل خانی کە سەردەمێک سەرکردەی چەکدارەکانی ئازەربایجان بوو لە (چاراویماخ) بە بیستنی زیندانیکردنی من، براکەی دەنێرێت تاکو فریای دۆسیەکەی من بکەوێت، پارەی دابوو بە سەرهەنگ (ڕاد) و بەڵێنی هاوکاریکردنی لێ وەرگرتبوو. دوای ئەوەی

کە ئاغاکان ئەو هەواڵەیان زانی دەستیان کرد بە پیلانگێڕان، بەڵام براکەی ئیسماعیل خان کۆڵی نەدا و بەردەوام بوو لە هەوڵەکانی، تەنانەت سەردانی سەرهەنگ موئمینی کرد کە دادوەر بوو. لە کۆتاییدا دوای دە مانگ منیان بە دۆسیەکەمەوە ناردەوە بۆ مەراغە. لە مەراغە هێندەی نەمابوو ئازاد بکرێم، بەڵام دەرەبەگەکان لە دامودەزگای دەوڵەتدا دەسەڵاتیان هەبوو، من و دۆسیەکەمیان نارد بۆ لەشکری (۳) ی تەبرێز. لەوێش نەیانهێشت ئازاد بکرێم، هەروەکو تۆپی یاریکردن لە گۆڕەپانی یاریدا بەملاولادا دەیانڕەتاندم، دوای چەند مانگێک لە زیندانی مەراغەوە گەڕاندیانمەوە بۆ تەبرێز.

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان: بەخێربێیتەوە، لە دانیشتنی داهاتوودا باسی دادگاییکردنەکەتمان بۆ بکە.**

## سەفەرخان لە دادگای شادا

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان: سڵاو سەفەرخان، بڕیار وابوو لەم دانیشتنەماندا شتێک لەبارەی دادگاییکردنتەوە ببیستین، لە چی ڕێکەوتێکدا دەستکرا بە دادگاییکردنت؟**

**سەفەرخان:** لە مانگی ئازەری (١٣٢٩/ ١٩٥٠) لە دادگای سەربازیی تەبریز بە سەرۆکایەتی سەرهەنگ ئەمینی و دادوەری لێپێچینەوە سەرهەنگ (دیدەبان) دادگاییم دەستی پێکرد، من لە دادگا ناڕەزاییم دەربڕی لەسەر ئەو هەموو تاوانەی خرابوونە پاڵم لەلایەن ئاغا و دەرەبەگەکانەوە. ئەوان پۆلیس و نوێنەرانی حکومەتیان لە دژی من هان دەدا و دەسەڵاتی تەواویان لەناو حکومەت و دادگاکاندا هەبوو، یەکێک لەوانە (عەبدولحەمید مەلەک قاسمی) بوو، کە لە نووسینگەی تایبەتی شا کاری دەکرد، تەنانەت کارێکیان کردبوو کە من لە گرتنی پارێزەریش بێبەش کرابووم. لەم دادگاییکردنەدا من بە لەسێدارەدان و حەسەنعەلی برا بچووکم بە دە ساڵ حوکم دراین. ئێمە دوای تەواوبوونی دادگاییکردنەکە، چاوەڕوانی حوکمی دادگا بووین. کاتێک لێکۆڵەری گشتی هاتە دەرەوە بینیم بە ناڕەحەتییەوە لێوەکانی خۆی دەکرۆشت، دوای ماوەیەک کە داوایان کردینەوە بۆ ژووری دادگا، سەرهەنگ (ئەمین) گووتی: سەفەر تۆ ئەو ئاغایانەت زۆر ئازارداوە، من تاکو ئێستا زۆر کەسم لە هاوڕێکانی تۆ دادگایی کردووە، خەڵکی ئەوەندەی تۆ لە هیچ کەسێک ناڕازیی نەبوون.

وەڵامم دایەوە:

سەرهەنگی بەڕێز: ناڕازییەکان جووتیارەکانن، یان ئاغاکان.

سەرهەنگ گووتی: ئاغاکان.

منیش گووتم: دیارە کە ئەوان ناڕازیین، چونکە ئەو زەوییانەی بە

ناحەق داگیریان کردبوون، لێیان سـەنرایەوە و بەسـەر جووتیارەکاندا دابەشـکران، ئێستا ئەوان جگە لە من کەسێکی تریان لەبەردەستدا نییە، بۆیە یەخەی من دەگرن.

من ڕەخنەم لە بڕیارەکەی دادگا گرت، ویسـتم دۆسیەی ئەو حەوت کەسـەی کـە لە مەراغـە لەسـێدارەدران کـە یەکێک لەوانـە جەنەڕاڵ (کەبیری) بوو پیاچوونەوەی پێدا بکرێت، ئەگەر ئەوان لەسـەر من هەر شـتێکیان گووتبێت، من قسـەی ئەوانم قبووڵە، بەڵام ئەگەر کەسانی تر لەبارەی منەوە قسەیان کردووە، من قسەی ئەوانم قبووڵ نییە و دەبێت ئێوە لێکۆڵینەوە بکەن.

## حوکمی لەسێدارەدان

لەبەرئەوەی زۆر پێداگرییم دەکرد لەسـەر بینینی دۆسیەی هاوڕێ لەسـێدارەدراوەکانم، کەوتمـە ژێر ڕقی لێپرسـراوانی دادگا، هەر بۆیە دادگاییکردنەکەم ماوەی سـێ ڕۆژی پێ چوو، بۆ نیشـاندانی نەفرەتی خـۆم لـە ڕژێمی شاهەنشـایی بێدەنگ بـووم و یەک قسـەم نەکرد. لە دادگای تێهەڵچوونـەوە تێڕوانینیـان بە پێچەوانـەی دادگایی یەکەمەوە بوو، ئەمجارەیـان کەمێک دابەزینی تێدا بوو، حوکمەکەم لەسـێدارەوە دابەزی بۆ هەتاهەتایی، بەڵام ئەمجارەشیان بڕیارەکە هەر لەسێدارەدان بوو، حوکمەکەش بەم جۆرە بوو:

١-بەهـۆی دەستبەسـەرداگرتنی بنکەکانـی پۆلیسـی حکومەت، بە حوکمی هەتاهەتایی حوکم درا.

٢-بەهۆی هاوکارییکردنی بارزانییەکان بۆ ماوەی دە سـاڵ زیندانی حوکمدرا.

٣-بەهۆی بوونی ناسـنامەی سـاختە، بۆ ماوەی سـێ سـاڵ حوکم دەدرێت.

٤-بەهـۆی هەڵگرتنـی چەک لە دژی وڵات و شـێواندنی ئاسایشـی وڵات حوکم درا بە لەسێدارەدان.

لێپرسـراوی بنکەی پۆلیسی دادگا و سـەرهەنگ (قودلی) سەرۆکی دادگای سـەربازیی لە دەرەبەگەکانـی ناوچەکانی ئێمە بوون و لە هیچ تاوانێک خۆیان نەدەپاراسـت. کاتێک بڕیاری حوکمەکەم خوێندرایەوە، هەڵسـام و هەرچـی بە دەممـدا هات پێم گووتن. سـەروان (ڕیاحیەک) هەبوو کە لە دژی من شـاهیدی دابوو، ئەو سـکرتێری دادگا بوو، هەر ئـەو دۆسـیەکەی بۆ هێنـام تاکو ئیمـزای بکەم، منیش یەک شـەقم لە دۆسـیەکە هەڵدا کاغەز و فایل هەموو بڵاوبوونەوە، ئەو سـکرتێرە بێ چارەیـە زۆر ترسـا. دوای ئەوەی لە زیندان ئازادکرام، ئەو هێشـتا لە ژیاندا مابوو و بووینە هاوڕێی یەکتری. شا کەسێکی ئەویشی بە منداڵی لەسێدارە دابوو، ئەوانیش سیاسی بوون. سکرتێر لەکاتێکدا دەستەکانی دەلەرزین، جگەرەیەکی پێشـکەش کردم، منیش پێم گووت من حوکمی لەسێدارەدانم بۆ دەرچووە، تۆ بۆچی دەلەرزیت، کەمێک ئارام بووەوە. سـەرۆکی دادگا گووتـی: وەرە بڕیـاری دادگا ئیمزا بکـە، هەر کاتێک پێشـەوەری گەڕایەوە با ئێمە لەسـێدارە بدات. من لـە وەڵامدا گووتم: پێویسـت ناکات بێت، خەڵکی ئازەربایجان تۆڵەی من لە ئێوە دەکەنەوە و ئەو پەنجانە دەبڕن کە حوکمی لەسێدارەدانی منیان ئیمزا کردووە.

دوای دەرچوونی حوکمەکەم، منیان برد بۆ زیندانیی تەبرێز، کە ئەو کاتە حەوتسەد زیندانی لەو زیندانەدا هەبوون، ڕەوشی زیندان زۆر خراپ بوو، نە کتێب هەبوو، نە ڕۆژنامە، لەکاتێکدا کە حوکمی لەسێدارەدانمان هەبوو، سەردانیکردنیشـمان نەبوو. لە زیندان،بوومە هاوڕێی ئەسـغەر ئیحسـانی و ئەحمەدی برادەرانی ئاسـنگەر. ئەم دوو کەسەش حوکمی لەسـێدارەدانیان بۆ دەرچووبوو، حوکمەکەیان کەم نەکردنەوە، چونکە لە دۆسیەکەیاندا کوشتن نووسرابوو. جەوادی مەجیری و ئەسەدوڵڵای شـەتابی کە لـە فیداییەکانی تیپی ئازەربایجان بـوون، ئەوانیش لەوێ بوون، ئەوان فشـاریان دەخستە سەرم کە ناڕەزایی دەرببڕم بەرامبەر

بــه حوکمــی دادگا، بــەڵام بێ هۆ بــوو، من بەو هاوڕێیانـــەم گووت کە مردن لەم جۆرە ژیانە خۆشــترە و لە نووســینی ناڕەزایی خۆم بوارد و چاوەڕوانــی لەســێدارەدان بــووم. فیدایییەکــی تریش لــەوێ بوو بە ناوی (کیتابی) و خەڵکی ســەراو بوو، ئەو چەند کەســە چەند نامەیەکی ناڕەزاییان بۆ دادگا نووســی، کە چۆن ســەفەری قارەمانیان یەک پلەی بۆ سوک کراوە، کەچی حوکمەکەی لەسێدارەدانە، بۆچی دۆسیەی ئەو کەسانەتان نەهێناوە بۆ دادگا کە لە دژی ئەو لێدوانیان داوە.

ڕۆژێک ئەو کەسەی کە نامەکانی دەهێنایەوە ناو زیندان، پەلی گرتم و بردمییــە لاوە و گووتــی: من لە دادگا کار دەکــەم، چەند ڕۆژێکی تر تــۆ دەبــەن بۆ مەراغە و لــەوێ لەســێدارەت دەدەن، هەتــا زووە بڕۆ نامەیەکی ناڕەزایی بنووســە، ئەگەر ئەو نامەیە بنووسیت ناتوانن وا بە زوویی لەسێدارەت بدەن. هەمووی سێ ڕۆژم لەبەردەمدا مابوو، ئەگەر ناڕەزاییــم دەرنەبڕیایە، دوای ئەو ســێ ڕۆژە دەهاتن و لەســێدارەیان دەدام. مــن ناڕەزاییــم نووســی، بەڵام لــە دەرەوە وا بڵاوببــووەوە لە ماوەی ئەو ســێ ڕۆژە لەســێدارە دەدرێم. ڕۆیشتبوون بۆ شیشوان و بــە باوکمیان گووتبوو ســەفەر دەبەن بۆ مەراغە و لەوێ لەســێدارەی دەدەن، ئەویــش دەڕوات و لە مەراغە دەگەڕێت دەچێتە هەر شــوێنێک پێــی دەڵێــن ئەو کەســە نەهاتووە بۆ ئێــرە، دواتر هاتــە تەبرێز و منی دۆزییەوە. ســەیرم کرد زۆر ناڕەحەتە، بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕامەوە و لە ناڕەحەتیدا قسەی تری بۆ نەکرا و هەڵسا و ڕۆیشت.

ڕۆژێک ئەفسەری پاسەوانانی زیندان هاتە ناو هۆڵی زیندانەوە، لێی پرسیم: تۆ من دەناسیت؟ گووتم: نەخێر ناتناسم. پێکەنی و گووتی: من ســتوان (شەریف زادە)م لێپرسراوی شــارەوانیی ئازەرشەهرم، کاتێک ئێمەت چەک کرد (یەدوڵڵای فەتحی) ویستی من گوللەباران بکات، بەڵام تۆ گیانی منت ڕزگار کرد، من تا ئێستا نەمزانیبوو تۆ لێرەیت، لە ئەمڕۆ بەدواوە هەر کارێکت هەبوو من ئاگادار بکەرەوە.

هاتنــی شــەریف زادە بووە هۆی ئەوەی کە مــن لەو ژوورەی تێیدا

بـووم، کـە ژوورێکی ناخۆش بـوو، بگوازرێمەوە بـۆ ژوورێکی تر کە کەمێـک لــە ژوورەکەی تر باشــتر بوو. ژوورەکەی پێشــووم ئەوەندە پیـس و بۆگـەن بوو، هیـچ کەسـێک نەیدەتوانی ماوەیەکـی زۆر تێیدا بمێنێتەوە، هەر بەهۆی ئەو پیسییەوە کاتێک زیندانی تازە دەهاتن و لەو ژوورەدا دایـان دەنـان، دوای چەند ڕۆژێـک مانەوەیان لە ژوورەکەدا، ناچـار دەبوون ڕەشــوە بدەن بە کارمەندانی زینــدان، تاکو لەو ژوورە بگوازرێنەوە بۆ ژوورێکی تر. هەر ژوورێک لێپرسراوێکیان بۆ دانابوو، کە لەلایەن کاربەدەســتانی زیندانەوە پشــتیوانی دەکران. ئەو کەســانە بەتانی و ژووری باشـیان بە زیندانییەکان دەفرۆشــت، زیندانییەکانیش زۆربەیــان دز و شـــەقاوە و چەقۆکێش بوون، ئەو دز و چەقۆکێشــانە زیندانییانی تریان هەراســان کردبوو، هەر بۆیە زیندانییان ناچار بوون دەســت بە مانگرتن بکەن. دواتر کارمەندان هاتن و چەقۆکێشــەکانیان جیاکردەوە، ئیتر ڕەوشی ناو زیندان کەمێک باشتر بوو.

دوای چەنـد ڕۆژێـک مانــەوەم لــە زینـدان، هاوڕێیانـم ناچاریـان کـردم کـە نامــەی ناڕەزایـی بنووسـم، هێشــتا مانگێـک تێنەپەڕیبوو بەســەر گۆڕینــی ســەرۆکی زینـدانـدا، بەیانییەکی زوو پۆلیـس ڕژانە ســەر ســەربان و چواردەوری زیندانیان گرت، بە جۆرێک کە لوولەی تفەنگەکانیان ڕووکردبووە زیندانییەکان، چەند پاســەوانێکیش هاتنە ناو زیندانییەکانەوە نزیکەی ســەد زیندانییان جیاکردنەوە و بەڕێیان کردن بـۆ ئەردەبێل و ئورمیــە و خۆی و مەراغە. لە تەبریز کەسـێک هەبوو نــاوی حاجی ئەبولقاســم بوو، کارگەی فەرش چنینــی هەبوو. تەواوی خوێڕییەکانــی تەبریز کە پێیان دەگووترا لۆتو، یا لۆتی: لە دەوروبەری ئەو کۆببوونەوە. ئەوان لەکاتی هێرشـکردنیان بۆ سەر دیموکراتەکان، زۆر کەسیان کوشتبوو، حاجی ئەبولقاسم کەسێکی شاپەرست و دیاری تەبریز بوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەو سەرسەرییانە بە تورکی پێیان دەڵێن لۆتو؟**

**ســـەفەرخان:** بەڵێ، هەمان ئەو لۆتوانە، ئەوان لە دەرەوە شـــەڕیان کردبـــوو، ئەوانیان هێنابـــووە ناو زیندانەکـــەوە، زیندانییەکان دەیانزانی ئەوانە لە دەرەوە کێشەیان بۆ تودەییەکان دروستکردبوو، شەڕیان پێ فرۆشـــتبوون، لـــە تۆڵەی ئەو کارانەیدا دەرژێنە ســـەریان لێیان دەدەن. لـــە دەرەوە هـــەواڵ دەدرێتـــە حاجـــی ئەبولقاســـمی، ئەویـــش بە هێزی چەکـــدارەوە هاتبووە بەردەمی زیندان. من لە ســـەرەتاوە ئاگاداری ئەو لێدانـــە نەبـــووم، ڕۆژی دواتـــر بانگیان کـــردم، منیش ڕۆیشـــتم بۆ لای پاســـەوان، سەیرم کرد چەند کەسێکی تریشیان هێنابوو، لە تۆڵەی ئەو لێدانەی لە چەقۆکێشـــەکانیان دابـــوو، ئێمە دوانزە کەس دوورخراینەوە بۆ ئورومیە. سەرۆکی زیندانی ئورمیەش ئێمەی وەرنەگرت، دەیگووت: من زیندانییانی حوکمی ســـێدارە و هەتاهەتایی وەرناگرم. ئێمەیان نارد بۆ بنکەی پۆلیس، لەوێ دەست و قاچی منیان کەلەپچە کرد و کردمیانە ژوورەوە، لەوێ کەســـێکی پاســـەوان هەبوو ناوی (خەسرەوخان) بوو، ئەو منی دەناســـی هات و تکای بۆ کردم و دەســـت و قاچیان کردمەوە، بەڵام ئەو چەند کەسەمانیان نەخستە ژوورەکانەوە، بەڵکو لە حەوشەکە بووین، چەند کەسێکی تریش کە ئەوانیش سیاسی بوون، ئەوانیش هەر لـــە حەوشـــەکەدا بوون. دوای چەنـــد ڕۆژێک هەر چەند کەســـێکمانیان خســـتە ژوورێکی بچووکەوە و سەربازێکیان بەدیارمانەوە دانا، ئێمەش ناڕەزاییمان دەربڕی و گووتمان: خۆ ئێرە زیندان نییە، ئێمە هەموومان حوکمی هەتاهەتایی و لەســـێدارەدانمان هەیـــە. دواتر ئاغای (عەزیزی)، کە سەرلەشکر بوو، هات و گووتی: ئەگەر ئەمانە دوورخراوەن بیانبەن بۆ شـــوێنی دوورخراوەکان، ئەگەر دوورخراوەش نین بۆچی هێناویانن بـــۆ ئێرە؟ دووبارە لە بنکەی پۆلیســـەوە ئێمەیان گەڕاندەوە بۆ زیندانی ئورومیـــە، بەڵام لە زیندانـــدا ڕایاننەگرتین و لە حەوشـــەکەدا دایاننراین، دوای چەند ڕۆژێک ئێمەشیان کردە لای زیندانییەکان.

مانگ و ڕۆژەکان بە سەختی تێدەپەڕین، ڕۆژێک ئەفسەری ئیشکگر بانگی کردم، هەستم کرد دەمبات بۆ مەیدانی سێدارە، کە گەیشتم (شەریف زادە) نامەیەکی پێدام کە ئیمزای بکەم، من نامەکەم وەرگرت و بردم بۆ ناو زیندان و لای هاوڕێکانم دەستم کرد بە خوێندنەوەی، بۆم دەرکەوت کە دۆسیەکەم نێردراوە بۆ دیوانی بەرزی وڵات، بەڵام هێشتا مەترسی لەسێدارەدانم لەسەر مابوو، ئەگەری ئەوە هەبوو کە دیوانی بەرزی وڵات بڕیاری لەسێدارەدانم بدات. دۆسیەکەم ماوەی سێ ساڵ مایەوە و نەگەڕایەوە، بەڵێ، من ماوەی سێ ساڵ لە چاوەڕوانی لەسێدارەداندا بووم.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: دامەزراندنی حکومەتی میللی دکتۆر محەمەد موسەدیق کاریگەریی لەسەر دۆسیەکەی ئێوە نەبوو؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، پێویستە ئەوەش بڵێم دکتۆر موسەدیق لە دوانزەی ئوردیبەهەشتی (١٣٣٠/ ١٩٥١) کابینەی خۆی ڕاگەیاند، یاسای خۆماڵیکردنی نەوتی پەسەندکرد، لە ڕۆژی (٢٥)ی تیری (١٣٣١) بەهۆی دژایەتییەکانی محەمەد ڕەزا شا و خۆبواردن لە پێدانی دەسەڵات و پۆستی وەزارەتی جەنگ بە دکتۆر موسەدیق، دکتۆر موسەدیق دەستی لەکار کێشایەوە و ئەحمەد قەوامی حکومەتی دامەزراند، بەڵام بە خۆپیشاندان و ڕاپەڕینی سەرتاسەریی و ڕووبەڕووبوونەوەی پۆلیس محەمەد ڕەزا شا ناچاربوو مل بۆ دکتۆر موسەدیق کەچ بکات.

دیارە ئامانجی حکومەتی شا و کارمەندەکانی، ئازار و ئەشکەنجەی زیندانییانی سیاسی بوو، هەربۆیە ژمارەیەک شەلاتی و شەقاوە و چەقۆکێشی تەبریز کە ڕێبەرەکەیان هەمان حاجی ئەبولقاسمی بازرگانی فەرش بوو، هێنایە ناو زیندان و مەبەستیان لەو کارە ئازار و ئەشکەنجەی زیندانییانی سیاسی بوو. ئێمەش زۆر ئازایانە ڕووبەڕووی ئەو ملهوڕانە وەستاینەوە، خۆ دیارە لەناو زیندانیشدا هەروەکو ناو کۆمەڵگا یاسا هەیە، خۆ ئەگەر یاسا لەبەرچاو نەگیرێت،

ناتوانین بەشـێوەیەکی شـەرەفمەندانە لە زینداندا بژین. لە زیندانەکانی شـادا ڕەزامەندیی دەستدرێژیکردنە سەر لاوەکانی لایەنە سیاسییەکان وەرگیرابوو، هەرچۆنێک بێت ئێمە ڕووبەڕووی ئەو بۆچوونە بۆگەنەی شاپەرستەکان بووینەوە، ئەو ڕەوشـە پیسـەی ڕژێمی شـا تا دوایین ڕۆژەکانی دەسـەڵاتی شا بە ناشرینترین شـێوە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکرا، بەتایبەت لەو قاوشـانەی کە ژمارەی زیندانییانی سیاسـی کەم بـوون. ڕژێـم بە سـوودوەرگرتن لە سەرسـەریی و چەقۆکێشـەکان؛ زیندانییانی سیاسییان ئازار دەدا. ئەگەر چایخانەیەک، یان فرۆشگایەک لەنـاو زیندانەکەدا هەبووایە، ئەوا بە پێدانی بڕە پارەیەک بە سـەرۆکی زینـدان، فرۆشـگاکە دەخرایە ژێر دەسـەڵاتی زیندانییانی چەقۆکێش و سەرسـەرییەکان، ئەوانیش بـە ئارەزووی خۆیان تلیـاک و هێرۆین و ماددە هۆشبەرەکانیان تیا دەفرۆشت. بە زۆری زۆرداریی منداڵی جوان و لاویان دەبرد بۆ ژوورەکانی خۆیان و دەستدرێژییان دەکردنە سەر، بەتایبـەت لـە سـاڵەکانی (١٣٢٩-١٣٣١) کە زیندانـەکان پڕکرابوون لە منداڵانـی تودەیی، کە بە تاوانی نووسـین و بڵاوکردنەوەی دروشـمی حیزبی دەسـتگیر کرابوون. هەر کاتێک کەسـێکی منداڵکاری سیاسـی دەگەیشـتنە ناو زیندان، پۆلیس هەوڵی دەدا دارکاریی بکات و سـەری بتاشـێت و لەبەر چاوی زیندانییان سـوک و ڕیسوای بکات. وایان لەو زیندانییانە دەکرد کە تەسلیم بن و سەرشۆڕیان بکەن و دەستبەرداری خەبات و تێکۆشـان بن. لەو ساڵانەدا ئەندامانی حیزبی تودە ژمارەیان زۆر بوون لە زیندانییەکاندا، ئەوان زیاتر پێکهاتبوون لە کوڕە جووتیار و زەحمەتکێشەکان.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لەو کاتەدا دۆسیەکەی ئێوە بە کوێ گەیشت؟**

**سـەفەرخان:** دەرەبەگەکان بـەردەوام بەدوای دۆسـیەکەی منەوە بـوون، کاتێـک ئـەوان زانییـان حوکمی لەسـێدارەدانم بـۆ دەرچووە،

ئاسودە و خۆشحاڵ بوون. دەڕۆیشتن کەسوکارەکەمیان تووشی ئازار و دەردەسەریی دەکرد، دەچوون سەردانی باوکە پیر و بێچارەکەمیان دەکرد و دەیانگووت: ئەوا کوڕەکەت حوکمی لەسێدارەدانی بۆ دەرچووە و چەند ڕۆژێکی تر لەسێدارە دەدرێت. باوکی پیر و بێچارەم هەڵدەستێت و دێتە مەراغە بە هەزار زەحمەت و دڵەڕاوکێ خۆی دەگەیەنێتە زیندان، دوای چەندین کاتژمێر گەڕان و پرسیارکردن و جوێن پێدان و سوکایەتی پێکردن، خۆی دەگەیەنێتە دادگا. لەوێ بۆی دەردەکەوێت کە هەواڵەکە ڕاست نییە و درۆ و پڕوپاگەندەی (مەلەک قاسمییەکانە). کاتێک چاوم بە باوکم کەوت، ئەوەندەی چەندین ساڵ پیر و پەککەوتە ببوو. کاتێک چاوی بە من کەوت زۆر خۆشحاڵ بوو، باسی ئازار و کوێرەوەرییەکانی بۆ کردم لەگەڵ ئاغاکاندا. دوای چەند ساڵێک دابڕان لە یەکتری بە دڵێکی شادەوە بەرەو ماڵەوە گەڕایەوە. من بەردەوام چاوەڕوانی لەسێدارەدان بووم، هەر کاتێک شەو و ڕۆژ کە ناوم دەخوێنرایەوە، وام هەست دەکرد ناوخوێندنەوەکەم بۆ لەسێدارەدانە. ئەو هاوڕێ دڵسۆزانەم کە لە مەرگ ڕزگاریان ببوو، منیان فەرامۆش نەکردبوو، بەردەوام بەدوای دۆسیەکەمەوە بوون.

ڕۆژێک یەکێک لە هاوڕێکانم هات بۆ سەردانیکردنی ئەسغەر ئیحسانی و هەواڵی پێدا کە حوکمی لەسێدارەدانی من هەڵوەشاوەتەوە. ئەسغەریش هەواڵەکەی بە من گەیاند، بەڵام من باوەڕم نەکرد، دوای دوو ڕۆژ بەیانییەکی زوو لەکاتی سەرژمێریکردنی زیندانییەکاندا، زەنگیان لێدا تاکو زیندانییان بڕۆنە ژوورەکانی خۆیانەوە. چاودێری هۆڵەکەمان عەباس ئاغای نامی لە حەوشەی زینداندا ناوی منی خوێندەوە، دۆخەکە وای نیشان دەدا کە کەسێک بەرەو سێدارە بەڕێ دەکرێت، ئیتر بە بەهانەی سەرژمێریکردن هەموانیان کردە ژوورەکانیان و ناوی منیان خوێندەوە، دیارە کاتی لەسێدارەدانی منە، لە یەک کاتدا هاوسەر و تاقە کچەکەم و هەموو کەس و خزمەکانم و هاوڕێ خەباتگێڕەکانم لە سەنگەری بەرگرییدا بینی و هاتنەوە پێش چاوم.

من تاکو گەیشتمە ژووری ئەفسەری پاسەوانان؛ چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد کە وەک هەموو لەسێدارەدراوانی پێشتر، پاسەوانان بڕژێنە سەرم و دەست و قاچم ببەستن، بەڵام بەو جۆرە نەبوو، لە ژووری ئەفسەری پاسەوانان ئستیوار (ئیسماعیل خان) لێم هاتە پێش و گووتی: سەفەر مژدەم بدەرێ حوکمی لەسێدارەدانی تۆ هەڵوەشاوەتەوە. من ئەوەندە بێتاقەت و بێزار بووم، ئاگام لە قسەکانی ئەو نەبوو، بەهەرحاڵ ئەو ڕاستی دەگووت، دوای سێ ساڵ حوکمی لەسێدارەدانم هەڵوەشایەوە.

بەهۆی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی، لە پێکهاتەی ئەندامانی دادگای سەربازیی تاڕادەیەک گۆڕانکاریی کرابوو، ئەفسەرانی گەلی توانییان بە بەرگریکردن لە تودەییەکان ناو و ناوبانگی خۆیان بە بەرزیی بهێڵنەوە.

بەهەمان شێوە کە پێشتر باسم کرد، ماوەیەک دوای ئەوەی کە ناڕەزاییم لە حوکمی دادگا دەربڕی و دوای ئەوەی یەکێک لە دادوەری سەربازیی ئورومیە کە پلەی سەرگوردیان پێ دابوو، ئەویش خوێندنی مافی تەواوکردبوو، هات بۆ زیندان و سەردانی کردم، ئەو خۆی پێ ناساندم و گووتی: من دادوەری سوپام و دۆسیەکەی تۆم بە تەواویی خوێندووەتەوە، من دەزانم تۆ کەسێکی پیاوکوژ نیت و کەسێکی تێکۆشەر و ئازادیخوازیت، من بەڵگەی تەواوم بۆ سەلماندنی بێتاوانی تۆ لایە، ئەگەر تۆ من بکەیت بە بریکاری خۆت، من دەتوانم حوکمی لەسێدارەدانت هەڵوەشێنمەوە. منیش سوودم لەو هەلە وەرگرت و ئەوم کرد بە بریکاری خۆم، ئەو ئەفسەرە نیشتمانپەروەرە، بۆ بەدواداچوونی دۆسیەکەم؛ مۆڵەتی لە دادگا وەرگرت و سەردانی مەراغە و تەبریز و ئەردەبێل و سەراب و زۆر شوێنی تری کردبوو، لەو شوێنانە دۆسیەی ئەو کەسانەی کۆکردبووەوە کە لەسێدارە درابوون و لەسەر من وتەیان لێ وەرگیرابوو، دۆسیەی زیاتر لە سەدو پەنجا کەس لەسێدارەدراوی هەڵدابووەوە، کە هەموویان بە تاوانی کوشتنی سەرهەنگ موعین ئازاد لەسێدارە درابوون، لە هیچ دۆسیەیەکدا ناوی من بە تاوانبار نەهاتبوو، دواتر دۆسیەکەم دەنێردرێت بۆ لای محەمەد ڕەزا شا، ئەویش لە

گۆشـــەیەکی دۆســـیەکەمدا نووســـیبووی تا کۆتایی ژیانی لـــە زینداندا بمێنێتەوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: دوای کودەتای ئەمریکا و ئینگلیز و شا، لە (٢٨)ی موردادی (١٣٣٢) ڕەوشی زیندان چۆن بوو؟**

**ســـەفەرخان:** کودەتـــای (٢٨)ی مـــورداد هەروەکـــو کابووســـێکی ڕەش باڵی کێشـــابوو بەسەر سەرتاســـەری ئێراندا، ڕژێم بە هاوکاریی ئەمریکای جیهانخۆر توانی هەموو هێزە بەرگریکارەکان تێکبشـــکێنێت. هەرچەندە کاســـەلێس و چەڵکاوخۆرەکان شاهەنشایان گەورە دەکرد و بە ئاریامێر و ســـێبەری خودا ناویان دەهێنا و گەورەیان دەکرد، بەڵام ڕووخســـاری ئەو لەناو خەڵکیدا ناسرابوو. شەعبان بێمۆخی چەقۆکێش و سەرســـەریی گووتبووی: ئەگەر پۆلیس و ســـوپا بەیەکەوە کاربکەن و ببنە یەک دەست، ئەوا ئێمەی سەرسەرییەکان لە هەردووکیان زیاتر کارمان کردووە.

پێویســـتە ئەوەش بڵێم لە کۆتایی ســـاڵی (١٣٣١) دۆســـیەکەمیان لە دیوانـــی بەرزی وڵاتەوە ناردبوو بۆ ئورومیە. لەو کاتەدا هەلومەرجەکە گۆڕابـــوو، مـــن توانیم بریکار بگۆڕم. هێشـــتا یەک هەفتـــە تێنەپەڕیبوو، نووســـراوێک لـــە دادگای لەشـــکری چـــواری ئورومیـــەوە هاتبـــوو کە دۆســـیەکەم نێـــردراوە بۆ تەبرێز. لـــە تەبرێز (عەلـــی ئەبولفەتح) ببووە بریـــکاری من، ئەو هەوڵی دابوو بە ســـوودوەرگرتن لـــەو هەلومەرجە تازەیەی کە هاتبووە پێش و بە هەڵسانی یەک ملیۆن کەس لە دژی شا، ئەو هەوڵی دابوو ئەو تاوانانەی کە خرابوونە پاڵ من، نەیانهێڵێت.

لـــە ســـەردەمی دکتـــۆر موســـەدیقدا ئـــەو کەســـانەی کە لە بەشـــی ســـەربازییدا نەبوون، لـــە دادگای ســـەربازییدا دادگایـــی نەدەکران، بە هەڵاتنی شـــا و تێکشکانێکی ڕێژەیی دیکتاتۆری، خەڵکی پشتیوانییان لە دکتۆر موسەدیق کرد، بەڵام ئەمریکا بە خەرجکردنی بڕی (١٧٠) ملیۆن دۆلار بۆ کودەتا، بنەماڵەی پەهلەوی تا دوایین ڕۆژی دەسەڵاتیان کردە

بەند و ئەڵقە لەگوێی خۆیان. (سەبهەبید زاهیدی) سەرۆکی حکومەتی کودەتاچی لەسەر دابەشکردنی ئەو پارەیە لەگەڵ محەمەد ڕەزا شا کێشە کەوتە نێوانیانەوە و گووتی: قوربان لەو پارەیە بڕی (١٦٠) ملیۆن دۆلار بۆ گەڕانەوەی تەخت و تاجی بەڕێزتان خەرجکراوە. بەهەرحاڵ لە سەرکوتکردنی خەڵکی ڕاپەڕیو، هەمان ئەو سەرسەریی و چەقۆکێشانەی کە دیموکراتەکانی ئازەربایجانیان ڕەشەکوژیی کرد، ڕۆڵیان هەبوو.

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان: بەدڵنیاییەوە دوای کودەتا دۆسیەکەی ئێوە ڕێڕەوێکی خراپتری وەرگرت؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، دووبارە دۆسیەکەم لە دادگای تاوانەکانەوە گەڕایەوە بۆ دادگای سەربازیی، دوای ماوەیەک سەروان (جەوانی) کە بریکاری من بوو، بە تاوانی پەیوەندیی بە حیزبی تودەوە دەستگیرکرا، دادگای لەشکر بە بەهانەی ئەوەی کە بریکارەکەم مۆڵەتی وەرگرتووە، داوایان لێکردم کە بریکارێکی تر بگرم. لە مانگی خوردادی (١٣٣٣) بۆ گرتنی بریکارێکی نوێ داواکرام بڕۆم بۆ دادگا. من لە هەموو لایەکەوە بارم لار بوو، جگە لەوەش (سەبهەبید ورهرام)، کە فەرماندەی لەشکری چواری ئورومیە بوو، دەستی سور بوو بە خوێنی لاوانی ئازادیخوازی ئازەربایجان، ئەو بە ئاشکرا گووتبووی دەبێت سەفەرخان لەسێدارە بدرێت. بریکارەکەم ئەوەی پێ گووتم. سەرهەنگ ئەفشار دادوەری دادگا بوو، ئەو یەکێک بوو لە ئاغا گەورەکانی ئازەربایجان، بەڵام بەدواداچوون و هەوڵی دۆستان و ڕۆشنبیران بۆ دۆسیەکەی من، هەموو هەوڵی ناحەزانی کردە بڵقی سەر ئاو. دوای شەش ساڵ لە حوکمی لەسێدارەدانم، دووبارە من و براکەم دادگاییکراینەوە، من بە حوکمی هەتاهەتایی و براکەشم کە تا ئەو کاتە پێنج ساڵ بوو لە زیندان بوو، بە دوو ساڵ حوکم درا.

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان: هیچ بابەتێک لە دۆسیەکەتدا هەبوو بۆ ئازاد بوونت؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، ئەو کاتەی بۆ گەمارۆدان و دەستبەسەرداگرتنی تەبریز ڕۆیشتین، پارەمان پێ نەبوو، جەنەڕاڵ (کەبیری) پەیامێکی بۆ ناردین کە بڕی پێنجسەد تومەن لە دەرەبەگەکانی عەجەبشێر وەربگرین. من پارەکەم وەرگرت و دوایی لە بەشی دارایی تەسلیمم کرد، بەڵام کاتێک من دەستگیرکرام یەکێک لە ئاغاکان شکاتی لێکردبووم، کە گوایە من پارەم وەرگرتووە، دواتر کە سەیری دۆسیەکانی داراییان کردبوو، بۆیان دەرکەوت کە من تاوانبار نیم و پارەکەم تەسلیم کردووە، تاوانی ئەو پارە وەرگرتنە حوکمەکەی سێ ساڵ زیندانیی بوو، بەڵام من لەوە بێتاوان دەرچووم.

من لە زیندانی ئورومیە بووم کە (مەنوچەهری ئیقبال) هاتبوو بۆ ئورومیە، دەسەڵاتی دابوو بە فەرمانداری ئورومیە کە لە ماوەی (٢٤) کاتژمێردا دەتوانن هەر زیندانییەک دووربخەنەوە بۆ هەر شوێنێک کە خۆتان پێتان باش بێت. منیش چوومە بەردەمی و گووتم: ئێمە هەمیشە لەم زیندانەدا ڕێگرییمان لە ڕەشوە خواردنی پۆلیس و سەرۆکی زیندان کردووە، خۆت دەزانیت لەم زیندانەدا هەمیشە ناڕەزایی هەیە، بۆچی سەردانیکردنی زیندانییانتان قەدەغە کردووە؟ بۆچی لە خەڵکی دەدەن؟ بۆچی پارە لە زیندانییان وەردەگرن؟ بۆچی خواردنی زیندانییان خراپە؟ لەو کاتەدا نزیکەی بیستوپێنج کەس کە خەڵکی تەبریز بوون، هەموویان زیندانی هەتاهەتایی بوون و بەیەکەوە بووین. ڕۆژێک پۆلیس هات و گووتی: هەرکەسێک هەر شوێنێکی پێ باشە دەیگوازینەوە بۆ ئەو شوێنە. منیش گووتم: حەزدەکەم بگوازرێمەوە بۆ تەبریز، هەرکەسە و شوێنێکی گووت. هاوڕێیەکم هەبوو هات بۆ لام و گووتی: کاکە ئەوان درۆ دەکەن دەیانەوێت ئێوە دووربخەنەوە بۆ (بەرازجان) کارێک بکە بەڵکو نەتنێرن، ئەوێ دۆزەخە. من ڕۆیشتم و سەرۆکی نووسینگەم بینی،

گووتم: من نامەوێت بڕۆم بۆ تەبرێز، ئێرە زۆر باشــە. گووتی: تازە تــەواو بوو، هەمــووی دوو ڕۆژی پێ نەچوو، ئێمەیــان بەڕێکرد بۆ قەڵای بەرازجان.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەوە ساڵی چەند بوو؟**
**سەفەرخان:** ساڵی (١٣٣٥/ ١٩٥٦) بوو.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشــیان: پێش ئەوەی لەســەر بەرازجان قسەبکەین، با بگەڕێینەوە بۆ زیندانی ئورومیە. کۆشکی زیندانەکە چۆن بوو؟**
**ســەفەرخان:** زیندانێکی کۆن بوو، ژوورەکانی بۆ دوو کەس و سێ کەس بوون، ژووری گەورە و گشتیش هەبوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: دەرگاکانی تەختە بوون، یان ئاسن؟**
**سەفەرخان:** دەرگاکانی تەختەی دارگوێز بوون، قورس و ئەستوور بوون.

**عەلی ئەشرەف دەروێشــیان: دیارە هەروەکو زیندانی کرماشان وابووە کە ئەڵمانییەکان لەسەر بڕیاری ڕەزا شا دروستیان کردبوو.**
**سەفەرخان:** لەسەر ڕووی دەرگاکە کونی بچووک هەبوو، شمشێری داخستنەکەشــی ئاسن بوون، ناو ژوورەکان تەڕ بوون و شێی هەبوو، زیندانەکــە زۆر کــۆن بــوو، دواتر تێکیــان دا و زیندانێکــی تازەیان لێ دروستکردەوە و دیوارەکانیشی زۆر بڵند بوون.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: حەوشەکەی گەورە بوو؟**
**ســەفەرخان:** حەوشــەکەی زۆر گــەورە بــوو، زیندانییــەکان لــە گۆشەیەکدا تووتنیان دەچاند، زیندانییەکان زەوی حەوشەکەیان لەنێوان

خۆیاندا دابەشــکردبوو، هەرکەســە و بەشی خۆی تووتنی تێدا دەچاند، تەنانەت لەو تووتنەیان دەفرۆشت.

**عەلــی ئەشــرەف دەروێشــیان: دوای کودەتــا و ڕووخانــی حکومەتەکەی دکتۆر موسەدیق، ڕەوشی زیندان چۆن بوو؟**

**ســەفەرخان:** دوای ڕووخانــی حکومەتەکــەی دکتۆر موســەدیق، ڕەوشــی زینــدان زۆر خراپ بــوو، جگە لە لێدان و ئەشــکەنجە، جوێن و قســەی ناشــرین، خواردنیشــمان خراپ و کەم بوو. ئەو خواردنەی کە پێشــتر دەیاندا، بڕدرا. لەســەر نەبوونی خــواردن زیندانییان مانیان گرت، (ورهەرام) کە دەسەڵاتداری ئازەربایجان بوو، گووتبوی خواردن بــەم زیندانییانە مەدەن، با لە برســاندا بمرن و تەرمەکانیشــیان لەژێر درەختەکانی حەوشــەکەدا بخەنە ژێر گڵ، بــەڵام خۆڕاگریی زیندانییان و هاوکاریــی خزم و کەســەکانیان و خەڵکانــی ئازادیخواز بوونە هۆی ئەوەی زیندانییان ســەرکەوتوو بن. ڕۆژێک لەگەڵ (هەمزەی واشەچی) قسەم دەکرد، ئەو لێپرسراوی لاوانی حیزبی توده بوو، پرسیاری لێکردم گووتی: ســەفەرخان زیندانیی هەتاهەتایی بەم جۆرە چۆن دەگوزەرێت. منیش گووتم: دەبێت بە ئومێدەوە بژین، ڕۆژێک دێت خەڵکی ئازادیخواز ڕاپــەڕن و ئێمەش ڕزگارمان دەبێت. ئەویش گووتی: کام خەڵک، بۆچی خەڵکی ئازا و دلێر ماوە؟ تەواو دوای (٢٥) ساڵ لەم گفتوگۆیە و دوای ســیودوو ســاڵ زیندانیی، خەڵکی ڕاپەڕین و منیش ئازادکرام. جارێکی تــر لە ئورومیە چاوم بە هەمزە کەوتەوە و گووتم: بینیت چۆن خەڵکی ڕاپەڕیــن و ئێمەش ئازادکراین، کاتێک خەڵکــی بییەوێت ڕاپەڕێت، هیچ هێزێکــی ئەهریمەنی ناتوانێت لە بەرامبەر خۆڕاگرییاندا بوەســتێتەوە و هەموو زیندانییان ئازاد دەکەن.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشــیان: لەبارەی تاوانەکانی تەیموری بەختیاری زۆر شــتم بیستووە و زۆرشــتم خوێندووەتەوە، ئەگەر لەبارەی ئەوەوە شتێک دەزانیت بۆم باس بکە.**

**سەفەرخان:** یەکێک لە هەرە تاوانبار و کەسە ترسناکەکانی محەمەد ڕەزا شا، هەمان تەیموری بەختیاری بوو، ئەو بە کوشتنی خەڵکانی بێ تاوانی حکومەتی دیموکراتی ئازەربایجان گەیشــتبووە پلەیەکی بەرزی خیانەتکاریــی. لە کودەتای (٢٨)ی مــوردادی (١٣٣٢)ی ئەمریکاییەکاندا ئەو کاندیدی کودەتا بوو، بەڵام ڕازیبوونی محەمەد ڕەزا شا بە هەموو بڕیارەکانی ئەمریکا، بووە هۆی ئەوەی کە ئەو دووبارە بگەڕێتەوە ئێران و جڵەو بگرێتە دەســت. تەیمــور بەختیار لەدوای کودەتــا، فەرماندەی ســەربازیی تاران بــوو. بە گێڕانەوەی (فرۆدۆســت) تەیمــور بەختیار گووتبــووی هەرکەســێک ئەمریکا و ئینگلیز و محەمــەد ڕەزای نەوێت، دەبێت ســەری لە لاشەی جیابکرێتەوە. هەر ئەو تودەییەکانی لەناوبرد، زۆرێک لە ئیسلامییەکانی بردە سەر پەتی سێدارە، سەربازگەی دووی گۆڕی بە شــوێنی تایبەتی ئەشــکەنجەدان، دەســتدرێژیی دەکردە سەر کچان و ژنانی زیندانیی. بەو باوەڕەی کە محەمەد ڕەزا پێی هەبوو؛ بە زوویی کرا بە سەرلەشکر و بە ڕێنمایی ئەمریکییەکان بۆ دژایەتیکردنی کۆمۆنیستەکان و لە ساڵی (١٣٣٥/ ١٩٥٦)دا دەزگای ساواکی دامەزراند.

ســاڵی (١٣٣٤/ ١٩٥٥) لــە زیندانی تەبریز بــووم، ڕۆژێک ناوی من و چــوار کەســی تر خوێندرایــەوە، کە ئەوانیش حوکمــی هەتاهەتاییان هەبوو، دوای کەلەپچەکردنمان بردیانین بۆ ژووری سەرهەنگ (مهران)، کە ســەرۆکی بەشــی دووی ســوپا بوو. ئەویش دوای هەندێک جوێن و ســوکایەتی پێکردن، ئێمەی نــارد بۆ زیندانی تایبەت بــە تاوانبارانی سەربازیی. لەوێ هەر دوو کەس و کردیانینە ژوورێکەوە. ئێمە ماوەی یــەک مانگ لەو ژوورانەدا ماینەوە، ویســتمان مــان بگرین و خواردن نەخۆیــن، بــەڵام هەوڵەکەمــان بێهودە بوو. لــەو ماوەیــەدا (ورهەرام) بەهۆی تاوانە خراپ و زۆرەکانییەوە لە پۆســتەکەی لادرا و لە جێگای

ئەو ســەرتیپ (موزەفەر) کرایە فەرماندەی ســوپا. دوای چەند ڕۆژێک مانگرتن لە خواردن، سەرتیپ موزەفەر هۆکاری مانگرتنەکەی لێپرسین. منیش پێم گووت ئێمە حوکمی هەتاهەتایین و ســەرباز نەبووین، بۆچی ئێمەتــان هێناوەتە زیندانی لەشــکر؟ دواتر ســەرتیپ موزەفەر قســەی لەگەڵ دادگادا کردبوو، بۆی دەرکەوتبوو کە ئێمە لە زیندان ڕێگرییمان کــردووە لــە دزییەکانی ئــەوان، ئیتر ئەوەبــوو بە فەرمانی ســەرتیپ موزەفەر ئێمەیان گەڕاندەوە بۆ هەمان شوێنی خۆمان.

## ده ساڵی دووەمی زیندان (١٣٣٧- ١٣٤٧/ ١٩٥٨- ١٩٦٨)

به هاتنی ساڵی (١٣٣٧/ ١٩٥٨) ده ساڵی زیندانییم تەواو کرد، که تەواوی ساڵەکانی (١٣٢٧) تاکو ساڵی (١٣٣٧) بوو، لە ماوەی ئەو ده ساڵەدا شەش ساڵی تەواو له چاوەڕوانی حوکمی لەسێدارەداندا بووم و چاوەڕوانی ئەهریمەنی مەرگم دەکرد. ماوەی ئەو ده ساڵەی زیندانییم له زیندانەکانی ئازەربایجاندا بەسەربرد و له بارێکی زۆر دژواردا بووم، ئەو ماوەیە له زینداندا هیچ هاوڕێیەکم نەبوو، چونکه من ئەندامی حیزبی توده نەبووم، زیندانییانی سیاسی ئەوکات منیان به زیندانی سیاسی ئەژمار نەدەکرد و کتێب و ڕۆژنامەیان پێ نەدەدام، هەربۆیە منیش لەگەڵ زیندانییانی ئاسایی دەژیام و زیاتر لەگەڵ ئەواندا هەڵسوکەوتم دەکرد. هەر ئەو دابڕانە وای لێکردم ببمە کەسێکی بەهێز و خۆڕاگر و ڕووبەڕووی جەللادەکانی شا بوەستمەوە و ملکەچی داواکانیان نەبم، من له ماوەی ئەو ده ساڵەدا هەروەکو تۆپی یاریی لەم زیندانەوە بۆ ئەو زیندان و لەم دادگاوە بۆ ئەو دادگا دەڕەتێنرام.

## دوورخستنەوە بۆ بەرازجان

**عەلی ئەشـــرەف دەرویێشـــیان: بۆچی تۆیان دوورخســـتەوە بۆ بەرازجان؟**

**ســـەفەرخان:** لـە (١٥ی فەروەردینـی ١٣٣٦/ ٦ی نیســانی ١٩٥٧) (مەنوچەهری ئیقبال) دەســتی لەکار کێشـایەوە و (حوسێن عەلاء) بوو بە سەرۆک وەزیران و کابینەی خۆی ڕاگەیاند، لە مانگی ئابانی (١٣٣٧) لیژنەیەک بە ســەرۆکایەتی (مەنوچەهری ئیقبال) گەیشتە ئازەربایجان. لـە ئورومیـە ســەرۆکی شـارەوانی و فەرمانــدار و دادوەری ســوپا هەموویان لە دزی و وەرگرتنی ڕەشـوە تێوەگلابوون، کاربەدەسـتانی زیندان دەیانویسـت بۆ ڕزگاربوونیان لە دەسـتی زیندانییانی سیاسی، کـە بـەردەوام مانیـان دەگـرت و لەسـەر دزییەکانی ئـەوان دەنگیان بەرزدەکـردەوە، بەهانەیـەک بدۆزنـەوە. ئەوەبوو وایـان بڵاوکردەوە کە زیندانەکانی ئازەربایجان شـوێنێکی شـیاو نییە بـۆ ئاگاداریکردنی زیندانییانی سیاسی و لەوانەیە زیندانییەکان بە هاوکاریی خەڵکی دەرەوە زیندان بشـکێنن و ڕابکەن. هەر بۆیە ئیقبال فەرمانی دوورخسـتنەوەی ئێمەی دا بۆ بەرازجان، بەڵام ســەرۆکی زیندان فێڵێکی تری بەکارهێنا، ئەویـش ئەوەبـوو گووتی: پێویسـتە ئـەم زیندانە نـۆژەن بکرێتەوە و زیندانییەکانیش کوێیان پێ خۆشبێت، دەیاننێرین بۆ ئەو شوێنە. ڕۆژی دواتـر من و هاوڕێکانم بە ئامادەبوونی چەند پۆلیسـێک بەرەو تەبرێز بەڕێ کراین، بەڵام پۆلیسەکان لە تەبرێز بە ئێمەیان گووت: دەبێت ئێوە بڕۆن بۆ زیندانی تاران، تا ئەو کاتە هیچ کەسێکمان نەماندەزانی بەڕێ دەکرێیـن بۆ زیندانی بەرازجـان. من و هاوڕێکانم ماوەی پانزە ڕۆژ لە زیندانی تاراندا ماینەوە، دواتر بەڕێکراین بۆ زیندانی بەرازجان.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: بە سواری پاس ئێوەیان برد؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ بە پاس، یەکڕاست نەیانبردین بۆ ئەوێ، بەڵکو لە چەندین جێگا لامان دا.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لە ڕێگادا کە خەڵکی ئێوەیان دەبینی هیچیان نەدەگووت؟**

**سەفەرخان:** هیچ قسەیان نەدەکرد، خەڵکی خەریکی کار و ژیانی خۆیان بوون، یەک جار کەلەپچەیان لەدەستمان کردبووەوە، سەرهەنگێکی پۆلیس لەم کارە تووڕە بوو. بە پۆلیسەکانی گووت: بۆچی کەلەپچەتان لە دەستیان کردووەتەوە. دیارە ئێمە بۆئەوەی کەلەپچە نەکرێین، پێشتر پارەمان دابوو بە پۆلیسەکان، دووبارە کەلەپچەیان کردەوە دەستمان. گەیشتینە ئەسفەهان و لەوێ شەو لە ئوتێل خەوتین. بەهەرحاڵ ڕەفتاری ڕژێم لەگەڵ ئێمەدا زۆر خراپ بوو، ئەوان چۆنیان پێ خۆشبووایە ئاوا لە دژمان دەجووڵانەوە. لێرەدا نە حیزبێک هەبوو، نە ئازادیی سیاسی هەبوو تاکو ڕاستییەکان بە خەڵکی بگووترێت. بۆ نموونە دوورخستنەوەی ئێمەی فیداییانی دیموکرات بۆ بەرازجان، ئیقبال بە بڕیاری ملهوڕیی خۆی ئەنجامی دابوو. کاتێک گەیشتینە ئەسفەهان لە یەکێک لە ڕۆژنامەکان خوێندمەوە نووسرابوو ژمارەیەک لە چەتە و ڕێگرەکانی ئازەربایجان دوورخرانەوە بۆ زیندانی بەرازجان.

## زیندانی بەرازجان

**عەلی ئەشـــرەف دەروێشـــیان: ئەگەر بکرێت بە کورتی باسێکی شوێن و پێگەی زیندانی بەرازجانمان بۆ بکەیت.**

**سەفەرخان:** شوێنی زیندانـــی بەرازجان لەنێوان شارەکانی بوشەهر و شـــیراز بوو، پێش حکومەتی پەهلەوی ئەو شوێنە شوێنی پشوودانی کاتیی کاروانچییەکانی نێوان شـــیراز و بوشـــەهر بوو. قەڵایەکی گەورە و فـــراوان لـــەو بیابانـــە چۆڵ و بـــێ ئاوەدانییە بنیادنرابـــوو، ئەم قەڵای بەرازجانـــە کاروانســـەرایەک بـــوو لە کەنـــاری شـــاری بەرازجان و لە کەنار جادەی کازەرون - بوشـــەهر بنیادنرابوو، ئەو قەڵایە دەرگایەکی گـــەورەی هەبـــوو، بۆ چوونە ناو قەڵاکە دەبووایە بـــە ڕاڕەوێکی بڵند و تاریکدا تێبپەڕیت، ڕاڕەوەکە ئەوەندە تەســـک بوو، تەنها یەک حوشتری پێوە دەچوو، بەجۆرێک ئەگەر هەمان حوشـــتر بیویســـتایە بگەڕێتەوە، ئـــەوا نەیدەتوانـــی بگەڕێتـــەوە. لـــەو ڕاڕەوە بڵند و تەســـک و تاریکەوە دەگەیشتیتە گۆڕەپانێکی گەورە و فراوان، کە لە کۆندا شوێنی حەوانەوەی حوشتری کاروانچییەکان بوو. ئەم قەڵا گەورەیە بە دیواری ئەستوور و بەردی گەورە بنیادنرابوو، لە هەندێک شـــوێن ئەستووریی دیوارەکەی (٢ تا ٤) مەتر دەبوو. دوای ماوەیەک ناوەوەی ئەم قەڵایە دابەشکرا بۆ ســـێ حەوشـــە و پێنج حوشترخانە، یەکێک لە حوشـــترخانەکان کرابوو بە زیندانی تاکەکەســـی و دەرگایەکی ئاســـنی گەورەیان تێگرتبوو، ئەو دەرگایـــە زیندانییانی ئاســـایی لەگـــەڵ زیندانییانی سیاســـی لە یەکتری جیادەکـــردەوە. ئەو حەوشـــەیەی کە لە داڵانە بڵنـــد و تاریکەکەوە بۆی دەچوویت، ناســـرابوو بە حەوشـــەی شـــارەوانی، دواتر نووســـینگە و ژووری شـــارەوانی لەلایەکـــی داڵانەکە و نووســـینگە و ژوورەکانی تر لەلایەکـــی دیکـــەی داڵانەکەوە بوون. ژوورێکیان بە شیشـــی ئاســـن بۆ

ســەردانیکردنی زیندانییانی ئاسایی دروستکردبوو، ژوورێکی تریشیان بەهەمان شێوە بۆ زیندانییانی سیاسی دروستکردبوو. ئەم دوو ژوورە کە دروســتکرابوون بە لای ئەو حەوشــەیەوە بوون کە پێی دەگووترا حوشــترخانە. ســەردانیکردن بۆ لای زیندانییانی سیاسی شەش مانگ جارێک بوو، ئەویش سەرەتای پاییز و سەرەتای بەهار بوو، ئەو ڕۆژانە وەک ڕۆژی جەژنی لێدەهات، لە بەیانی زووەوە تاکو ئێوارە کەسوکاری زیندانییــان دەمانەوە. دەرگایەکی بچووک کە قفڵێکی گەورەی لێدرابوو، حەوشــەی شارەوانی لە حەوشــەکەی تر کە پێیان دەگووت حەوشەی چــوار کلیلەکە، لە یەکتری جیادەکردەوە. دەرگای هەموو ژوورەکان بە ڕووی ئەم حەوشــەیەدا دەکرانەوە، چونکە پاســەوانەکە کلیلی هەموو ژوورەکانی لابوو، بەو حەوشەیەیان دەگووت: حەوشی چوارکلیل، واتە کلیلی تەوالێت و حەمام و سەرتاشخانە و شوێنی زنجیر و پێوەند. هەر لەوێدا دەرگایەکی تری زۆر گەورە هەبوو، کە بە ڕووی حەوشــەیەکی گەورەدا دەکرایەوە. ئەندازەی حەوشــەکە نزیکەی چوار مەتر بە چوار مەتــر دەبوو. بەو شــوێنەیان دەگــووت بەندی چوارەم، کــە پێکهاتبوو لــە ژوورێکــی گەورە و چەنــد ڕاڕەوێک، لەلایەکی تری حەوشــەکەوە دەرگایەکــی تر هەبوو دەچووە ســەر بەندی پێنج و ســێ. بەندی پێنج تایبــەت بوو بــە زیندانییانی سیاســی، کە پێکهاتبوو لــە چوار ژووری بچــووک. ســاڵی (١٣٤٢/ ١٩٦٣) لــە کۆتایــی مانگی ئــازەردا چواردە کەسیان لە ئەفسەرانی سەربازیی، کە سەر بە حیزبی تودە بوون، هێنا بۆ ئێرە، ئەوکات من نزیکەی پێنج ساڵ دەبوو لەوێ بووم، من بە گشتی ماوەی حەڤدە ساڵ لە زیندانی بەرازجان بووم.

**عەلی ئەشرەف دەروێشــیان: کاتێک دوورخرایتەوە بۆ زیندانی بەرازجان، تەنها بوویت؟**

**ســەفەرخان:** پانزەی فەروەردینی (١٣٣٦) نزیکەی دە ساڵ بەسەر زیندانیبوونمــدا تێپەڕیبوو، من و چەند هاوڕێیەکم کە بەیەکەوە لە تیپی

ئازەربایجان بووین لە کۆشــکەوە بردیانین بۆ تەبریز. لە تەبریز پێیان گووتیــن دووبارە دەبێــت بنێردرێنەوە بۆ تــاران و گێڕایانینەوە. پانزە ڕۆژ لــە زیندانی کۆشــک بووین و ڕۆژێک هاتــن و بەڕێیان کردین بۆ بەرازجان. پێشــتر باســی ئەمانەم کرد، بەڵام دیــارە من تەنها نەبووم، ئــەوەی لــە یادم بێت چەند کەســێک لە ئەوانەی لە تیپــی ئازەربایجان بەیەکــەوە بوویــن. لەگــەڵ ئەوانــدا دوورخرامــەوە بــۆ بەرازجان. کە ئەوانیــش ئەمانــە بــوون: ١-ســوهراب. ٢- ئیســماعیل. ٣- حورمەت عەلی جواندۆســت. ٤- مەرد عەلی غەریبی. ٥- ئیحسان. ٦- ڕەحمەتی هیمەتــی. ٧- نەخچەوان. ٨- برادەرانی ئاهنگەری. ٩- حوســێن حەداد، کە خوێندکاری زانکۆ بوو تاوانبارکرابوو بەوەی تەقەی لە شا کردبێت. کوڕە کوردێکی کرماشانیمان لەگەڵدا بوو، کەسێکی تریش لە ئەندامانی ڕێکخــراوی ئەفســەران لــەوێ بوو بە ناوی ئیســماعیل نیــک ئاین، کە لەگەڵ بەڕێوەبەری زیندان شــەڕی کردبوو هێنابوویانە بەرازجان. ئەو هاوڕێیانــەی تریش کــە هێنابوویاننە زیندانی بەرازجــان بریتیبوون لە: ئەندازیــار عەباس گەرمان، بەهادوری مەلەکــی، محەمەد عەلی ئاگاها، دکتۆر حەســەن مەرەندی، ســەید مەهدی هاشــمی (کە یەکێک بوو لە ئاغاکانی ســەراب و پەیوەندی کردبــوو بە تیپی ئازربایجانەوە، ماوەی ٢٧ ســاڵ لە زینداندا مایەوە و دواتر ئازادکرا)، حەســەنی سەبزەواری، عەلی شناسایی، ئیبراهیمی سەید نەژاد، حوسێنی فروهەر، کە وەزیری دارایی قازی محەمەد بوو، کەســێکی زانا و خوێندەوار بوو، حەســەن غەفوری. ســەرۆک شارەوانیی بەرازجان سەرهەنگ عابدیان بوو، ئەو کەســێکی باش بوو توند و سەختگیر نەبوو. دەیویست هەرچی کاری باشە بۆ زیندانییانی ئەنجام بدات.

**عەلی ئەشـــرەف دەروێشیان: عەزیز یوسفی و غەنی بلوریانیش لەگەڵ ئێوەدا بردیانن بۆ بەرازجان؟**

**ســـەفەرخان:** بەڵێ، دوای ماوەیەکی کەم لە هاتنی ئێمە ئەوانیشیان هێنـا، عەزیز یوسـفی و غەنی بلوریان لـە ڕێبەرانی حیزبی دیموکراتی کوردســتان بوون، ئەوان حەســەن سەوزەواریشــیان لەگەڵدابوو، ئەو بـە تۆمەتـی پەیوەندیـی لەگــەڵ ڕێکخــراوی ئەفســەرانی ئازادیخواز دەســتگیرکرابوو، شــۆفێری کۆمیتــەی ناوەنــدی حیزب بــوو. جەلیل گادانیــش لــەوێ بوو، کە یەکێک بــوو لە کادیرانی حیزبـی دیموکراتی کوردســتان. چەند کەسێکی تریشــیان هێنابوو، کە لە زیندانی قەسر لە (عەباســی)یان دابوو، عەباسی ئەو کەسە بوو کە هەموو ئەو بەڵگانەی پەیوەندیی بە ڕێکخراوی ئەفســەرانی حیزبەوە هەبوو، لای ئەو بوون، دەیانگووت لە کاتی دەستگیرکردنیدا کەسێکی خۆڕانەگر بووە.

ئــەم چەند کەسەشــیان لە زیندانی قەســرەوە هێنابــوو، کە ئەمانە بوون: جەعفەری لیاقەت ڕەوش، سەروان محەمەد ڕەزازادە، سەروانی یەکەم بەهرامی فەرتاش پور و حوســێن واهیب زادە، کە هەموویان لە ڕێکخــراوی ئەفســەرانی حیزب بوون. عەولا میــرزای ئەربابیش لەوێ بوو، کە زۆر لایەنگری ڕادیۆی پەیکی ئێران بوو. ئەو هەمیشە گوێگری ڕادیــۆی پەیکی ئێران بوو، ئەو هەواڵەکانی بۆ ئێمە دەگێڕایەوە. حەمام و سەرتاشــخانە و بیری ئاو و مزەخــەکان لە ژێرزەمینێکی بچووک و تاریکیدا بوو، هەر لە هەمان شوێن زنجیر و کەلەپچە و پێوەندی تێدابوو و بۆ ئەشکەنجەدانی زیندانییانی سەرکێش سودیان لێوەردەگرتن.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشــیان: بە هاتنی ئەفسەرانی ڕێکخراوی سەربازیی، چی گۆڕانکارییەک لە زینداندا ڕوویدا؟**

**سەفەرخان:** ڕۆژی دە، یان یانزەی مانگی ئازەر بوو کە ئێمە هەواڵمان پێگەیشت ئەفسەرانی تودەیان لە تارانەوە هێناوە بۆ زیندانی بەرازجان، ئەو ئەفســەرانە کەســانی زۆر تێکۆشەر و خزمەتگوزار بوون. دیواری

زیندانیان گەچکاریی کرد، لە قوڕ و گەچ مێزی نانخواردنیان دروستکرد، یەکێک لە حوشترخانەکانیان کرد بە شوێنی چێشتلێنان، شوێنێکی تریان کــرد بــە ژووری خــەو، ژووری خوێندنەوەیان جیاکــردەوە. بەتایبەت ئیســماعیل و زولقــەدر و دکتــۆر هاشــمی بەنی تەرەفی و هۆشــەنگی قوربان نەژاد زۆر ماندووبوون بە خزمەتگوزارییەکانی تەندروســتی و دروســتکردنی حەمام و ئاودەست و خاوێن ڕاگرتنی ناو زیندان. دیارە چەنــد ڕۆژێــک لەدوای هاتنی ئەو ئەفســەرانە، دکتــۆر بەنی تەرەفی و حەمید فام نەریمان و ئیســماعیل سەراجی و بەدرەدینی مەدەنی هاتن، ئەوان پێشــتر لە زیندانی قەســر بوون. لە تاران ســەرۆکی زیندان بە هەموو زیندانییەکان دەڵێت: نامە بنووسن و ناڕەزایی دەرببڕن بەرامبەر بە ئەفســەرانی حیزبی تودە، بەڵام ئەو کەسانەی کە دوورخرابوونەوە بۆ زیندانی بەرازجان، ئەو کارەیان نەکرد.

**عەلی ئەشرەف دەروێشــیان: لەو کاتەدا یەدوڵڵای شەهید زەند لە کوێ بوو؟**

**ســەفەرخان:** ئەویش لە بەرازجان بوو، بــەڵام لەبەرئەوەی حەزی دەکرد هەمیشــە تەنها بێت، لــە دوکانێکی بەرگدرووداد دەژیا، ئەحمەدی برادەران کە کاری بەرگدرووی دەکرد، بەردەوام ئەوی دەبینی. یەدوڵڵای شــەهید زەند بەردەوام پیاســەی دەکــرد، هەرچۆنێــک بووایە هەموو بەیانییــەک پێڵاوەکانی خۆی بۆیاخ دەکرد. هەروەکو ئەو ســەردەمەی کە ئەفســەر بوو، ڕۆژانە ڕیشــی دەتاشی و بەجوانی خۆی دەگۆڕی و پیاســەی دەکرد. ئەو تەنانەت شــاڵ و کڵاویشــی لابوو، ئەو پاڵتۆیەکی هەبوو، بەزۆر لە پۆلیســەکانی ســەندبوو پێی نەدەدانــەوە، ڕادیۆیەکی هەبوو زۆربەی کات گوێی لە بەرنامەی ئینگلیزی دەگرت، فەرهەنگێکی گــەورەی ئینگلیزی لابوو، تەواوی ئەو فەرهەنگەی لەبەرکردبوو. من تا ئێســتا هیچ کەسێکم نەدیوە بتوانێت فەرهەنگێکی ئینگلیزی لەبەر بکات. دیارە زمانی ئینگلیزی زۆرباش دەزانی. بیرم دێت جارێکیان لە زیندانی

قەسـر بووین. کاتی زسـتان بوو، چووە کەنار حەوزە ئاوەکەی بەندی شەش، سەهۆڵی سەر حەوزەکەی شکاند و بەو سەهۆڵاوە جوان خۆی شـۆری و سێ دەست سـابوونی لە خۆی دا. ئەو کەسێکی زۆر ئازا و بەجـەرگ بوو، ئەو ماوەی بیستوشـەش سـاڵ لە زینـدان مایەوە، لەو ماوەیەدا تەنها یەک پاروو خواردنی هیچ کەسێکی نەخوارد و بەو کەمە خواردنـەی کە دەدرا بە زیندانییەکان قەناعەتـی دەکرد، لەو دواییانەدا هیچ کەسێک سەردانی نەدەکرد. کاتێک دوورخرایەوە، ژن و کوڕەکەی هاتنـە بەرازجان. هاوسـەرێکی ئازا و دڵسـۆزی هەبـوو، بۆئەوەی کە نزیکـی هاوسـەرەکەی بێت، ماڵی هێنایە بەرازجان و لەو شـارە گەرم و ناخۆشـەدا دەژیـا. پێویسـتە ژنانـی گەنجی ئەمڕۆ ئەم بەسـەرهاتە بخوێننەوە، هەندێک جار سـەرۆکی زیندان مۆڵەتی دەدا کوڕەکەی بێتە لای و وانەی ئینگلیزی بخوێنێت.

دوای چەند ڕۆژێک دوو زیندانیی تریان هێنا، یەکێکیان ناوی حەبیبیان بوو، ئەوی تر ناوی ئابکار بوو، ماوەی زیندانییەکەیان زۆری نەمابوو، بەڵام ئەوانیشـیان دوورخستبووەوە بۆ بەرازجان، ئەوان هەردووکیان کرێکار بوون لە ڕێکخراوێکی چەپدا چالاکییان کردبوو. بەڕاسـتی ئەو ئەفسـەرە تودەییانە کەسانی زرنگ و هۆشـیار بوون. دوای ماوەیەک دەسـتیان کرد بە وانەخوێندن، پەیوەندییان لەگەڵ زانکۆکانی دەرەوەدا دروستکرد و هەریەکە و لە بەشێکدا دەستی کرد بە خوێندن، ئەو چەند کەسە ڕەوشتی زیندانیان گۆڕی بۆ زانکۆ.

**عەلی ئەشـرەف دەروێشـیان: پەروێزی حیکمەتجـۆ و عەلی خاوەریش هەر لە بەرازجان بوون؟**

**سەفەرخان:** پەروێزی حیکمەتجۆ ئەندامی ڕێکخراوی ئەفسەرەکان بـوو، بـەڵام کاتی دەسـتگیرکردنی لـە سـاڵی (١٣٣٣) توانیبووی لە دەسـتی پۆلیـس ڕابـکات و ڕۆیشـتبوو بـۆ دەرەوەی وڵات، دواتـر لەگەڵ عەلی خاوەری بۆ ڕێکخسـتنەوەی حیزب بە نهێنی دەگەڕێنەوە

ئێـران. ئـەم دووانە پەیوەندیـی دەکەن بە عەباس عەلی شـەهریاری و ئەویـش لەژێـرەوە پەیوەندیـی بـە سـاواکەوە هەبوو، بـە فێڵ و کەڵەکە هەردووکیان بەگرت دەدات. سـەرەتا حوکمی لەسێدارەدانیان بـۆ دەردەچێـت، بـەڵام دواتر حوکمەکەیـان بۆ دەگـۆڕن بە حوکمی هەتاهەتایی. لە دەرەوەی وڵات زۆریان بۆ تێکۆشابوون، هەربۆیە شا نەیتوانی لەسـێدارەیان بدات. لەدوای پەروێز و عەلی دوو کەسـی تر لە دەرەوە گەڕانەوە ئێران، کەس نەیزانی ئەوان چییان بەسـەرهات و ساواک بێسەروشوێنی کردن، ئەوان ناویان: مەعسومیان و سەرگورد ڕەزمـی بوو. سـاڵی (١٣٤٣) کەمێک دوای پەروێـز و عەلی ئەوانیش گەڕانەوە ئێران و گرفتاری تەڵەی عەباس عەلی شـەهریاری سـاواک بوون. هەر لە ئێراندا دوو کەسـی تر بەهـۆی پەیوەندیی بە ئەوانەوە دەسـتگیرکران. یەکیـان ناوی ئاسـف ڕەزم دیدە و ئەوی تر سـابیر محەمەد زادە بوو، کە سـاڵی (١٣٤٥) تاکو سـاڵی (١٣٥٧) لە زینداندا بوون.

لـەو ڕۆژانەدا هەواڵی گەڕانەوەی سـتوان قوبادی لە سـۆڤیەتەوە بـۆ ئێـران بڵاوبووەوە، زۆرم بەلاوە سـەیر بوو، یانی چی؟ سـتوان قوبادی ئەفسـەری پۆلیس و ئەندامی ڕێکخراوی ئەفسەران بوو، ئەو بە هاوکاریی سـتوان ڕەفعەت محەمەد زادە، کە ئەفسـەری پاسەوانی زیندانییانی سیاسی بوو، لە ساڵی (١٣٢٩) هاوکاریی ڕێبەرانی حیزبی کرد، تاکو لە زیندانی قەسر هەڵبێن، ئەو شەوەی کە بڕیار بوو هەڵبێن؛ قوبادی و محەمەد زادە ئەفسـەری پاسـەوانی زیندانی قەسـر بوون، دوای هەڵاتنـی ئـەوان، قوبـادی ماوەیەک دیـار نەما، بـە هاوکاریی حیزب ڕۆیشـت بۆ سـۆڤیەت، دواتر بەبێ ئامادەبوونی خۆی حوکمی لەسێدارەدانی بۆ دەرچوو، کەچی ئێستا وێنەکەی لە ڕۆژنامەی کەیهاندا دەبینـم. دوو وێنەی لـە ڕۆژنامەدا بڵاوکرابووەوە، کـە یەکێکیان هی سەردەمی لاویی و ئەوی تریان هی کاتی پیرییە. ڕژێم لە ڕۆژنامەکاندا وای بڵاوکردبووەوە کە سۆڤیەت تەسلیمی کردووەتەوە، بەڵام دوایی

دەرکـــەوت کە بەرگەی دوورەوڵاتی نەگرتووە و گەڕاوەتەوە، تاکو لە نیشتمانی خۆیدا بمرێت، دوایی ڕژێم لەسێدارەی دا.

**عەلی ئەشـــرەف دەروێشـــیان: ئایا گۆڕانکارییە جیهانییەکان کاریگەرییان لەسەر ڕەوشی زیندان هەبوو؟**

**سەفەرخان:** بەردەوام جیهان لە گۆڕانکارییدا بوو، ئێمە لە زینداندا زۆر ئـــاگاداری هەواڵەکانی دەرەوە نەبوویـــن، هەندێکجار ڕۆژنامەیان بـــۆ دەهێنایین، جاری وا هەبوو لـــە ڕۆژنامەکاندا هەواڵەکان بە جۆرێک بـــوون کە دەبوونە هۆی تێکشـــکانی دەروونی ئێمـــە، بۆ نموونە هاتنی ســـتوان قوبادی لە ســـۆڤیەتەوە و بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەکانی. من لێرەدا نامەوێت باســـی ئەو کاتی دەرەوەی زیندان بکەم، لەو بارەیەوە کتێب و نووســـراوی زۆر هەیە و خەڵکانی ئەوکاتەی دەرەوەی زیندان لەو بارەیەوە بەڵگەی زۆریان لەبەر دەستدایە، ئێستا تۆ مۆڵەتم پێ بدە کەمێک لەبارەی ڕەوشی ناو زیندانەوە قسەت بۆ بکەم، تاکەکەسێک کە شـــاهیدی سیودوو ساڵی ناو زیندان بووبێت، تەنها منم، دیارە کەسانی تریش هەبوون کە بیســـتوپێنج ســـاڵ و بیستوحەوت ســـاڵ ماونەتەوە، دیـــارە ئەوانیش ئاگاداری ناو زیندانەکان هەن و دەتوانن لەو بارەیەوە قســـە بکـــەن، دیارە من کەم و کورتێکیش ئـــاگاداری دەرەوەی زیندانم، هەر لەو ســـاڵانەدا و دوای ماوەیەکی کەم (عەلی ئەمینی) چووە ســـەر کار و بوو بە ســـەرۆک وەزیران، لەو ماوەیەدا ڕەوشی زیندان کەمێک باشتر بوو، لە دەرەوەش هێزی میللی دەسەڵاتی گرتە دەست و بەرەی میللـــی دووەم دامەزرا، چەندین بڵاوکراوە چاپکران و هەندێک جار ئەو بڵاوکراوانـــە لە زیندان دەگەیشـــتنە دەســـت ئێمە. دواتر (ئەســـەدوڵڵای عەلـــەم) بوو بە ســـەرۆک وەزیران و فشـــارەکانی نـــاو زیندان زیادیان کرد. هەر لە سەردەمی ئەودا بوو کە ڕاپەڕینی پانزەی خورداد ڕوویدا و ژمارەیەکی زۆری هاونیشـــتمانیان لەسەر شەقامەکان شەهید کران، هاوکات فشـــارەکانی ناو زیندان و ئەشـــکەنجە و لێدانیش زیادیان کرد،

سەردانیکردن نەما، ڕێگریی کرا لە هێنانە ژوورەوەی ڕۆژنامەکان.

یەکێک لە ڕووداوە ناخهەژێنەکانی ناو زیندان؛ هاتنی ژن و منداڵەکانی غەنی بلوریان بوو، کە هاتبوون بۆ سەردانیکردنی غەنی، غەنی بلوریان ئەندامی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بوو، کاتی دەستگیرکردنی تازە هاوسەرگیریی کردبوو، لەگەڵ عەزیز یوسفی لە دێهاتەکانی دەوروبەری مهاباد بە جلوبەرگی شوانییەوە خۆیان پەناگرتبوو، ساڵی (١٣٣٨/ ١٩٥٩) دەستگیر دەکرێن و ماوەیەک لە زیندانی قەسر دەبن و دواتر دوور دەخرێنەوە بۆ زیندانی قەڵای بەرازجان، غەنی بلوریانیش هەروەکو عەزیز یوسفی سەردانیکردنی نەبوو، تەنها برایەکی هەبوو جار جار سەردانی دەکرد، ئەو هاوسەر و دوو کچی هەبوو، کە کچەکانی دووانە بوون، جەژنی ساڵی (١٣٤٣/ ١٩٦٤) بوو کە هاوسەر و هەردوو کچەی هاتن بۆ سەردانیکردنی، کچەکانی ئەویان نەدەناسی و شەرمیان لێ دەکرد و نەدەچوونە لای، دوای چەند خولەکێک کەمێک شەرمیان شکاو پێیان دەگووت مامە، دواتر هێواش هێواش چوونە لای و ئەویش لەباوەشی گرتن، بەڕاستی ئەو ڕووداوە ڕووداوێکی ناخهەژێن بوو، هەموو ئەو کەسانەی لەوێ بوون دەستیان کرد بە گریان.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەفسەرانی ڕێکخراوی سەربازیی حیزبی تودە لە چ ڕێکەوتێکدا دوورخرانەوە بۆ بەرازجان؟**

**سەفەرخان:** سەرەتای مانگی ئازەری (١٣٤٢) بوو، کات شەو بوو کە ئەوانیان هێنا، ئێمە بۆ بەیانییەکەی زانیمان، بەڵێ، من ماوەی پێنج ساڵ بوو لە زیندانی بەرازجان بووم کە ئەوانیان هێنا.

هەروەکو پێشتر باسم کرد کەسانی تریش هەبوون وەک عەزیز یوسفی و غەنی بلوریان، کە لە ڕێبەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان بوون و پەیوەست بوون بە حیزبی تودەی ئێران. هەروەها مەنوچەهری سەفا و عاقلی زادەش لەوێ بوون و سەر بە کۆمەڵگەی سۆشیالیستی

بوون. لەم ماوەیەدا پێشهاتێک هاتە پێش، ئەویش ئەوەبوو زیندانییەکی خەڵکی تەبرێز کە ناوی ئینهاری بوو، لەگەڵ دوو زیندانیی تری خەڵکی تاران دەبێتە شەڕیان، هەربۆیە ئەو دەگوازنەوە بۆ ژووری تاکەکەسی، ژووری تاکەکەسی زۆر ترسناک بوو، ژوورەکانی بچووک و تەسک و گەرم بوون و دەرگاکەشیان دادەخست، ماوەی (٢٤) کاتژمێر ئینهاریان خستە ئـەو ژوورەوە، دوای ماوەیەک کە دەچـن دەرگای لێ بکەنەوە و دەیهێننە دەرەوە دەڵێت حەزم لە بیبسـی کۆلایە. بیبسـی بۆ دەهێنن و بەسـەریەوە دەنێت و لەو کاتەدا دەکەوێتە سـەر زەوی و دەمرێت، نازانم لە تینوێتیدا مرد، یان لە گەرمادا.

لەسـەر ئـەو حاڵەشـەوە دەتوانـم بڵێـم زیندانـی بەرازجـان لـە زیندانەکانی تر باشـتر بوو، بە دڵنیاییەوە مرۆڤ ئەگەر لە سـەختترین ژیانـدا بێت، بەڵام کەمێک ئازادیی هەبێت غەم و پەژارەی کەمترە. ئێمە لە بەرازجان کەمێک ئازادییمان هەبوو، واتە پاسـەوان و ئێشـکگرەکان بەسـەر سەرمانەوە نەبوون، ئەوان لە سـەربان و لە پشت دەرگاکەوە بـوون. پێویسـتییەکانی وەرزش و یاریکردنمـان لابوو، پاسـەوانەکان کاریـان بەسـەرمانەوە نەبوو، هەندێـک جار یەکێک لە ئـەوان دەهات و لە گۆشـەیەکی دالانەکەدا دادەنیشـت و نێرگەلەی دەکێشـا. ئێمەش دوو سـێ قرانمان پێدەدا و چەند مژێکمان لە نێرگەلەکەی دەدا. لە پاڵ دیوارەکانی حەوشـەکەدا تووتن و سـەوزە و جۆرەها گوڵمان دەچاند، تۆوی ئەو گوڵ و سەوزانە کەسوکاری ئەفسەرەکان لە تارانەوە بۆیان دەهێنایـن، هەندێک لـە زیندانییەکان پارەیان پێبـوو، داوایان دەکرد بۆ کڕینی پێویستییەکانیان و بۆ سەردانیکردنی دکتۆر بڕۆن بۆ ناو شاری بوشەهر، زیندانییەکان لەکاتی ڕۆشتنیاندا کەلەپچەش نەدەکران، کەمێک پارەیـان دەدا بە پاسـەوان و ئەویـش کەلەپچەی دەسـتی زیندانییانی دەکردەوە.

**عەلی ئەشرەف دەرویێشیان: تۆ نەدەڕۆیشتی؟**

**ســـەفەرخان:** چۆن نەدەڕۆیشـــتم، جارێکیان موهەندیس (گرومان) منی دەعوەت کرد و بەیەکەوە ڕۆیشـــتین بۆ بوشـــەهر، لەوێ کەلەپچە نەکرایـــن کەمێک پارەمان دا بە پاســـەوانەکە و ئەویش کەلەپچەکەی لە دەســـتمان کردەوە. لە کەنار دەریا دانیشتین و سەیری کەشتییەکانمان دەکرد، مرۆڤ کاتێک سەیری کەشتی دەکات؛ هەست بە ئازادیی دەکات و دەڵێیت سەیری ئەو کەشتییە بکە بەسەر ئاوەکەدا بە ئازادیی دەڕوات، بـــەڵام بەداخەوە مـــن لەو کەشـــتییەدا نیم. بەڵێ، گووتم: لـــە بەرازجان کەمێک ئاســـودەتر بوویـــن، بەڵام کـــەس نەدەهات بۆ ســـەردانیکردنم. عەزیز یوســـفیش هەر ســـەردانیکردنی نەبوو، ئـــەو هاوڕێیەکی هەبوو جارجـــار دەهات بۆ ســـەردانیکردنی، بەڵام دوای ماوەیەک ئەویش مرد و ئیتـــر کـــەس ســـەردانی نەدەکرد. عەزیز یوســـفی لە تەمەنـــی لاوییدا کەوتبـــووە زیندانـــەوە، نە ژنی هەبوو، نە منداڵ، هەندێک جار شـــۆخیم لەگەڵـــدا دەکرد و پێم دەگووت هێشـــتا کوڕیت و بوخچەی نەکراوەیت، ئەویش قاقـــا پێدەکەنی، غەنی بلوریانیش ســـەردانیکردنی نەبوو، تەنها یەک جار هاوسەر و کچەکەی سەردانیان کرد.

شەوانە ناوی ئەو زیندانییانەیان دەنووسی کە دەیانویست بڕۆن بۆ ناو شاری بوشەهر، هەرکەسێک پارەی پێبووایە ناوی خۆی دەنووسی و بەیانی دەڕۆیشـــت. هەر لەبـــەر دەرگا پاســـەوانەکان کەلەپچەکانیان دەکردنـــەوە و ئەوانیـــش بـــە ئازادیـــی دەڕۆیشـــتن. ئەو کاتـــەی لەگەڵ موهەندیس (گەرمان) ڕۆیشتم بۆ بوشەهر، زیندانییەکی خەڵکی شیرازمان لەگەڵدا بوو، کاتێک گەڕاینەوە ئەو لە شیراز ساواکی ئاگادارکردەوە کە سەرۆکی زیندان زیندانییانی سیاسی دەبات بۆ بوشەهر، ئیتر لەو کاتە بەدواوە ڕۆیشـــتن بۆ بوشـــەهر قەدەغەکرا و ســـەردانیکردنیش نەما و ژیانمان سەختتر بوو.

**عەلی ئەشـــرەف دەروێشیان: جۆری خواردنتان چۆن بوو ، چۆن کاتتان بەسەردەبرد؟**

**سەفەرخان:** خواردنیان پێ نەدەداین، هەریەکەو ڕۆژانە (١٣) قرانیان پێدەداین، لەوێ هەموو شتێک هەرزان بوو، سەرە مەڕێکمان بە حەوت قــڕان دەکڕی و بــە چوار کەس دەمانخوارد، گۆشــت کیلـۆی بە دوو تومەن، یان ســێ تومەن بوو، یەک نان بە دوو قڕان بوو. بەو ســیانزە قڕانــە دەژیاین، دواتر بوو بە پانزە قــڕان، دوای ماوەیەک نارەزاییمان دەربــڕی و بۆیان کردین بە دوو تومــەن، تاکو ئازادبوونمان هەر دوو تومــەن بوو. پارەکەیــان دەهێنا و ئێمەش لیســتەکەمان ئیمزا دەکرد و پارەمان وەردەگرت، چەند پاســەوانێک لە دەرەوە شــتیان بۆ دەکڕین. ئێمــە داوای هەرشــتێکمان بکردایــە بۆیان دەکڕین و بۆیــان دەهێناین. ئەوان شــتەکانیان بە گرانتر بۆ دەهێناین، دیارە ئەوەش پەیوەست بوو بە ویژدانی خۆیانەوە. وەک گووتم ئێمە ئەوانەی کە لە تیپی ئازەبایجان بووین، شەش کەس بووین، بەیەکەوە هێنایانین بۆ بەرازجان، هەر ئەو شــەوەی کە گەیشــتین ئێمەیان کردە حوشــترخانەیەکەوە و دەرگایان لەسەر داخستین.

ئاو و هەوا بەرەو گەرمی دەڕۆیشت، دەرگا ئاسنەکان تەواو گەرم ببــوون، گەرما تاوی بــۆ هێنابوویــن؛ هەریەکەمان تەختــە خەوێکمان هەبــوو لەســەری دەخەوتیــن، چەند کەســێکیان لە تارانــەوە هێنابوو، ئەوانیش زیندانیی ئاســایی بوون، یەکێکیان نــاوی (زەبیح) بوو. لەگەڵ زەبیح بەیەکەوە دانیشــتین و کەوتینە گفتوگۆ، ئێمە دەبێت لێرە بژین و ئەوانیــش دەرگاکان دادەخەن، چــۆن بەم گەرمایە بتوانین لەم گەوڕەدا بخەویــن. بڕیارمــان دا کــە شــەوی داهاتوو لە حەوشــەکە بخەوین و نەچینە ژوورەکانەوە. ئێمە شــەوی داهاتوو لە حەوشەکەدا دانیشتین و پاســەوانەکان هاواریان دەکرد بڕۆنە ژوورەکانەوە، ئێمەش گوێمان پێ نەدان. سەرۆکی پۆلیســخانەی زیندان کورد بوو، کوردێکی کرماشانی بوو، کەســێکی باش بوو، لە سەربانەکەوە دەســتی کرد بە قسەکردن،

بۆئەوەی سـەرنجی ئێمە ڕابکێشێت بە زمانی تورکی کەوتە قسەکردن، ئـەو کەمێـک تورکی دەزانـی، گووتی: سـبەی پێیان دەڵێـم دەرگاکان بکەنـەوە و ئێـوەش لە حەوشـەکەدا بخـەون. ئیتر ڕزگارمـان بوو لە خەوتنی ناو ژوورەکان.

بەڕاستی ژوورەکان وەک دۆزەخ وابوون، گڵۆپەکان بە بنمیچەکەوە چەسـپکرابوون و ڕووناکییەکـی زۆر کەمیـان هەبـوو، بەجۆرێک کە زیندانییەکان بە باشی یەکتریان نەدەبینی. بنمیچەکە ئەوەندە بەرز بوو، بە پەیژەش دەستمان نەدەگەیشتە گڵۆپەکان، دەرگا ئاسنەکانیش بە تینی گەرما سـووربیوونەوە، هەندێک جار دەستەسڕمان بەدەستەوە دەگرت بۆ کردنەوە و پێوەدانی دەرگاکان. هەوای دەرەوەش هەمووی تەپوتۆز بوو. دەمانویسـت ئاو بخۆینـەوە، ئاوی بۆرییەکـەش زۆر گەرم بوو، لەبـەر تەپوتۆز هەندێک جار تاکو شـەش مانگ ئاسـمانمان نەدەبینی. ئەسـتێرەمان نەدەبینی. ئەو هەموو تەپوتۆزە زۆرە لە عەرەبسـتانەوە دەهات، ناو دەم و ژێر زمانمان پڕ دەبوو لە خۆڵ و ئاوەکەش سوێر و گەرم بوو. ئەگەر باران بباریایە سوودمان لە ئاوی باران وەردەگرت بۆ چایی لێنان. چەند زیندانییەکی ئازەربایجانیان هێنابوو، خەڵکی (خارک) بـوون. پۆلیس نەیاندەهێشـت ئێمە لەگـەڵ ئەواندا قسـە بکەین، ئەوان هەندێکیان کەسـانی سازشـکار بوون، بەڵام چەند کەسێکیان کەسانی باش بوون،. من هەرچییەکم بینیبێت باسی دەکەم. پۆلیس بۆ ساڵڕۆژی (٣١)ی ئازەر مەراسـیمێکی ڕێکخسـتبوو، پاسـەوانێک هـات بۆ لامان و گووتـی: هاوشـارییەکانتان کاریان بە ئێوە هەیـە، ئێمەش گووتمان کارەکەیان بێ هۆیە و ئێمە نایەین، هەرچەند هەوڵیان دا نەڕۆیشتم.

**عەلی ئەشرەف دەرویێشیان: کاری چییان بە ئێوە هەبوو؟**

**سـەفەرخان:** مەراسـیمی جەژن بوو، لـە دەرەوە ژمارەیەک کەس هاتبوون، فەرمانداریش هاتبوو، کەسـێک لەلایەن سـەرۆکی زیندانەوە هـات بـۆ لام و گووتی: ئاغـای قارەمانی تـۆ وەرە و تەنها یەک چایی

بخۆرەوە و برۆ. منیش گووتم: سەرۆک بێ هۆ دەڵێت وەرە، من دەڵێم نایەم.

لە زیندانی شـــارەکاندا، لەهەر زیندانییەک بێـــزار بوونایە، بۆئەوەی تەمبێـــی بکەن، دەیاننارد بۆ زیندانی بەرازجان. لەناو قەڵای زیندانەکەدا دەستکاریی دیوارەکانیان دەکرد و هۆڵ و ژووری تریان دروست دەکرد، تەنها دەستکاریی مزگەوتی زیندانیان نەکرد، ئێمەیان برد بۆ مزگەوتەکە، مزگەوتەکـــە زۆر گـــەورە بوو، چەنـــد پایەیەکی گـــەورەی تێدابوو، کە هەموویـــان لە بەردی زۆر گەورە دروســـتکرابوون، ئەگەر چوار کەس دەســـتی یەکتریان بگرتایە و بە بازنەیی بە دەوری پایەکەدا دەســـتیان بگرتایە، پایەکان ئەوەندە ئەستوور بوون دەستیان نەدەگەیشتەوە یەک. دیـــواری مزگەوتەکـــە زۆر بەرز بـــوو، دیارە پایەکانیشـــی بەرز بوون. نازانم ئەو بەردە گەورانەیان لە کوێوە هێنابوو، دەوروبەری زیندانەکە دەشـــتێکی پان و بەرین و چۆڵەوانی بوو، یەک بەردی بچکۆلەشـــی لێ نەبوو. پاسەوانێک هەبوو، ئەو دەیگووت: باوکم بۆی باسکردووم، کاتی دروســـتکردنی ئەم زیندانە ئەو شاگرد بەنا بووە و لێرە کاری کردووە و ڕۆژانەکـــەی دوو (شـــایی) بـــووە، بەڵام ئەو نەیگووتبـــوو ئەو بەردە گەورانەیـــان لە کوێوە هێناوە. بەڵێ، دیـــوارەکان یەکپارچە بەرد بوون، نەماندەتوانی بزمارێک بـــە دیوارەکەدا داکوتین تا کەلوپەلەکانمانی پێدا هەڵبواســـین. دیـــوارەکان ئەوەنـــدە پتەو و ئەســـتوور بـــوون، ئەگەر بە بۆمبیش لێی بدرایە هیچ کاریگەرییەکی نەدەبوو. ناو زیندانەکە ئەوەندە گـــەرم بوو پانکەکانیشـــیان کار پێدەکرد، بەڵام هیچ ســـوودێکی نەبوو. شەوانە تا دەمەو بەیان لەتاو گەرما لە حەوشەکەدا هاتوچۆمان دەکرد. پلەکانـــی گەرما دەچووە ســـەروو پەنجا پلەی ســـەدی، بۆیە دەچووین بەو ئاوە قوڕاو و گەرم و ســـوێرە خۆمـــان تەڕ دەکرد و دەهاتینە ژێر پانکەکان ڕادەکشـــاین، بەڵام هیچ فێنک نەدەبووینەوە، بەو خۆتەڕکردنە هەمـــوو گیانمـــان دەبـــوو بە قوڕ، بە لەشـــولاری لە قوڕ هەڵکێشـــراوی یەکتری پێدەکەنین.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ڕووداوی ئەو تەقەکردنەی لە کۆشکی مەڕمەڕە لە شا کرا، چ کاریگەرییەکی لەسەر ڕەوشی زیندان هەبوو؟**

**سەفەرخان:** لە بیستی مانگی فەروەردینی (١٣٤٤) (١٩٦٥/٢/١٠) ڕەزای شەمس ئابادی، کە سەربازی پاسەوان بوو لە کۆشکی مەڕمەڕە بە چەکەکەی هێرش دەکاتە سەر شا، ئەو لەژێر درەختێکی کاجدا پاسەوان بوو، کاتێک شا لە ئۆتۆمبێلەکەی دادەبەزێت و بەرەو ناوەوەی کۆشکەکە دەڕوات، شەمس ئابادی بە خێرایی خۆی دەگەیەنێتە شا و تەقەی لێدەکات، بەڵام بە زوویی پاسەوانەکانی شا، شەمس ئابادی دەدەنە بەر دەستڕێژی گوللە. شەمس ئابادی کەسێکی بەهێز و بەخۆوە بوو، پانزە فیشەکی بەردەکەوێت، بەڵام هێشتا بەرەوپێش دەڕوات و تەقە دەکات، تا ئەو کاتەی یەکێک لە پاسەوانەکانی شا چەند فیشەکێک لەسەری دەدات و دەکەوێت. شا ڕادەکات و دەچێتە ژێر مێزی ژوورەکەی و خۆی دەشارێتەوە. ئێمە دواتر ئەو هەواڵەمان بیست و دواتریش لە ڕۆژنامەکاندا ئەو بابەتەمان خوێندەوە، دیارە دوو سێ کەس لە پاسەوانانی شا کوژران.

هەرچەندە کە ڕەزای شەمس ئابادی کوژرا، بەڵام دواتر سەرەداوێکیان دەستکەوت و گووتیان ڕووداوەکە پەیوەندیی بە گرووپێکی (مارکسی- ماوی)ەوە هەیەو کوشتنی شا یەکەم هەنگاوی چەکدارانەیان بووە، بەڵام دواتر دەرکەوت ژمارەیەک لە لاوانی خوێندکار لە بەریتانیاوە گەڕابوونەوە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە. هەندێک لەوانە ئەندامی حیزبی توده بوون، کەسی یەکەمیان پەروێزی نیکخوا بوو، یەکێکی تریان موهەندیس مەنسوری بوو، کە لە کارگەیەکدا کاری دەکرد، هەر لەو کارگەیەدا کرێکارێکی تر بە ناوی ئەحمەد کامەرانی کاری دەکرد، ئەو خەڵکی کاشان بوو، لەگەڵ ڕەزای شەمس ئابادی هاوشاری بوون. ئەحمەد کامەرانی ئاگاداری بەرنامەکەی ڕەزای شەمس ئابادی بوو بۆ کوشتنی شا، هەر ئەویش

هەواڵەکە دەگەیەنێتە موهەندیس مەنسوری کە بەیەکەوە پەیوەندییان هەبـوو. موهەندیس مەنســوریش ئــەم بابەتــە لای هاوڕێکانی باس دەکات. هەرچەنــدە دواتــر دەرکەوت کە ئەو کارەی ڕەزای شــەمس ئابــادی ئەنجامــی دا بڕیــاری تایبەتی خۆی بوو، بــەڵام هەمان باس و خواس بووە هۆی ئەوەی کە ســاواک لەســەر بابەتییەکە توندتر بێـت. دیارە کاریگەرییەکە لە زینــدان دەرکەوت کە ڕووداوەکە چۆن بووە، هەربۆیە توندوتیژییەکان زیاتر بوون و بە هەر بەهانەیەکەوە کەسێکیان دەبرد و دارکارییان دەکرد.

لەپێش ئەم ڕووداوەدا و لە سەرەتای مانگی بەهمەنی (١٣٤٣) لە ڕووداوی کوشــتنی حەسەن عەلی مەنســوردا، کە لاوێکی موسڵمان بــە ناوی محەمــەد بوخارایی لەبــەردەم پەرلەمان تەقــەی لێدەکات. زۆر هەوڵ دەدەن کە حەســەن عەلی مەنسوری نەمرێت، بەڵام دوای چەنــد ڕۆژێک مرد. لەو بارەیــەوە ڕۆژنامەکان شــتی گاڵتەئامێزیان بڵاوکردەوە. بۆ نموونە نووســیبوویان شــا ڕۆیشت بۆ نەخۆشخانە بۆ ســەردانیکردنی حەســەن عەلی، حەسەن عەلی لەبەر شا هەڵسا و پێشــوازیی لێکرد، باشــە کەسێک چەند فیشــەکێک بەر سک و سنگی کەوتبێت، چۆن دەتوانێت لە جێگای خۆی هەڵسێت، ئەگەر هەستاوەتە سەر پێ؛ بۆچی دوای یەک ڕۆژ مرد؟ دیارە هەمان کات هەستیان بە درۆکەی خۆیان کرد، ئەمجارەش گووتیان هێشتا زیندووە و لەبەر شا هەڵســاوە. محەمەد بوخارایی لەگەڵ دوو هاوڕێی تریدا بە ناوی نیک نەژاد و هورەندی دەســتگیرکران. دوای ئەوانیش گرووپێک بە ناوی (موتلیفە) دەســتگیرکران. حەسەن عەلی مەنسور و هەموو ئەندامانی کابینەکــەی لایەنگــری ئەمریکا بــوون. دوای تیرۆرکردنی حەســەن عەلی مەنســور، ئەمیــر عەباس هوەیدا، کە یەکێک بــوو لە ئەندامانی کابینەکــەی حەســەن عەلی مەنســور، بوو بە ســەرۆک وەزیران، بە هاتنــی ئــەو ڕەوشــە زۆر خراپتر بــوو. نیعمەت نەســیری لەجیاتی سەرلەشکر پاکڕەوان بوو بە سەرۆکی ساواک، سەر لەشکر نەسیری

گواسترایەوە بۆ کۆشکی شاهەنشا و سەرپەرشتی بەرنامەکانی شای دەکرد. بەهاتنی سەرلەشکر نەسیری ئازار و ئەشکەنجە زیادی کرد.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: موهەندیس مەهدی بازرگان و ئەندامانی جوڵانەوەکەی لە چ ساڵێکدا گواسترانەوە بۆ زیندانی بەرازجان؟**

**سەفەرخان:** مانگی ئابانی (١٣٤٤) هەواڵمان پێگەیشت کە چەند زیندانییەکیان هێناوە و لە حەوشی زینداندا لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت، چاودێری بەشەکەمان ڕۆیشت و دوای ماوەیەکی کەم لەگەڵ موهەندیس مەهدی بازرگان و دکتۆر یەدوڵڵای سەحابی گەڕایەوە. ئەو زیندانییانەی کە تازە هێنرابوونە بەرازجان، بە گشتی هەژدە کەس بوون، چواردە کەسیان سەر بە ڕێکخراوی بزووتنەوەی ئازادیی بوون و ئەم کەسانە بوون: ١- موهەندیس مەهدی بازرگان. ٢- دکتۆر یەدوڵڵای سەحابی. ٣- موهەندیس عیزەتوڵڵای سەحابی. ٤- ئەحمەد عەلی بابایی. ٥- دکتۆر شەیبانی. ٦- ئەبولفەزڵی حەکیمی. ٧- دکتۆر عالی. ٨- محەمەد جەعفەر ٩- بەستە نیگار. ١٠- مستەفای موفیدی. ١١- موجتەبای موفیدی. ١٢- مەهدی موسمی. ١٣- شامیلو. ١٤- قالیچە چیان، دوو کەسیان لە کۆمەڵی سۆشیالیستەکان بوون، ئەوانیش: ١- عەباس عاقلی زادە. ٢- مەنوچەهری سەفا.

دوو کەسیش لە لایەنگرانی ڕاپەڕینی پانزەی خورداد بوون بە ناوەکانی: ١- موحسین تاهیری. ٢- وەکیلی.

ئیتر ئەوان بە تەواوی ببوونە دۆست و هاوڕێی یەکتری و کێشەکانی ڕابردوویان وەلا نابوو، لە حەوشی زینداندا بەیەکەوە یاریی تۆپی باسکەیان دەکرد، شەوانە مەنوچەهری سەفا ڕۆژنامەیەکی لوول دەکرد و وەکو دووربین دەینا بە چاویەوە و سەیری ئاسمانی پێدەکرد و خۆی فێری ئەستێرەناسی دەکرد و لەگەڵ عەزیز یوسفی و هاوڕێکانی تری لەبارەی دۆزینەوەی ئەستێرەی تازەوە گفتوگۆیان

دەکرد. مەنوچەهری سەفا کەسێکی دانا بوو، من سڵاوم لێدەکرد، بەڵام ئەو وەڵامی نەدەدامەوە، منیش تورە بووم و پێم گووت: بۆچی وەڵامی سڵاوەکەم نادەیتەوە. ئەو بێچارەیە گووتی: کاکە خۆ من گوێم گرانە هیچ شتێک نابیستم، دواتر وا ڕاهاتبوو سێ چوار مەتری مابوو بگات بە من سڵاوی لێدەکردم. بە ڕۆژ هەوا گەرمتر دەبوو، هەمووان بە گشتی لە بارێکی خراپ و ناخۆشدا بووین، بەتایبەت ئەو کەسانەی کە تەمەنیان هەبوو، بەڵام ئەو کاتەی شا ویستی گەشتێک بکات بۆ ئەوروپای خۆرهەڵات؛ لە فڕۆکەخانەی میهراباد فەرمانی بە نەسیری کردبوو کە ژمارەیەک لە زیندانییە دوورخراوەکان بگەڕێننەوە بۆ تاران، ئەوەش لە ئەنجامی تێکۆشانی ئێرانیانی دەرەوەی وڵات بوو، کە ئاگاداری کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییان کردبوو کە ڕژێمی شا زیندانییانی سیاسی دوورخستووەتەوە بۆ ئەو ناوچانەی کە ئاو و هەواکەی خراپە. شا دەیویست بەم کارەی نیازپاکیی خۆی نیشان بدات. ئیتر زیندانییانی سەر بە حیزبی دیموکراتی ئازەربایجان و حیزبی دیموکراتی کوردستان لەوێ مانەوە و ئەوانی تر لە ناوەڕاستی مانگی خوردادی (١٣٤٥) گواسترانەوە بۆ تاران. عەسری ئەو ڕۆژە بوو کە سەرهەنگ (ڕیازی) ناوی ئەفسەرانی حیزبی تودە و کەسانی سەر بە بزووتنەوەی ئازادیی خوێندەوە و گواستیاننەوە بۆ تاران.

بە ڕۆیشتنی ئەو ئەفسەرانە و کەمبوونەوەی قەرەباڵغییەکە تا ڕادەیەک ڕەوشی زیندان ئارامتر بوو. هاوینی گەرم هات و دووبارە بای سووتێنەری پڕ لە تەپوتۆز هەڵیکرد، بەری ئاسمان وا تاریک دەبوو، کە شەوانە ئەستێرە پڕ ڕووناکییەکان نەدەبینران. ئێمە لە حەوشە دەخەوتین و سەیری ئاسمانمان دەکرد تاکو ئەستێرەکان ببینین. عەزیز یوسفی تا درەنگانێکی شەو دادەنیشت و خەریکی وەرگێڕانی کتێبی (سەرزەمینی سەخت) بوو. ئەو چەند کتێبێکی تری لەبەردەستدا بوو خەریکی وەرگێڕانیان بوو، یەکێک لەو کتێبانە کتێبی (باخی ئاڵتوونی) بوو. هەندێک جار هەندێک بەشی ئەو کتێبانەی بۆ من دەخوێندەوە.

ئـەو خەریکی لێکۆڵینەوەیەک بوو دەربارەی چاکسـازییەکانی زەوی و کاری هەرەوەزیی، کە بەهۆیەوە بتوانرێت پارچە زەوی بچووک دابەش بکرێت و بە هەرەوەزیی بە بەرهەم بهێنرێت، بەڵام دواتر سـاواک ئەو لێکۆڵینەوە تێر و تەسـەلەیان دزی و خۆیان لە دەوروبەری قەزوێن بە ناوی کۆمپانیای هاوکاریی و وەبەرهێنانی کشـتوکاڵ، بە ناوی شـاوە جێبەجێیان کرد. عەزیز یوسـفی زۆر ماندوو بوو بەو لێکۆڵینەوەیەوە، زۆربـەی سـەرچاوەکانی لێکۆڵینەوەکەی ئەو گوندانـەی دەوروبەری بەرازجان بوون، کە زەوییەکانیان کرابوون بە زیندان.

هەرچۆنێک بێت من لە جێگاکەی خۆم ڕادەکشـێم و شەوانە بیر لە ژیانی خۆم دەکەمەوە، سـەردەمی منداڵی، مرۆڤ ئەگەر لەناو ڕەنج و مەینەتیدا بووبێت، ئەوە لە کۆتاییدا بۆی دەبێتە بیرەوەریی. بیرەوەریی کاری سەخت و گیان پڕووکێن. ئەو یارییانەی لەگەڵ منداڵانی هاوتەمەنی خـۆم لە کۆڵانەکانـی گوندەکەماندا دەمانکرد، چیرۆک و داسـتانەکانی شـەوانە کە لە زمانی بەتەمەنەکانەوە دەمبیسـت، لەشـولاری دایکم و باوکـم و براکانـم هەموو ئەمانـە دەهاتنەوە بەر چاوم، هاوسـەرەکەم و کچـە تاقانەکـەم کە هیچ کات ئەوم لەئامێـز نەگرتبوو، دەهاتنە پێش چاوم، ئەو ڕۆژانەی کە لەگەڵ هاوسەرەکەمدا کارمان دەکرد و شەوانە نەخشـەمان بۆ ئاینده دەکێشا، شێوەی هەمیشە پەشۆکاو و پەرێشانی من و ئەو، کە زۆربەی کات لە دەشـت و کێو و شـارەکاندا لە جەنگ و هەڵاتندا بووین، لە یادی ئەو کەسـانەی بەهۆی بیروباوەڕیانەوە گیانی خۆیـان بەخت کرد و لە هاوڕێیانی دڵسـۆزی من بوون. چ هەوڵێکمان دەدا و چ جیهانێکـی پڕ شـەڕ و هەرامان هەبوو. ئێسـتاش لە زیندانی بەرازجان لەژێر چاودێریی پۆلیسـدا گرفتارم و سەیری ئاسمانێکی پڕ لە تەپوتۆز دەکەم. وا باشـترە مرۆڤەکان ئەوەندە بیر لەو ڕابردووەیان نەکەنـەوە، چونکە ئـەو بیرکردنەوەیە مرۆڤ تووشـی وەسوەسـە و دوودڵـی دەکات و هەسـتی ئازادیـی دێتەوە یاد، پێویسـتە ئەو جۆرە بیرکردنەوانـە فەرامـۆش بکرێت، بەڵام ناکرێت من ئـەو بیرکردنەوانە

فەرامۆش بکەم، چونکە من ڕێبواری ڕێگای ئەوانم، بۆ زیندوو مانەوەم پێویستە ئەوان هەمیشە لەیادمدا بن. باشە دەبێت دەستبەکار بم تا ڕزگاری، ڕزگاریی لە ستەمی دەرەبەگەکان، لە تاوان و زوڵمی ئاغاکان و ڕزگاریی لە ژیانی بەندایەتی. من ویستم کەسێکی ئازاد بم و بە ئازادیی بژیم، بەڵام دەرەبەگەکان ڕێگرم بوون، بەڵام بە دڵنیاییەوە ڕۆژێک دێت ئێمە سەردەکەوین، چونکە ئەم جیهانە بە هێز و بازووی ئێمە دروست دەبێت، چونکە ئێمە لەسەر مافین و هەموو ئەو شتانەی لەم جیهانەدا پێویستن، بە هێز و بازووی ئێمە بەرهەم دێت. ئێستا غەنی بلوریان لە خەودایە و لەگەڵ منداڵەکانیدا گفتوگۆ دەکات، منیش هەوڵدەدەم بخەوم، حەزم دەکرد خەو بە هاوسەر و تاقە کچەکەمەوە ببینم، بەڵام ئازاری گوێچکەم ئارامی لێ بڕیوم، بە تایبەت کاتی شەوان کە تەنها دەبم و کەسێک نییە لەگەڵیدا بدوێم. ساڵەها بەدەست ئازاری گوێوە ناڵاندم، دوای هەوڵێکی زۆر ڕۆژێک بردیانم بۆ شیراز و لەوێ دکتۆرێکی ناشی و ناشارەزا پەردەی گوێچکەی دڕیم. پێویستە دوایی باسی ئەو بەسەرهاتەتان بۆ بکەم.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: تۆ کەی هاوسەرگیریت کردبوو؟**

**سەفەرخان:** ساڵی (١٣٢٤/١٩٤٥) لە گوندەکەی خۆمان لەگەڵ کچێکی زەحمەتکێش هاوسەرگیرییم کرد. بەرهەمی هاوسەرگیرییمان کچێک بوو کە من نەمتوانی لە مەراسیمی ناونانیدا بەشداربم و ناویان لێ نا (مەهین). لە ماوەی دوانزە ساڵ زیندانییم لە زیندانی بەرازجان، نە باوکم، نە هاوسەرم بەهۆی هەژاریی و تاڵانکردنی ماڵ و موڵکیان نەیانتوانی بۆ تاکە یەک جاریش سەردانم بکەن و ئارەزووی دیداری منیان خستە ژێر گڵ. هەرچەندە باسی عەشق و خۆشەویستی و وەفای هاوسەرم بکەم، کەمم گووتووە، ئەو ساڵانەی کە لەژێر حوکمی لە سێدارەداندا بووم، هەروەکو تەواوی هاوڕێیانم ڕۆژانە لەژێر چاوەڕوانی پەتی سێدارەدا بووم، زۆر نزیک بوو هەروەکو هاوڕێکانم لەسێدارە بدرێم،

چەندین جار نامەم بۆ هاوسەرەکەم نووسیوە کە من لەسێدارە دەدریم، یا ئەگەر لەسێدارەش نەدریم، حوکمی هەتاهەتاییم بەسەردا دەسەپێنن، بۆیە وا باشترە تۆ بەدوای ژیانی خۆت بکەویت و لە من جیاببیتەوە، بەڵام ئەو هەرگیز بە پێشنیاری من ڕازی نەبوو. ساڵی (١٣٢٩/ ١٩٥٠) بە هەزار زەحمەت و نارەحەتی کچە چوار ساڵانەکەمی هێنابوو بۆ دیدەنیم، لەو سەردانەشدا پێویستی پێکهێنانی ژیانێکی نوێم بۆ باسکرد، بەڵام ئەویش وەکو سەدان بووکی دوای کۆچکردن، یان لەسێدارەدانی هاوسەرەکانیان لەلایەن ڕژێمی شاهەنشاییەوە تا کۆتایی ژیانیان بە عەشقی هاوسەرەکانیان وەفادار بوون، ئەو بە بیستنی ئەو پێشنیارەی من دۆش داما و فرمێسک بە چاوانی هاتنە خوارەوە و گووتی: ئەگەر یەک جاری تر پێشنیاری ئەوهام بۆ بکەیت، یان لەو بارەیەوە نامەم بۆ بنووسیت، ئەوا بە دڵنیاییەوە من خۆم دەکوژم، من هیچ ئارەزوویەکم نییە، جگە لە ئارەزووی زیندوومانەوەی تۆ، ئەگەر تا کۆتایی ژیانم تۆ لە زینداندا بمێنیتەوە، بە ئومێدی ئازادیی تۆ، تاقە کچەکەمان گەورە دەکەم و خزمەتی دەکەم و وا هەست دەکەم منیش زیندانیی کراوم و لەگەڵ تۆدا زیندانیی هەتاهەتاییم و لەگەڵ تۆدا دەمێنمەوە.

## کۆچی دوایی هاوسەری سەفەرخان

ســالی (١٣٤١) هاوســەرم بە هەزار زەحمەت و قەرزکردنی پارە لە خزم و کەســوکارەکانمان بڕیاری دابوو کــە کچەکەمان بهێنێت و بێت بۆ ســەردانیکردنم، تاکو ئەو دەرد و مەینەتییەی کە یادگاریی ژیانمان بــوو لە دڵی خۆی دەربکات، هەر بەو هۆیەشــەوە و بەهۆی کەســێکی ئاشــنامانەوە منیــان لە هاتنی ئــەو ئاگادار کردەوە، منیش بە بیســتنی ئــەو هەواڵە لە چاوەڕوانی دیداری هاوســەرو کچەمدا بووم، شــەو و ڕۆژ چــاوم لەســەر دەرگاکە و گوێــم بۆ دەنگێک هەڵخســتبوو، بەڵکو ناوم بخوێنێتەوە بۆ دیدار و چاوپێکەوتن، بەڵام حەســرەتی ئەو دیدارە لەناو دڵمدا مایەوە. لە تاران هاوســەرم تووشــی سەرئێشەیەکی توند دەبێت و لە نەخۆشــخانەی هەزار تەختی دەخەوێت و نەشــتەرگەریی بــۆ دەکرێت، بەڵام بەداخەوە لە ژووری نەشــتەرگەریی مۆمی تەمەنی دەکوژێتەوە.

چەند ڕۆژێک لە چاوەڕوانیدا بووم، هەوای گەرمی بەرازجان هێزی لێ بڕیبووم، ڕۆژێک نامەیەک لە بنەماڵەکەمەوە گەیشــتە دەســتم، نامە لە زینداندا گرنگییەکی زۆری هەیە. نامە بەدەستم گەیشت، نامەی کچە تەمەن شانزە ساڵانەکەم بوو، ئەوەی لە یادمدا مابێت، نامەکە بەمجۆرە دەســتی پێکردبــوو، باوکە، باوکی خۆشەویســتم من تــۆم نەبینی... لە نامەکەدا باســی بەسەرهاتی کۆچی دایکی بە فرمێسکەکانی نووسیبوو. بە خوێندنەوەی نامەکە گەرووم گیرا، هیچ کەسێک لەو شوێنە ناتوانێت لە بەرامبــەر هەواڵێکی ئەوها جەرگبڕدا خــۆی ڕابگرێت. زۆرهەوڵم دا کە نەگریم، بەڵام ئایا شتی وا دەکرێت، بۆئەوەی کەسێک فرمێسکەکانم نەبینێت ڕۆیشتم بۆ ئاودەستەکان، حەزم نەدەکرد هاوڕێکانم ناڕەحەت بکەم، لە زینداندا هەر کەسێک دەرد و مەینەتیی خۆی هەیە.

کاتێک زوڵم و ستەم گەرووی هەموو ئازادیخوازێک دەگرێت، دەنگی دادپەروەرانــەی هــەر مرۆڤێک دەگیرێــت، پەیوەندیی نێــوان زیندان و کۆمەڵگا دەپچڕێت. ڕادیۆ و نامە و سەردانیکردنی زیندانییان، بەتایبەت زیندانییانی سیاسی زۆر گرنگە. هەر یەکێک لەو پێویستییانە پەیوەندیی زیندانیی لەگەڵ جیهانی دەرەوە زیندوو دەکاتەوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: کاتێک هاوسەرت کۆچی دوایی کرد، تەمەنی چەند ساڵ بوو؟**

**سەفەرخان:** تەمەنی چلویەک ساڵ بوو، هاوتەمەن بووین، ئێستاش ناوی لە ناسنامەکەمدا هەیە، ناویان ڕەش نەکردەوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ناوی چی بوو؟**

**ســـەفەرخان:** ناوی ملوک باقر پور بوو، ساڵێک دوای ئەو باوکیشم کۆچی دوایی کرد، هاوســـەرم ســـاڵی (١٣٤٢) و باوکم (١٣٤٣) و دایکم لــە پێش ئەودا کۆچی کردبوو. کچەکەم دەڵێت: تاکو باوکت مابوو زۆر هاوکارم بوو. دواتر براکانم ژنیان هێنا، هاوسەری براکانم زۆر ئازاری کچەکەمیان دابوو، نەیاننارد بۆ قوتابخانە، گووتبوویان لە دێهاتدا نابێت کــچ بچێتــە قوتابخانە، بەڵام کچەکانی خۆیان ڕۆیشــتن بــۆ قوتابخانە و دبلۆمیــان وەرگرت و بوون بە مامۆســتا. کچەکــەی من تا پۆلەکانی حــەوت و هەشــتی خوێند، دواتر پێیــان گووتبوو عەیبە تــۆ بڕۆی بۆ قوتابخانــە و خەڵکــی دەڵێن کچی ســەفەرخان دەڕوات بــۆ قوتابخانە. دەمارگیریــی لەناو خەڵکــی گوندەکاندا زۆرە، بەڵام بۆ خۆیان نا، بەڵکو بۆ کەسانی تر.

بیرم دێت ســاڵەکانی دواتر، واتە ســاڵی (١٣٤٥/ ١٩٦٦) شەوێک بە نهێنی گوێم لە ڕادیۆی پەیکی ئێران گرتبوو، لە بەشــێک لە بەرنامەکەدا نامەیەکــی هاوڕێیــان عەلی خاوەر و پەروێــز حیکمەتجوی خوێندەوە، کە بۆ ســکرتێری نەتەوە یەکگرتووەکانیان ناردبــوو. دواتر بە هاوڕێ

زیندانییەکانم گووت بە دڵنیاییەوە دوای چەند ڕۆژێکی تر عەلی خاوەری و پەروێــز حیکمەتجو دەهێننە ئەم زیندانە و دەبنە میوانمان. قســەکەم بەڕاست گەڕا، دوای چەند ڕۆژێک، عەلی خاوەریان بۆ زیندانی زاهیدان دوورخستەوە و پەروێزی حیکمەتجۆش هاتە زیندانی بەرازجان، دوای هاتنی، پەروێزی حیکمەتجۆ هەڵســا بە دروســتکردنی کۆمەڵەیەکی نۆ کەســی، کــە دەبووایە ئەمانــە پــارە و خواردنەکانیان تێکــەڵ بکەن و هەموویــان وەک یــەک خێزان بەیەکــەوە بژین. داوایــان لە منیش کرد بەشداریی ئەو کۆمەڵەیە بکەم، بەڵام من بەهۆی بێ پارەییەوە بەشدارییم نەکــرد. دوای چەند ڕۆژێک بەهۆی باری نالەبــاری زیندان و مانگرتن کێشەیەک لەنێوان عەزیز یوسفی و پەروێزی حیکمەتجۆ دروست بوو. دواتر من لەگەڵ پەروێز قسەم کرد، پێم گووت: ئێمە لەم زیندانەدا دەژین، هەمووومــان دەروونمان ماندووە، ئەگەر تۆ بتەوێت لەگەڵ ئێمەدا بژیت، دەبێت وەک لێپرسراوێک و وەک پزیشکێک ڕۆڵی خۆت ببینیت، دڵنیابە لــەم دۆزەخەدا دەمەقاڵێ و ناخۆشــی ڕوو دەدات. دوای ماوەیەک لەم عاجزیی و ناخۆشــییە، ئێمە دە کەس لە یەک حوشترخانەدا بووین، کە جێگای ســەد کەس دەبووەوە، بەڵام دوای ماوەیەک پۆلیس زیندانییانی ئاســایی هێنایە لای ئێمــە. دوای ناڕەزاییەکی زۆر و پەیوەندییکردنمان بە سەرۆکی پۆلیسی زیندان، ئێمەیان گواستەوە بۆ مزگەوتە کۆنەکەی زینــدان. دوای ماوەیەک پەروێزی حیکمەتجۆ توڕە بوو، هەڵچوونەکەی زیــادی کرد. منیش پێم گووت: ئێمە هەموومان نەخۆشــین و نائارامی دەروونیمــان هەیــە، ئەگەر تۆ دکتۆریــت، ئێمە هەموومان هەشــت نۆ کەســین، تۆ وەرە چارەســەرمان بکــە، ئەگەر دکتۆریــش نیت بڕۆ بۆ خــۆت تەنهــا بژی. چەند ڕۆژێکی پــێ نەچوو پەروێز هــات و گووتی: عەزیز توڕە بووە و شــەڕم لەگەڵدا دەکات و جوێنم پێ دەدات. منیش پێــم گووت: ئــەی من نەمگووت ئێمــە هەموومان نەخــۆش و توڕەین، ئیتــر لــەو ژوورەی کە لێی بووین، ئێمەیان گواســتەوە بۆ مزگەوتەکە. دیــواری مزگەوتەکە هەمووی یەک پارچە بەرد بوو، قاتی ســەرەوەی

نەخۆشـــخانە بوو، خوارەوەش مزگەوت، حەوشەکەی زۆر گەورە بوو، هەموومـــان بەیەکەوە زۆر تەبا بووین، تەنها کەمێک عەزیز یوســفی و حیکمەتجو...

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: کێشەکەیان لەسەر چی بوو؟**

**ســـەفەرخان:** هیـــچ...، هەمـــان ناڕەحەتـــی و هەلومەرجی ســـەختی زینـــدان، بۆ نموونە یەکێـــک ڕادیۆکەی هەڵدەگرت، ئەوی تریش لە دژی ئەو پەلاماری ڕادیۆکەی دەدا.

**عەلی ئەشرەف دەروێشـــیان: مەگەر ئایدیۆلۆژی ئەوان جیاواز بوو؟**

**ســـەفەرخان:** نا بابە! بەیەکەوە بوون، هەردووکیان تودەیی بوون، عەزیز یوســفی تودەییەکـــی تودەیی بوو، کێشـــەکە ئایدیۆلۆژی نەبوو، زیندانییـــەکان دژی یەکتـــری نەبوون، تەنانەت کاتێـــک مەهدی بازرگان و هاوڕێکانـــی لـــەوێ بـــوون؛ هەموومان بەیەکەوە بێ کێشـــە بووین و ژیانێکـــی برایانەمان هەبوو، هیچ کێشـــە و ناڕەحەتییەکمان نەبوو. ئیتر ئێمە ماوەیەک لە مزگەوت بووین.

**عەلی ئەشرەف دەروێشـــیان: بۆچی ماوەی زیندانییەکەیان بۆ کەم نەکردیتەوە؟**

**سەفەرخان:** ئێمە هەشت، نۆ کەس مابووینەوە، هیچ کاتێک بەشداریی جەژن و مەراســـیمەکانی حکومەت و شاهەنشـــامان نەدەکرد، جگە لەو چەند کەســـەی بە تاوانی ســـیخوڕیی بۆ ســـۆڤیەت دەســـتگیرکرابوون، ئێمـــە هەرگیز نامەی لێبووردنمان نەنووســـی. پێویســـتە ئـــەوەش بڵێم هەرگیـــز ئەفســـەرانی تودەیـــی و برادەرانی بزووتنـــەوەی ئازادیش کە برابوونـــەوە بۆ تاران؛ نامەیان نەنووســـی و داوای لێبووردنیان نەکرد. ئێمە کەسانی سازشـــکار نەبووین و بەردەوام ناڕەزاییمان دەردەبڕی،

من هیچ کاتێک شایەنی ئەوە نەبووم حوکمەکەم دابەزێت، دیارە ئەگەر زووتر دەستگیربکرامایە، لە هەمان شوێن دەیانکوشتم. شا یەک جار بۆ هەر زیندانییەک پلەی زیندانییەکەی سوک کرد، بەڵام لە وەڵامی نووسراوێکدا نووسیبووی: ئەوانەی چوونەتە دەرەوەی وڵات، ئەو بڕیارە نایانگرێتەوە. من ئەو کاتە لە عێراق بووم، کاتێک منیان دادگایی کرد، نارەزاییم دەربڕی کە لێبووردنی گشتی دەرکراوە و تەنانەت ئەوانەی پیاویان کوشتووە، یەک پلە حوکمەکەیان بۆ دابەزاندوون. گووتیان ئەوە شمولی تۆ ناکات.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لە زیندانی بەرازجان ژووری تاکەکەسی هەبوو؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، هەروەکو زیندانی ئەوین سێ چل ژووری تاکەکەسی هەبوو، دیارە تۆ چوویتە ژوورە تاکەکەسییەکانی زیندانی ئەوین.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: بەڵێ، چووم.**

**سەفەرخان:** بەهەمان شێوە بوون.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لەو ژوورە تاکەکەسییانەدا، هەروەکو ژوورە تاکەکەسییەکانی زیندانی ئەوین ئاودەست هەبوو؟**

**سەفەرخان:** نەخێر، ئاودەست لە هەمان ژووردا نەبوو، بەڵام ژوورەکان بە هەمان ئەندازەی ژوورەکانی زیندانی ئەوین بوون. ڕاڕەوێکی درێژ و تاریک بوو، لایەکی ڕاڕەوەکە هەمووی ژووری تاکەکەسی بوون. دواتر زیندانییەکان خۆیان داوایان دەکرد بچنە ئەو ژوورە تاکەکەسییانەوە، چونکە ژوورەکان یەک کەسی بوون، دەرگاکەشی کراوە بوو. لەوێ دادەنیشتن و ئارەقەیان دەکردەوە، بەڵام لەبەرئەوەی تەنها بوون، بەلایانەوە باشتر بوو. پێشتر باسی ئەو لاوە

تەبریزییەم بۆ کردن کە ماوەی (٢٤) کاتژمێر لەو ژوورانەدا بوو، کاتێک هێنایانــە دەرەوە داوای بیبســی کۆلای کرد، دیــارە ئێمەش حەزمان لە بیبســی کۆلا بوو، بەڵام پەیدا نەدەبوو، هەرچەندە بۆ ئەویان پەیدا کرد و بیبسییەکەی بە سەرییەوە نا و مرد.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: باسی سەردانیکردنی کچەکەتمان بۆ بکە لە زیندانی بەرازجان.**

**سەفەرخان:** ســاڵی (١٣٤٥) بە بیستنی هەواڵێک کە (مەهین)ی کچم لەگــەڵ کەســێک لــە ناوچەکەی خۆمان بە ناوی موحســینی عەباســی هاوسەرگیریی کردووە، خۆشحاڵ و ئاسودە بووم، من بە درێژایی ئەو ســاڵانەی لە زیندانی بەرازجان بووم، هیچ کەســێک سەردانی نەکردم، ئامۆزاکەم لە نامەیەکدا بۆی نووســیبووم چەندین ســاڵە بەدوای کاردا دەگەڕێم، هەر کاتێک کارێکم دەســتکەوت و یەکەم مووچەم وەرگرت، ئەوا دێم بۆ سەردانیکردنت. هەموو خزم و کەسەکانم کە تاڵانکرابوون و دەســت بەسەر ماڵ و موڵکیاندا گیرابوو، هەریەکەیان بۆ پەیداکردنی پارووە نانێک ڕۆیشتبوون بۆ ناوچەکانی تر، یان لە هەوڵی دابینکردنی مووچەیــەک بــوون تاکو لەبرســاندا نەمرن، هەر بەو هۆیەشــەوە من کەسێکم نەبوو بێتە سەردانم.

ســاڵی (١٣٤٦/ ١٩٦٧) لەنــاو زیندانــدا هەواڵیان پێدام، کە کەســێک هاتووە بۆ ســەردانیکردنم، کەســێک هات و لەبەر گەرمیی دەرگاکە بە دەستەســڕێک دەســکی دەرگاکەی گرت و کردییــەوە و گووتی: وەرە دەرەوە ســەردانیکردنت هاتــووە، منیــش لــە دڵی خۆمــدا گووتم: کێ دێــت بۆ ســەردانیکردنم، ئەگەر کچەکــەم بیتوانیایە بێت، ئەوا پێشــتر بــە نامــە ئاگاداری دەکردم. بە پاســەوانەکەم گــووت: بابە کێ دێت بۆ سەردانیکردنی من؟ من هیچ کەسێک سەردانم ناکات، بە نا باوەڕییەوە ڕۆیشتم بۆ ژووری سەردانیکردن، سەیرم کرد هیچ کەسێک لەوێ نییە، دەرگاکە کرایەوە و کوڕێکی لاو باوەشــی پێدا کردم و دەســتی کرد بە

گریان، من ئەوم نەناسی. گووتم: تۆ کێیت؟ بۆچی دەگریت؟ لێرە چی دەکەیت؟ گووتی: من خەلیلم ئامۆزای تۆم، لە ئەسفەهانەوە هاتووم، خێرم کردبوو کە یەکەم برە پارە بگاتە دەستم دێم بۆ سەردانیکردنی تۆ، ئێستا کەمێک پارەم دەستکەوتووە و هاتووم چاوم بە تۆ بکەوێت. دوای ئەو یەکتری بینینە بڕیار بوو ڕۆژی دواتریش بێتەوە بۆ سەردانیکردنم. دوای جیابوونەوەی لە من دەچێت بۆ ئوتێل، لەوێ کچەکەم و زاواکەم دەبینێت. ڕۆژی دواتر دووبارە بانگکرامەوە و گووتیان وەرە ژنێک هاتووە بۆ سەردانت. منیش گووتم: کێیە؟ ڕۆیشتم بۆ ژووری سەردانیکردن. چاوم بە ئامۆزاکەم نەکەوت، ویستم بگەڕێمەوە سەیرم کرد کوڕ و کچێکی گەنج بەرەو لای من دێن. من لە ئەوانم پرسی، ئێوە کێن و بۆ سەردانیکردنی کێ هاتوون؟ گووتیان: هاتووین بۆ لای تۆ. زاواکەم گووتی: من موحسینم و ئەو خانمەش کچەکەتە. (مەهین) ی کچەکەم دەگریا و منداڵێکی لە باوەشدا بوو، منداڵەکەیان نیشاندام. گووتم: بۆچی پێشتر ئاگادارتان نەکردووم کە دێن بۆ سەردانم. گووتیان لەبەرئەوەی ئاگادارمان نەکردیت نەوەک لەبەر دووریی ڕێگا و کەمپارەیی تۆ ڕازی نەبیت سەردانت بکەین. من هیوادار بووم بەو پرسیارانە پێش بە هەستی خۆم بگرم و بە بینینی کچەکەم کە چەندین ساڵ بوو نەمبینیبوو، فرمێسک بە چاوانمدا نەیاتە خوارەوە، بە خۆم دەڵێم ئایا ڕۆژێک دێت کە لەم کۆمەڵگایەی ئێمەدا مرۆڤ بتوانێت نەوە خۆشەویستەکەی لەباوەش بگرێت و ماچی بکات و ئەگەر دڵی ویستی کەمێک بگری، بەڵام لەبەر چاوی پۆلیس نابێت بگریت و دەبێت دەستت بخەیتە سەر دڵت و بێدەنگیی بکەیت. لە زینداندا کچەکەم هەمیشە گەورەترین کێشەی دەروونیی من بوو، بەڕاستی سەردانیکردنی ئامۆزا و کچەکەم و زاواکەم بووە هۆی خۆشحاڵبوونم. نەوەکەم کە تەمەنی شەش مانگ بوو، لەباوەشم گرت و ماچم کرد، کاتێک سمێڵەکانم لە گۆنای نەرمی دەدرا؛ خۆی گرژ دەکرد و دەیویست بگری، لەوانەیە هەستی کردبێت کە دڵی منیش پڕ لە گریانە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لە زیندانی بەرازجان چ یادگارییەکی ترت دێتەوە یاد؟**

**سەفەرخان:** لە ماوەی یانزە ســاڵ مانــەوەم لە زیندانی بەرازجاندا، شــاهیدی مەرگی لەســەرخۆی خۆمــم و بیرەوەریی سەرنجڕاکێشــم هەیە، ڕۆژێک دادوەری ســوپا، ســەرتیپ (سدوقی) بۆ پشکنین هات بۆ زیندانی بەرازجان. زیندانییانی سیاسی لەبارەی پێشێلکردنی مافەکانیان قسەیەکی زۆریان کرد. سەرتیپ سدوقی گووتی: ئەگەر ئێوە بۆ ماوەی شــەش مانگ باســی خراپیی باری زیندان نەکەن، بەڵێنتان پێدەدەم کە هەوڵــی ئازادبوونتان بدەم. هاوڕێیان گووتیان ئێمە لەبارەی پەیوەندیی ئــاو و تەندروســتییەوە لەگــەڵ تۆدا قســە دەکەین، تۆ ئەو کێشــەیەت پــێ چارەســەر نەکرێت، لەکوێ توانای ئازادکردنــی ئێمەت هەیە، ئەمە وەڵامێکی توند بوو بۆ ســەرتیپ، هەربۆیە هیچ قسەیەکی تری نەکرد و ڕۆیشت.

هەر لە هەمان ســاڵدا بوو ڕۆژێک (سەبهەبید نەسیری مەعدوم)، کە بەهۆی خیانەتەکانی بەرامبەر بە خەڵکی ئازادیخوازی ئێران کرابوو بە بەڕێوەبەری گشــتیی پۆلیس، ئەو هاتبوو بۆ زیندانی بەرازجان، کاتێک دەرگاکە کرایەوە؛ نەسیری لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر ئەفسەر هاتە ژوورەوە. چەند کەسێک بە پێوە وەستابوون و چەند کەسێکیش دانیشتبوون. من بەتەنیشت (غولامڕەزای ئەربابی)ەوە وەستابووم، کاتێک نەسیری هاتە ژوورەوە لە دوورەوە موهەندیس ئەربابیان نیشــاندا، دیاربوو پێشــتر لەبــارەی ئەوەوە قســەیان کردبوو. موهەندیس غولامڕەزا وەســتابوو پێدەکەنی. کەســێک لە تەنیشــت غولامڕەزاوە وەستابوو، نەسیری لێی پرســی و گووتی: تۆ بە تاوانی چی دەســتگیرکراویت. موهەندیس ڕەزا نەیهێشــت ئەو قســە بــکات و خۆی وەڵامــی دایــەوە و گووتی: ئاغای نەســیری ئــەو و زۆربــەی زیندانییــەکان لەســەر نیشــتمانپەروەریی دەســتگیرکراون، تۆ ئەوە لە هەموو کەســێک باشتر دەزانیت. نەسیری

وەڵامی نەدایەوە و سەری خۆی داخست و ڕۆیشت بۆ بەشەکانی تری زیندان. لە بەشێکی تری زیندان باسی ژیانی سەخت و دژواری ناو زیندانیان پێ گووتبوو، ئەویش گووتبووی ئێمەش دەمێکە بیرمان لەوە کردووەتەوە، بەم نزیکانە زیندانێک دروست دەکەین و ئێستا لە کاتی تەواوبووندایە، بە زوویی ئێوە دەگوازینەوە بۆ ئەوێ. دواتر زانیمان لە نزیک شیراز لە شوێنێک کە پێی دەڵێن عادلئاباد خەریکی دروستکردنی زیندانن. دوای تەواوبوونی ئەو زیندانە، زیندانییانی هەتاهەتاییان گواستەوە بۆ ئەوێ. ئەو زیندانە یەکێک بوو لەو زیندانانەی کە ڕژێم دەیویست وەک وڵاتێکی پێشکەوتوو لە یادی دوو هەزار و پێنجسەد ساڵەی شاهەنشاییدا نیشانی وڵاتانی بدات. موهەندیس غوڵامڕەزای ئەربابی، کە ئێستا خولی فێربوونی زمانی ئینگلیزی کردووەتەوە، کەسێکی زۆر ئازا و خۆڕاگر بوو، جارێک پۆلیس لەسەری دەدات، ئەویش یەک مانگ مانی لە خواردن گرت. هیچی نەخوارد تەواو لات بوو، گومانمان دەکرد کە بمرێت.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: تاوانی چی بوو؟**

**سەفەرخان:** تودەیی بوو، پێش دەستگیرکردنی شەوانە دەچوو ڕادیۆی پەیکی ئێرانی دەکردەوە و دەنگی بڵند دەکرد تاکو خەڵکی گوێبیستی بن، لە زیندانیش شەوانە ڕادیۆی پەیکی دەکردەوە. مەگەر کەسێک دەیتوانی قسەیەک بە ڕادیۆی پەیک بڵێت، هاواری لێ هەڵدەستا و دەیکردە شەڕ، مانی لە خواردن دەگرت. جارێکیان مانی لە خواردن گرت، هەر کارێکیان کرد مانگرتنەکەی نەشکاند، ئاویشی نەدەخواردەوە، ئەو کاتە خوشکەکەی بێژەری ڕادیۆ بوو، ئەو هات و لە پشتی شیشەکانی زیندانەوە قسەی لەگەڵدا کرد و داوای لێکرد مانگرتنەکەی بشکێنێت، بەڵام بە قسەی نەکرد. سەرۆکی زیندانیش داوای لێکرد، دواتر خاڵی هات و داوای لێکرد، هەرچەند هەوڵیان دا ئەو مانگرتنەکەی نەشکاند، تا کار گەیشتە ئەوەی ناردیان بۆ نەخۆسخانەی

شـیراز، لەوێـش هیچیان بـۆ نەکـرا، زۆر هەوڵیان دا دەمـی بکەنەوە و خـواردن بکەنـە دەمییەوە، بەڵام سـەرکەوتوو نەبـوون، بردیان بۆ تاران و لە زیندانی قەسـریش زۆر هەوڵیـان لەگەڵدا، دواتر هێنایانەوە بـۆ بەرازجان، دیسـان هیچی نەخـوارد، هێز و توانـای نەمابوو وەک هەناری تەپیوی لێهاتبوو، بردیان لە مزگەوت فڕێیاندا و بە سـتوونێکی مزگەوتەکەوە بەستیانەوە. ئەفسەرێک و چەند پاسەوانێک بە دیارییەوە بوون، بەردەوام بە باتووم لێیان دەدا، ئەویش هاواری دەکرد و لەقەی دەهاویشت. هەرچۆنێک بێت دوای یەک مانگ مانگرتنەکەیان پێ شکاند. ئـەو حوکمەکەی پێنج سـاڵ بوو، ڕادیۆی پەیکـی دەکردەوە و مانی لە خـواردن دەگرت، هەرچی پارەیەکی هەبوو دەیدا بە تەلەگراف، مانگێک بڕی سێسـەد تومەن پـارەی تەلەگرافی بۆ هاتەوە، لـە تەلەگرافەکاندا دەینووسی دەبێت ئێران ببێتە وڵاتێکی کۆماری دیموکراسی.

**عەلـی ئەشـرەف دەروێشـیان: لەنـاو حیزبـی تـودەدا چ لێپرسراوێتییەکی هەبوو؟**

**سەفەرخان:** هیچ، تەنها خۆی و دوو سێ کەسی لەگەڵدا بوو. کاری ڕاگەیاندنـی کردبوو، بـەڵام زۆر حەزی لە ڕادیۆی پەیـک بوو، ئەگەر شەوێک گوێی لە ڕادیۆی پەیک نەگرتایە، وەک شێتی لێدەهات.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەویش ئەفسەر بوو؟**

**سـەفارخان:** نە بابە ئەفسـەر نەبوو، من چەند سـاڵێک لەوەوپێش ئەوم لە تاران بینیبوو، مامۆستای زمانی ئینگلیزی بوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئێستا ماوە؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، دامەزراوەیەکی هەیە و وانەی ئینگلیزی دەڵێتەوە، بـە منـی گووت وەرە لێرە لەگەڵ مندا کار بکـە. منیش گووتم: بابە خۆ من ئینگلیزی نازانم، بە گشـتی ئەو پێنج سـاڵ زیندانیی کێشا، کەسێکی

سەرسەخت و بەرگریکار بوو، بچووکترین کێشەی هەبووایە، ئەو مانی لە خواردن دەگرت، هەر لێپرسراوێک سەردانی زیندانی بکردایە، ئەو لەبەری هەڵنەدەستا. بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس هات لەبەری هەڵنەستا، مەنوچەهری ئیقبال هات لەبەری هەڵنەستا، عەلەم هات لەبەری هەڵنەستا، کەسێکی توند بوو کە دەیگووت نابێت، واتە نابێت.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئیقبال و عەلەم کاتێک سەرۆک وەزیران بوون، سەردانی زیندانی بەرازجانیان کرد؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، ئیقبال و عەلەم هەردووکیان هاتن، عەلەم پێنج هەزار تومەنی دا و گووتی: بەسەر زیندانییەکاندا دابەشی بکەن.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: عەلەم پارەی دا؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، ئەو کەسێکی زۆر خاکیی بوو، سەردانی زیندانی دەکرد و نێرگەلەی لە پاسەوانەکان وەردەگرت و دادەنیشت و نێرگەلەی دەکێشا، ئەو کەسێکی لە زیندان ئازاد کرد، کە ناوی حوسێن حەداد بوو. لەسەر قسەگووتنی بە شا دەستگیر کرابوو. ئەو بە عەلەمی گووت: من تاوانبار نیم و حوکمی هەتاهەتایی دراوم. من منداڵ بووم کە لەگەڵ ناسر فەخر ئارایی بووم بە ئاشنا. عەلەم گووتی: بەڵێ، ڕاست دەکەیت، دۆسیەکەت لای منە. گەڕایەوە تاران و ئەوی ئازاد کرد. دوو کەسی تریش کە خەڵکی (بیرجەند) بوون، ئەوانیش زیندانیی ئاسایی بوون و کاسبکاری باوکی عەلەم بوون، عەلەم ئەوانیشی ئازادکرد، ئەو ڕەفتاری زۆر باش بوو، بەڵام ئیقبال وا نەبوو، ئەو کاتێک هات بۆ زیندان بە خۆبادانەوە گووتی: ئێوە جێگاتان ئێرەیە، هەتاهەتایە دەبێت لێرە بمێننەوە. گووتی: ئازادکردنتان ئاسانە، بەڵام مانەوەتان لێرە گرانە، ئێوە ناتوانن بڕۆن بۆ شوێنێکی تر، بەڵام دەتوانن ئازادبن. بەم قسانەیدا دیار بوو مەبەستی چی بووە، دەیویست بڵێت نامەی لێبووردن بنووسن.

**عەلی ئەشـــرەف دەروێشیان: چی شـــتێکی تری زیندانت دێتەوە یاد؟**

**ســـەفەرخان:** دوو ســـێ کەســـی زیندانیی هەبوون، ئەوان زیندانیی ئاســـایی بـــوون و سیاســـی نەبوون، لەتـــاو گەرما خۆیان ســـووتاند و خۆیان کوشـــت، ئاخر زۆر گەرما بـــوو، ڕۆژی چەندین جار دەچووین خۆمان دەخســـتە بەر ئاوی حەمام و دواتر دەهاتینەوە لەژێر پانکەکەدا دەوەســـتاین، بەڵام هیچ ســـوودێکی نەبوو. ئاوەکەمان سوێر و گەرم و لیخن بوو. دوای حەوت هەشـــت ســـاڵ بۆرییان بەســـت و ئاو بە بۆری دەهات، بەڵام ئاوەکە کەم بوو و چکە چکە دەهات، کاتێک باران دەباری ئاوی بارانمان کۆدەکردەوە و بۆ چا لێنان و شتی تر بەکارمان دەهێنا. بەرازجـــان ئاو و هەوایەکی زۆر گەرم و ناخۆشـــی هەبوو، خواردنمان زۆر خـــراپ و کـــەم بوو، ســـەوزە و میوە نرخی زۆر گـــران بوو، ئێمە توانای کڕینمان نەبوو، تەنها باینجانمان دەکڕی و دەمان کرد بە چێشت و دەمانخـــوارد. مـــرۆڤ ئەگەر بـــاوەڕی بەهێز بێـــت، دەتوانێت لەگەڵ هەموو شتێکدا ڕابێت. ماوەیەک بردیانین بۆ بوشەهر، زیندانی بوشەهر زۆر لە بەرازجان باشتر بوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: دەیانبردن بۆ حەمام؟**

**ســـەفەرخان:** حەمام لەنـــاو زیندانەکـــەدا هەبوو، هەفتـــەی جارێک، یـــان دوو جار دەیانبردین، حەمامەکـــەش هەمووی لە بەرد بوو، قەڵای بەردبـــاران بـــوو، دیـــوار و دەرگا و پەنجەرەکانـــی هەمـــووی لە بەرد دروستکرابوون، بەجۆرێک بوو مرۆڤ تاکو نەیبینێت باوەڕ ناکات.

**عەلی ئەشـــرەف دەروێشـــیان: گوێت بەهۆی لێدانەوە تووشی کێشە بوو، لە چ بارێکدا بوویت؟**

**سەفەرخان:** دکتـــۆر نەبوو تاکو چارەسەری گوێم بکات، دکتۆرێکی

نەخوێنــدەوار هات و وەک ئەوەی دەرزیت لێــدات، دەرزییەکی کرد بە گوێچکەمــدا و کونی کرد، ماوەی دوو ســێ مانگ شــەو و ڕۆژ کێم و جەراعــەت بە گوێچکەمدا دەهاتە خوارەوە، هەرچەندە ئەنتی بایۆتیک و پەنســیلینیان پێ دەدام، بەڵام هیچ ســوودێکی نەبوو. دوایی بڕیار بوو بۆ چارەســەر بمنێرن بۆ شــیراز، بەڕێکرام بۆ شیراز. چەند فرسەخێک لە زیندانی بەرازجان دوورنەکەوتبووینەوە کە ئۆتۆمبێلەکەمان تووشی ڕووداوی هاتوچــۆ بــوو، ئــەو کارمەنــدەی کە دەســتی منیــان لەگەڵ دەســتی ئــەو کەلەپچە کردبوو، لەهۆش خــۆی چووبوو، زۆرم جوڵاند تاکو بەهــۆش خۆی بێتەوە، کاتێک بەهۆش هاتەوە هەردوو دەســتمی توونــد گرتبوو. گووتم: کاکە تۆ بێهۆش بوویت، من هەڵنەهاتم، ئێســتا کــە بەهۆش هاتوویتەوە بۆچی وا پێمەوە چەســپ بوویت، تۆزێک بڕۆ بــەولاوە خەریکە دەمخنکێنیت. دووبارە منیان گەڕاندەوە بۆ بەرازجان، ئەمجــارەش ئۆتۆمبێلەکەمــان تێکچوو؛ منیان برد بۆ ماڵێک کە لە نزیک جــادە بــوو، بنکەی پۆلیــس هەواڵیــان زانیبوو هاتــن و بردیانمەوە بۆ زیندانی بەرازجان. ڕۆژی دواتر هاتنەوە و بردیانم بۆ زیندانی شــیراز، دوو سێ مانگ لە زیندانی شیراز بووم. دکتۆرێک لەوێ لێپرسراو بوو ئەویش کەســێکی چەپ بوو، لەبارەی منــەوە هەندێک زانیاری دەزانی. گووتــی: مــن تۆ لێــرە دەهێڵمەوە و بۆیان دەنووســم کــە دەبێت یەک مانگــی تر لێرە لەژێر چاودێرییدا بێــت. ئەو دەرمانی پێدام و گوێچکەم تەڕی نەما و وشــک بوو، بەڵام گوێم وزە وزەی لێوەدەهات، ئێســتاش هــەر لێیدێــت، وەک ئەوەی کە هەمیشــە مێشــێک لە پەنــا گوێمدا وزە وزەی لێبێت. بیســتنم لەدەســت دا، کاتێک چووم بۆ ســۆڤیەت و باسی گوێچکــەم بۆ کــردن، گووتیان دەبێت ماوەی شــەش مانگ لێرە لەژێر چاودێرییدا بێت، منیش نەمتوانی ئەو ماوەیە بمێنمەوە، بۆیان نووســیم لە ئێران بچمە نەخۆشخانەی سۆڤیەت، کە گەڕامەوە چووم سەیرم کرد نەخۆشخانەی سۆڤیەت هیچی بەسەر هیچەوە نەماوە.

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان: دوایین دیدارت لەگەڵ باوکتدا چۆن بوو؟**

**ســـەفەرخان:** کاتێک ئێمەیان لە زیندانی ئوورومیــەوە بەڕێ کرد بۆ زیندانــی بەرازجان، کاتژمێــر (٦)ی بەیانی بوو، باوکم و خوشــکەکەم کاتژمێـر (٩)ی بەیانی دەگەنە ئورومیە، ســەرۆکی زیندان پێیان دەڵێت ئــەوان دوورخراونەتــەوە بۆ زیندانی بەرازجان، ئیتــر باوکم چاوی بە مــن نەکەوتــەوە، تا کۆچی دوایی کرد چاوی بە مــن نەکەوتەوە، بەڵام خوشــکەکەم ئێســتاش ماوە، ئەو ماوەی ســاڵێک بوو هاوســەرگیریی کردبــوو لەگــەڵ ئەفســەرێکی تیپــی ئازەربایجــان. ئەو کاتــەی من لە کوردســـتان بووم، لە نزیک ئورومیە هاوســەری خوشکەکەم بە هەزار بەدبەختــی هاتبوو بۆ لای من، دووســەد فرســەخ ڕێگا بــە پێ هاتبوو، لەوێ خۆی حەشاردابوو، لەوێوە تاکو گوندەکەی ئێمە بە پێ دە دوانزە ڕۆژ ڕێگایــە، ئــەو هاتبــوو بۆ لای من. مــن کە گەڕامەوە بــۆ کێوەکە، جەنگ دەســتی پێکــرد و گەمارۆدراین، گەڕامــەوە تاکو هەندێک چەک ببەم، ســەیرم کرد کەس لەوێ نەماوە، هاوسەری خوشکەکەم سواری ئەســپ کرد و لەگەڵ خۆمدا بردم، ئەســپەکە هی خــۆم بوو بەیەکەوە سواربووین کە بڕۆین بۆ لای هێزەکەی بارزانی، سەیرم کرد ئەوانیش گەمــارۆدراون، پێــم گووت هیچ چارەیەک نییە تۆ بڕۆ لەو گوندە خۆت بشــارەوە و وەک ســوالکەرێک خۆت نیشان بدە و بڵێ کرێکارم. لەوێ چاوی بە دوو کەســی تری وەک خۆی دەکەوێت، کە ئەوانیش هەڵاتوو بوون و خەڵکی گوندی خۆمان بوون، یەکێکیان عەبدوڵڵای ســوهرابی بوو، ئەوی تریان ناوی عەسکەر بوو.

ئەوان هەرســێکیان بڕیــار دەدەن بەیەکەوە بڕۆن بۆ ســۆڤیەت، لە ڕێــگادا خۆیــان دەکەن بە هەژار و ســوالکەر، یەکێکیان دەستفرۆشــی دەکات، یەکێکیان دەڵێت من پینەچیم. لەم گوندەوە بۆ ئەو گوند دەڕۆن، دەگەنــە گوندی ئاراس، لــەوێ دەچنە ماڵێک لەگەڵ خــاوەن ماڵەکەش درۆ دەکــەن. هەریەکەیان خۆی دەکات بە شــتێک. یەکێکیان دەڵێت من

پینەدۆزم. لەپڕێکدا سەیر دەکەن تەواوی خەڵکی گوندەکە پێڵاوەکانیان دەهێنن بۆ پینە دۆز، ئەوانیش دەڵێن ئەمشەو ماندووین سبەینێ هەموو پێڵاوەکانتان بۆ پینە دەکەین. نیوەشەو هەڵدەستن و خۆیان دەگەیەننە سەر ڕووباری ئاراس، لە ناوەڕاستی ڕووبارەکە دەگەنە پارچە وشکانییەک و لەوێ گیر دەخۆن. لەپڕێکدا دەبینن بەلەمێکی سۆڤیەت ماتۆڕی بەسەرەوەیە و دەگاتە لایان و سواریان دەکەن و دەیانپەڕێننەوە. لەوێ پێیان دەڵێن ئێوە هەریەکەتان ناوی کەسێک لەو پەنابەرانە بڵێن کە تازە هاتوونەتە ناو خاکی سۆڤیەت. ئەوان نەیانتوانیبوو ناوی هیچ کەسێک بڵێن، چونکە کەسیان نەدەناسی. وایان هەستکردبوو کە منیش لەگەڵ بارزانیدا ڕۆیشتووم بۆ سۆڤیەت، ناوی من دەهێنن، ئەوانیش دەڵێن ئەو کەسە نەهاتووە، دواتر هەر یەکەیان بۆ شوێنێک دوور دەخەنەوە بۆ قزاخستان و قەفقاز و ئۆراڵ. هەریەکە و بۆ کۆمارێک، لەدوای شۆڕش کاتێک من چووم بۆ سۆڤیەت داوای ئەوم کرد و هێنایان، دوو سێ ڕۆژ میوانی من بوو، هەموو شتێکی بۆ باسکردم، ئەو لە باکۆ هاوسەرگیریی کردبوو، دوانزە منداڵی هەبوو، دووانیان پێرار هاتبوون بۆ ئێرە، نە فارسییان دەزانی، نە تورکی، وەک دیارییەک سێ کتێبیان بۆ هێنابووم کە ناوی من لەو سێ کتێبەدا هەبوو. دوای شۆڕش کوڕەکەی لە ئێرانەوە دەعوەتنامەی بۆ دەنووسێت کە بێت بۆ ئێران، بەڵام شەش ڕۆژ پێش کاتی هاتنی دەمرێت، ئێستا منداڵەکانی هاتوچۆی ئێران دەکەن. لە خوشکەکەم تەنها یەک کوڕی هەیە، کە ئەویش چەند جارێک سەردانی کردووین. زۆرێک لە خەڵکی ئێران لە دەوروبەری قەفقازن، چارەنووسی ئەویش ئاوها بوو، ئێستا ئەو سێ کەسە کە جلوبەرگی سواڵیان پۆشیبوو، هەرسێکیان مردوون، ئەو سێ کەسە یەکێکیان لە گەنجە بوو، یەکێکیان لە ئۆراڵ، یەکێکیان لە باکۆ، هەواڵ هات کە هەرسێکیان مردوون.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: خەڵکی بەرازجان چۆن خەڵکێک بوون، ژیانیان چۆن بوو؟**

**سەفەرخان:** خەڵکێکی بەدبەخت بوون، لەو بیابانە چۆڵ و گەرمەدا زۆربەیان کاری جووتیارییان دەکرد. ئاو و هەواکەی وشک و گەرم بوو، ئاوەکەیان سوێر و قوڕاو بوو، لە ڕووی سیاسییەوە زۆربەیان سەر بە بەرەی میللی بوون، کاتێک گرووپەکەی مەهدی بازرگان هاتن، ئەوان دەستە دەستە دەهاتن بۆ سەردانیکردنیان، لەسەر ئەو هەموو دەستکورتییەیانەوە دیاریشیان دەهێنا.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: خەڵکی بەرازجان؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، کاتێک مەهدی بازرگان و هاوڕێکانی هاتن ئەوەندە سەردانیکردنیان هەبوو کە نەدەژمێردرا. گرووپ گرووپ دەهاتن، سەد کەس، پەنجا کەس. دواتر پۆلیس قەدەغەی کرد و ڕێگای نەدەدا بێن بۆ زیندان. مەهدی بازرگان خەڵکی ئەو ناوچەیەی دەناسین و ئەوانیش دەهاتن بۆ سەردانیکردنیان. هەڵسوکەوتی برادەرانی میللی لەگەڵ ئێمەدا زۆر باش بوو. مەهدی بازرگان و هاوڕێکانی بەیەکەوە یاریی تۆپی باسکەیان دەکرد، هەر کاتێک مەهدی بازرگان یارییەکی خراپی بکردایە، ئێمە زۆر پێدەکەنین. خۆشی ئەوەندە پێدەکەنی ناچار دادەنیشتە سەر زەوی. یادی بەخێر دکتۆر شەیبانیش کەسێکی زۆر باش بوو. چەندین ڕۆژ لەکاتی عەسردا مەهدی بازرگان وتاری بۆ دەداین، ئێمەش دەچووین دادەنیشتین و گوێمان لە وتەکانی دەگرت.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لە زیندان وتارتان دەدا؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، حکومەت حەقی نەبوو بەسەرمانەوە، پێش ساڵی (١٣٥٠) لە زیندانی قەسریش هەر وەها بوو، ئەو کاتەی کە تۆ هاتیت بۆ زیندان سەردەمی ترس و تۆقاندن بوو، دوو کەس نەیاندەتوانی

بەیەکەوە قسە بکەن، بەڵام لە بەرازجان پۆلیس حەقی بەسەرمانەوە نەبوو، تەنانەت پۆلیس سەردانی ژوورەکانیشی نەدەکردین. هەر پاسەوانێک بۆخۆی نێرگەلەیەکی پێبوو بۆ خۆی لە گۆشەیەکدا دادەنیشت و نێرگەلەی دەکێشا، منیش دەچوومە لایانەوە و چەند قومێکم لە نێرگەلەکە دەدا و قڕان و نیوێکم دەدا بە پاسەوانەکە. تووتن هەرزان بوو، خۆشمان لە حەوشی زینداندا تووتنمان دەچاند.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: بەیانیان کاتێ لە خەو هەڵدەستان بەرنامەتان چی بوو؟**

**سەفەرخان:** بەرنامە بەدەست خۆمان بوو، جگە لە کتێب خوێندنەوە و وەرزشکردن، شتێکی ترمان نەبوو. نە کەسێک سەردانی دەکردین، نە کەسێک هەبوو قسەی لەگەڵدا بکەین. دوای بردنی گرووپی مەهدی بازرگان و ئەفسەرەکان، ئیتر ئەو حەوت هەشت کەسە ماینەوە کە پێشتر باسم کرد.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: پێویستییەکانی وەرزشکردنتان هەبوو؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، پێویستییەکانیان پێدابووین، زیندانییەکانیش چەند شتێکیان لە قوڕ دروستکردبوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: شەوانە هەرکاتێک حەزتان بکردایە دەخەوتن؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، بە ویستی خۆمان بوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ڕادیۆکەی تۆ چەند مەوج بوو؟**

**سەفەرخان:** من بە نهێنی ڕادیۆم هەبوو، ڕادیۆکەم دوو مەوج بوو، بەڵام خۆمان دەمانتوانی دەستکاریی بکەین و هەر مەوجێکمان

بویســتایه دەمانتوانی دروســتی بکەین، بەڵام نەماندەتوانی بە ئاشــکرا ڕادیۆ بەکاربهێنین.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەو ڕادیۆ نهێنییە کێ بۆتۆی هێنا؟**

**سەفەرخان:** سەردانیکارێک زۆر بــە نهێنی بۆی هێنابووە ناو زیندان، کاتێک لە بەرازجانەوە هاتمە قەســر ئــەو ڕادیۆیەم لەگەڵ خۆمدا هێنا، بەشێوەیەکی زۆر زرنگانە هێنام تاکو نەکەوێتە بەردەست پۆلیس. کاتێک ڕەوشی ناو زیندان سەخت بوو، ڕادیۆکەم لەژێر کاشیدا شاردەوە، من دوو دانــە ڕادیۆم لە زیندانی قەســر لەژێر کاشــیدا شــاردووەتەوە. تا ئێستاش هەر لەوێن و هیچ کەسێک پێیان نازانێت، تەنها خۆم دەیزانم.

**عەلــی ئەشــرەف دەروێشــیان: ئەگــەر بکرێــت هــۆکاری دوورخســـتنەوەی ســـەرگوردی تۆپخانە یەدوڵڵای شەهید زەند بۆ بەرازجان و چارەنووسی ئەومان بۆ باس بکەیت.**

**ســـەفەرخان:** چارەنووســی ئەو کارەســاتێک بوو، ئێستاش کاتێک بیرم دێتەوە غەمگین و بێتاقەت دەبم، شەهید زەند سەرگوردی تۆپخانە بــوو، ئەندامی ڕێکخراوی ئەفســەرانی حیزبی تــودەی لقی کرمان بوو، ئــەو لە دادگا حوکمی لەسـێدارەدانی بۆ دەرچــوو. دیارە من ئەوەی لە ماوەی چەند ســاڵدا بیســتوومە ئەوەت بۆ باس دەکــەم. دیارە ئەوەی بیســتوومە لە کەســانی باوەڕپێکراوم بیســتووە، چونکە من لە مانگی ئابانــی (١٣٤٧) لە بەرازجانەوە گواســترامەوە بۆ زیندانی قەســر، ئەو ڕووداوە ترســناکە لە ساڵی (١٣٣٩) ڕووی دابوو. دیارە پێشتر گووتم لەگەڵ شــەهید زەند بەیەکەوە لە زیندانی بەرازجان بووین. دەیانگووت لە هەمان ئەو ســاڵەدا کە لەژێر حوکمی سێدارەدا بوو، ببووە کەسێکی گۆشــەگیر، لە بەرنامەکانی حیزب بەشداریی نەدەکرد، دوای یەک ساڵ لەگەڵ چلوســێ کەسی تردا حوکمەکەی گۆڕا بۆ هەتاهەتایی، کەسێکی زۆر هێمــن و میهرەبان بوو. کەســێکی چــالاک و ڕێکوپێک بوو. دیارە

لەسەر بیروباوەڕی خۆی کەسێکی زۆر توند بوو، هەندێک جار لەو کارەدا زیادەڕەویشی دەکرد، کەسێکی بەبیانوو بوو، تەنانەت لە کار و باری ناوماڵیش بەتایبەتی بەرامبەر بە ژنەکەی کەسێکی وەسواس و بەدبین بوو، لەگەڵ هەموو شتێکدا بەدبین بوو، بەڵام بە ویژدانەوە ژنەکەی کەسێکی وەفادار و بەڕێز بوو. ڕەوشی زیندان ساڵی (١٣٣٩) و تەنانەت دواتریش زۆر باش نەبوو، چەند کەسێک نامەی پەشیمانبوونەوەیان نووسیبوو، ڕۆیشتبوون، وەکو هەندێک لەو کەسانەی کە بە خارکییەکان ناسرابوون، لە دوورخراوەکانی خارک بوون. زیندان دابەش ببوو بەسەر دوو بەشدا، هەندێکیان لایەنگری ئەوان بوون، کە نامەی پەشیمانبوونەوەیان نووسیبوو، هەندێکی تریش بە توندیی دژایەتییان دەکردن، واتە ڕەوشێک هاتە پێش کە نزیک بوو پێکدادانێک ڕوویدات، بەڵام ڕۆشنبیریی ئەفسەرە تودەییەکان ڕێگریی لەو پێکدادانە کرد. ئەو دوو دەستەیە کاتێک بەلای یەکدا تێدەپەڕین تیر و توانجیان لە یەکتری دەدا. بەهەرحاڵ ژمارەیەک دابڕان و نەیانتوانی لە زینداندا بمێننەوە. شەهید زەند لەسەر هەڵوێستی خۆی بەردەوام بوو، لەگەڵ هیچ کەسێک هاوڕێیەتی نەدەکرد، بە هەر کەسێک بگەیشتایە تانەی لێدەدا، بەڵام لەناو زیندانییەکاندا هاوڕێیەکی دڵسۆزی هەبوو کە بەیەکەوە لە یەک ژووردا دەژیان و بەیەکەوە هاوسەفرە نەبوون، ئەو هاوڕێیەی ناوی خەلیلی بوو، سەرگورد خەلیلی.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەگەر ماندوو نیت باسێکی سەرگورد خەلیلیمان بۆ بکە.**

**سەفەرخان:** ئەو سەرگوردی سوپا بوو، ئەندامی ڕێکخراوی سەربازیی حیزبی تودەی ئێران بوو لە لقی تاران، حوکمی لەسێدارەدانی بۆ دەرچووبوو، دوای یەک ساڵ هەروەکو شەهید زەند حوکمەکەی بوو بە هەتاهەتایی. ئەو هەرگیز هیچی نەدەخوێندەوە، زانیاری زۆر کەمی هەبوو، کەسێکی وشک بوو، هەر کەسێکی تازە دەهاتە زیندان، سەردانی

دەکــرد و گەرموگــوڕ بــوو لەگەڵیدا، بــەڵام دواتر ئــەو گەرموگوڕییە نەدەما، زیندانییەکان لەبەر ئەو ڕەفتارە وشک و دووڕووییەی خۆشیان نەدەویست.

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان: ڕووداوی کوشتنی خەلیلی بە دەستی شەهید زەند چۆن بوو؟**

**ســـەفەرخان:** ئەو دوو کەســە هاوڕێی یەکتری بوون، بەو هۆیەوە بنەماڵەکەشــیان لــە دەرەوە ببوونــە دۆســت و هاوڕێــی یەکتــری، بە جۆرێک کە ڕۆژانی سەردانیکردن ژن و منداڵی هەردوو لایان بەیەکەوە دەهاتــن بۆ ســەردانیکردن. خەلیلــی کوڕێکی هەبــوو تەمەنی نزیکەی (١٥) ســاڵ بوو، ئەویش لەگەڵ کەســوکاریدا هاتبوو بۆ سەردانیکردنی باوکی، واتە سەرگورد خەلیلی. ڕۆژێکیان لەکاتی سەردانیکردندا نازانم ئــەو کوڕە چــی جوڵەیەکی کردبــوو، بۆ نموونە لای ژنەکەی شــەهید زەندەوە وەستاوە، شەهید زەند پێی ناخۆش دەبێت. کاتێک دەگەڕێنەوە بــۆ ژوورەکەیان شــەهید زەند بــە خەلیلی دەڵێت: پێویســتە کوڕەکەت ئــاگادار بکەیتەوە، ئاگاداری ڕەفتارەکانی خۆی بێت، خەلیلی کەســێکی تــوڕە و ڕقاویی بوو، لــە وەڵامدا دەڵێت: تۆ کــە ئەوەندە دەمارگیریت، بۆچی کارێکت کردووە کە بێیتە زیندان؟ شەهید زەند ئەو قسەیە لە دڵ دەگرێت و بێدەنگ دەبێت.

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان: ئەو ڕووداوە ساڵی چەند بوو؟**

**ســـەفەرخان:** زســـتانی (١٣٣٩) بوو، کاتی نیوەشــەو دەنگی تەقەی دەرگاکان دێت، هەمووان لە خەو ڕادەپەڕن. ئەوەی ئیسماعیل زولفەقاری بۆ منی باســکرد، ئەوەیە کە شــەهید زەند سەرەتای شــەو (دەمبوڵی) وەرزشکردن دەباتە ژوورەوە و لەژێر نوێنەکانیدا دەیشارێتەوە، کاتێک کە خەلیل دەخەوێت شەهید زەند بۆئەوەی شوێنی دەستی لە دەمبڵەکەدا دەرنەچێــت، بە ڕۆژنامەیەک دەســکی دەمبڵەکە دەگرێت و دەیکێشــێت

بەســەری ئــەو بەدبەختــەدا. کاتێــک زیندانییــەکان بــەدەم دەنگەکەوە دەڕۆن دیارە ئیسماعیل زولفەقاری لە پێش هەموویاندا دەگاتە سەری، کــە ســەیر دەکات خەلیلی لــە بارێکی خراپدایە، تاکــو نیوەڕۆی ڕۆژی دوایی ئەو زیندوو دەبێت، بەڵام بێهۆش دەبێت. دووبارە شــەهید زەند دەبەنەوە بۆ دادگا و بە تۆمەتی کوشــتن حوکمی هەتاهەتایی دەدرێت. ئیتر لەوە بەدوا زیندانییانی سیاســی، بەتایبەتی ئەفســەرە تودەییەکان، نەیانهێشــت شــەهید زەند لــە ژووری ئەواندا بێت. ئەویــان لە زیندانی بەرازجــان هێنایە لای من و دواتر بەڕێ کــرا بۆ زیندانی عادل ئابادی شــیراز، هەمیشــە جێگای تەنهایان بە ئەو دەدا، بۆ نموونە یان کارگەی دارتاشــی، یان شوێنی بەرگدوورین، ئیتر پەیوەندیی بە کەسانی ترەوە پچڕابوو. شــەهید زەند لەگەڵ زۆربەی زیندانییان هەڵسوکەوتی خراپ بوو، دیارە هەر لەســەر بیروباوەڕی خۆی بەردەوام بوو، بەڵام لەگەڵ زیندانییــان زۆر بــاش نەبوو. یەک جار شــەڕی لەگەڵ منــدا کرد، پێی گووتم (شەعبان بێمۆخ)، چونکە ئەویش وەک من حەزی لە پاڵەوانبازیی بوو. لە زیندان ئەگەر خواردنێکی هەبووایە، ئەوا ســیری تێدەکرد، ئەو (٢٥) ساڵ زیندانیی کێشا. دوای کوشتنی خەلیلی، هیچ کەسێک نەدەهات بۆ سەردانیکردنی، ژنەکەی زۆر خۆش دەویست و لەدواییدا تەڵاقیشی دا، هیچ شــتێکی لە هیچ کەسێک قبووڵ نەدەکرد، هەربۆیە ماوەی (٢٥) ســاڵ هیچ میوەیەک نەچووە ســەر دەمی، بێچارەییەکی زۆری کێشــا، زۆر کــەس خــراپ لەگەڵیــدا دەجوڵانەوە، کــە نەدەبووایــە ئەوها بن، دوای شــۆڕش کە ئازاد بوو، دوو مانگ زیاتر لە ژیاندا نەمایەوە و بە شێرپەنجەی خوێن کۆچی دوایی کرد.

ئەفســەرەکان هەوڵــی زۆریــان دا تاکو بــۆ چارەســەر بینێرن بۆ مۆســکۆ، بەڵام درەنگ ببوو، کار لــەکار ترازابوو. لە ژوورەکەی ئەودا هیچ کەســێک بۆی نەبوو جگەرە بکێشــێت، من ماوەیەک لەگەڵ ئەودا لــە یەک ژووردا بووم، باش دەیزانی کە من جگەرەکێشــم، بەڵام لەبەر ڕێــزی ئەو دەهاتمە دەرەوە جگەرەکەم دەکێشــا، ئەو بــە تەنها دەژیا،

هەموو کەسێکی بە خراپ دەزانی، گومانی لە هەموو کەسێک هەبوو، کە لە شـــیراز بووین ژنەکەی و براکەی هاتبوون بۆ سەردانی، هەرچەندم لەگەڵ کرد نەڕۆیشت بۆ لایان، ئیتر ئەوە بوو ژنەکەی تەلاق دا. کاتێک لە بەرازجان بووین ژنەکەی بۆئەوەی لێی نزیکبێتەوە ماڵەکەی هێنابوو بۆ بەرازجان و لەو شـــارە دۆزەخئاسـایەدا دەژیا. شەهید زەند پارەی پێدابـوو تاکو دیـواری ئەو خانووەی گرتوویەتی؛ بـەرز بکاتەوە، تاکو هیچ کەسـێک ژنەکـەی نەبینێت. ئەگەر خەلیلی بەدبەختی نەکوشـتایە، ئەو کەسێکی باش بوو، کەسێکی ئازا و خۆڕاگر بوو، بەڵام بەو کارەی خراپی کرد. کاتێک شــۆڕش ڕوویدا و ویستیان ئازادمان بکەن، بە منی گووت: بینیت هەموو نامەی لێبووردنیان نووسی و خەریکە هەموویان ئازاد دەکرێن، بەڵام من نامەم نەنووسی و ئازاد ناکرێم. منیش گووتم: وا نییـە ئەوەتا هــەزاران کەس ئــازاد دەکرێن، ئایا ئەمانــە هەموویان نامەیان نووســیوە. من ڕۆژێک لە پێش ئەودا ئازادکرام، خۆی گەیاندە لام و گووتــی: تــۆ چۆن ئازادکرایت، دواتر خۆشــی لــەدوای من ئازاد کرا. ئیتر قســەی تری نەکرد، ئەو دوو دۆسیەی هەبوو، ئەگەر شۆڕش نەکرایە هەرگیز ئازاد نەدەکرا و هەتاهەتایە لە زینداندا دەمایەوە، دوای دوو مانگ بە نەخۆشــیی شێرپەنجە کۆچی دوایی کرد، هەوای دەرەوە بۆ ئەو باش نەبوو.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشیان: بەڵام ســـەفەرخان کاتێک من لە بەندی چـــوار زیندانیی بووم، تۆش لە بەندی شـــەش بوویت. لە کاتی پشکنینی ژوورەکاندا هەموو بەندییەکانیان دەکردە حەوشەی بەندی شەش، من لەوێ ئەوم دەبینی، یەکەمجار کە بینیم گووتم: ئەمە چۆن زیندانییەکە، کـــە ملپێچی پێیە، پاڵتۆی پێیە، چاکەت و پانتۆڵـــی لەبەردایە.، قۆندەرەی جوان و بۆیاخکراوی لەپێدایە. بەلامەوە سەیر بوو، ڕووخسارێکی کراوە و سوری هەبوو، بەردەوام دەهات و دەچوو پیاســـەی دەکرد لە ســـەربازێک دەچوو. هەندێک**

**جار ماوەی چەند کاتژمێرێک لە بەندی شەش دەبووم بە بەهانەی پرسینی چەند وشەیەکی ئینگلیزی خۆم دەگەیاندێ و کەمێک قسەم لەگەڵدا دەکرد، ئەو زۆر بە هێمنی قسەی لەگەڵدا دەکردم.**

**ســـەفەرخان:** بەڵێ، کەســێکی هێمن بوو، بەڵام لە دەروونندا شتێکی تر بوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشــیان: لە کاتی کودەتای (٢٨)ی موردادی (١٣٣٢) (١٩٥٣/٨/١٩) تۆ لە کوێ زیندانیی بوویت؟**

**ســـەفەرخان:** لە زیندانی تەبرێز بـــووم، من لێپرســـراوی کۆمیتەی زینــدان بووم، لەلایــەن زیندانییەکانــەوە هەڵبژێردرابــووم. ئێمە لەناو زیندانــدا کۆمیتەیەکمان دروســتکردبوو تایبەت بە کێشــە و کاروباری خۆمان. ئەو کەســانەی کە تازە دەســتگیر دەکــران و دەیانبردنە دادگا و دەیانهێنانەوە لای ئێمە، لەوێ چەند مانگێک دەمانەوە ئێمە قســەمان بۆ دەکردن و هاوکارییمان دەکردن و نەماندەهێشــت تووشــی کێشە و ناڕەحەتــی ببن. لەو پارەیەی لەناو زینداندا هەمانبوو، بەشــی ئەوانمان لێدەدا، ڕۆژانە دوو قران و سێ قرانمان بە هەر یەکێکیان دەدا، ئەوانەی کــە دەهاتــن و هاوکارییمــان دەکــردن، زۆربەیان لاو و منــداڵ بوون، چەقۆکێش و سەرســەرییەکانی ناو زیندان دەیانویســت دەستدرێژییان بکەنــە ســەر، ئێمــەش ڕێگرییمان لێدەکــردن. کاتێک کودەتــای (٢٨)ی مــورداد شکســتی هێنابوو، شــا ڕایکردبوو، ڕۆژێک ژنێــک هاتبوو بۆ سەردانیکردنی زیندانییەک. گووتبووی ئێمە بەرنامەی هەڵاتنی ئێوەمان دانابــوو، بەڵام کودەتــای (٢٨)ی مورداد بەرنامەکەی هەڵوەشــاندەوە. دوای کودەتا شــا هاتەوە و پۆلیس کەوتنە گیانمان، دەســتیان کرد بە لێــدان و دارکاریــی و کەلەپچەکردنمان، بەتایبەت زۆریان لە براکەم دا. ئەو گەنج بوو، ئازا و نەترس بوو، هەرچییەکی بویســتایە دەیکرد. من لە دەرەبەگەکان و شاپەرســتەکان چەند کەسێکم دەناسین، ڕۆیشتم بۆ لایان و داوای هاوکارییم لێکردن تا براکەم زۆر ئازار نەدەن.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: شاپەرست و دەرەبەگەکان بۆچی لە زیندان بوون؟**

**سەفەرخان:** لە دەرەوە خۆپیشاندان و تێکهەڵپڕژان بوو، پۆلیس نەیدەزانی کێ تاوانبارە و کێ تاوانبار نییە، لە هەردوو لای دەستگیرکردبوو. هەندێک لەوانەیان تەنها بۆ ئازاردانی زیندانییانی سیاسی هێنابووە ناو زیندانەوە. ڕەوشەکە زۆر ناخۆش بوو، لە حەوشەی زیندانی گشتیی هەزار کەس بەسەریەکدا کەوتبوون. دوو کەس لە ئێمە مافی ئەوەمان نەبوو بەیەکەوە دابنیشین و قسە بکەین، ئەوەش بەهۆی کودەتاکەوە بوو. لە دەرەوەی زیندان دەنگی هاتوهاوار دەهات، ئێمە لەناو زیندان گوێمان لە هاوار بوو، دەیانگووت دار و دەستەی شا هاتوونەتە ناو زیندانەوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئێوە چۆن لە هەواڵی دەرەوەی زیندان ئاگادار دەبوون؟**

**سەفەرخان:** ڕادیۆمان لابوو، سەردانیکردنیش هەبوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ڕۆژنامەشتان بۆ دەهات؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، ڕۆژنامەمان بۆ دەهات، ڕۆژنامەی نهێنیشمان لابوو، ڕۆژنامەکانی (شەهبازە، بەرەو ئایندە، چەلەنگور) دەگەیشتنە دەستمان. پارەمان بە کەسێک دابوو ئەو شتی بۆ دەکڕین و ڕۆژنامەشی بۆ دەهێناین، کاتێک دەرمانی بۆ دەهێناین و لەناو ژوورەکاندا دابەشی دەکرد، لەناو کارتۆنی دەرماندا کاغەز و نامەی بۆ دەهێناین و دەیدایە دەست من، منیش دەمدا بەو کەسانەی کە دەمناسین، وەڵامەکەشمان دەنووسییەوە و دەماندایەوە دەست هەمان کەس تا بیگەیەنێتە دەرەوە. ئەو کەسەش لەژێر چاودێریی دکتۆرێکدا کاری دەکرد، ئەو خۆی زیندانیی نەبوو، هاوکاری پزیشک بوو.

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان: ڕۆژنامەکان چۆن دەگەیشتن؟**
**سەفەرخان:** هەمان کەس دەیهێنان، لەناو جلەکانیدا دەیشاردنەوە.

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان: لەکاتی ڕاپەڕینی سێی تیری (١٣٣١) (١٩٥٢/٥/٢٤) تۆ لە کام زیندانە بوویت؟**
**سەفەرخان:** من ئەو کات لە زیندانی ئورمیە بووم، (قەوام سەرکار) بوو بە سەرۆک وەزیران و گووتی: لە ئازەربایجان داری سێدارە هەڵدەخەم، هێندەی نەمابوو بەڵێنەکەی خۆی بباتە سەر، بەڵام ڕاپەڕین دەستی پێکرد. لە زیندانـدا پڕوپاگەندەیەکی زۆر دەکرا، زیندانییەکان ئومێدیان زۆر بوو ئازاد بکرێن.

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان: ئایا لە سەردەمی دکتۆر موسەدیقدا لەناو زینداندا گۆڕانکاریی کرا؟**
**سەفەرخان:** زۆر کـرا، وەک پێشتر باسـم کرد من بە لەسێدارەدان حوکم درابووم، لەپڕێکدا نامەیەک هات و گووتیان بە زوویی پارێزەرێک بگـرە، دوای دە ڕۆژ نامەیـەک هـات و گووتیان تـۆ دەنێرین بۆ دادگا و دادگای سـەربازیی نەما، دۆسـیەکەیان ناردم بۆ دادگای گشـتی و منیشیان برد بۆ دادگای تەبریز.

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان: دوای کودەتای (٢٨)ی مورداد کێیان هێنا بۆ زیندانی تەبریز؟**
**سەفەرخان:** زۆر کەسیان هێنا، زیاتر تودەییەکان بوون، ژمارەیەکی تریشـیان هێنـا کە کەسـانی گرنـگ نەبـوون، تەنها ئەوەبـوو کەمێک هەڵسوکەوتیان دژی شا بوو، وەک مەحمود ستالین و قاسم قوزافە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: مەحمود ستالین؟!**

**سەفەرخان:** بەڵـێ، ئەو کەسێکی ناسراو بوو، قاسم قوزافە، مەهدی سـمێڵ، چەند کەسـێکیان لەوانــە هێنابوو. دکتۆرێکیشـیان هێنابوو کە ناوەکەیم بیر نەماوە، ئەوان دوو سێ ساڵ زیاتر نەمانەوە.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشیان: مەحمود ســتالین کێ بوو، ئەگەر بکرێــت لەبارەی ئــەوەوە کەمێکم بۆ باس بکەیــت، بۆچی پێیان دەگووت ستالین؟**

**ســەفەرخان:** ئەو ســمێڵێکی پان و گەورەی هەبوو، ئەوان نزیکەی شەست کەس دەبوون، کەسانی گەورە و بەخۆوە بوون، بە شەقامەکاندا دەڕۆیشتن و خۆیان دەردەخست، تەبرێزییەکان هەریەکە و نازناوێکیان هەیــە. کاتێک ئازادکرام ڕۆیشــتم بۆ تەبرێز و مەحمود ســتالینم بینی، ئەو بێچارەیە پیر ببوو ســمێڵەکانی ســپی ببوون. هەندێک جار پۆلیس ســوودی لێوەردەگرتن بــۆ ئازاردانی زیندانییان. مەشــدی ئیبراهیم و مەشــدی عەســکەر لەوانە بوون کە ئــازاری زیندانییــان دەدا. ئێمە بۆ ڕووبەڕووبوونــەوەی ئــەوان مــاوەی حەوت ڕۆژ مانمــان لە خواردن گــرت، تاکو دواتر ئێمەیان لــە ئەوان جیاکردەوە. ئــەوان هەندێک جار دەڕۆیشتن بۆ ناو شار.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: واتە لە زیندان دەڕۆیشتنە دەرەوە؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، لەگەڵ پۆلیسدا دەڕۆیشتن، پێویستییەکانی خۆیان دەکڕی و دەگەڕانەوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: باشە پۆلیس لە ئەوان نەدەترسا؟**

**سەفەرخان:** ئــەوان پارەیان هەبوو، ڕشوەیان دەدا، پارەیان دەدا بە پۆلیس.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئێوە لەگەڵ گرووپە سیاسییەکانی تر کێشەتان بۆ دروست دەبووا، بۆ نموونە لەگەڵ بەرەی میللی.**
**سەفەرخان:** ئێمە لە زیندانەکانی ئورومیە و تەبرێز بەرەی میللیمان لەگەڵدا نەبوو، ئەوەی هەبوو حیزبی تودە و لایەنگرانی تیپی ئازاربایجان بوون.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: کەواتە تەنها لە زیندانی بەرازجان لەگەڵتاندا بوون؟**
**سەفەرخان:** بەڵێ، لە بەرازجان و تاران.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئایا شەڕ لەنێوان ئەواندا ڕووی دەدا؟**
**سەفەرخان:** کەس لەگەڵ من شەڕی نەکردووە، هەمووان ڕێزی منیان دەگرت، مەهدی بازرگان دەهات و شۆخیی لەگەڵدا دەکردم دەیگووت هاوشارییەکەم. دەیگووت: هاوشاریی، من خەڵکی مەیدانی (قورتم). قورت مەیدانێکە لە تەبرێز. دکتۆر سەحابی پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ مندا هەبوو، ئەوان ڕۆژانە لە تارانەوە سندووقی میوەیان بۆ دەهات، دکتۆر سەحابی میوەی بۆ من دەهێنا، منیش میوەی ئەوانم نەدەخوارد تکای دەکرد بە گریانەوە دەیگووت خێرت دەگا لێمی وەربگرە و بیخۆ. منیش وەرم نەدەگرت.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: بۆچی نەتدەخوارد؟**
**سەفەرخان:** ئەو کاتە نەفسێکی بەرزم هەبوو، بەڵام ئێستا وا نەماوم، ئەوکات ئیرادەم هەبوو، دەمگووت دەبێت بەو جۆرە لە زینداندابم، نەک ئەوەی چاوم لە خەڵکانی تر بێت، یان سوود لە کەسێک ببینم، زۆر کەس پارەیان پێدام و لێم وەرنەگرتن. دەیانگووت وەرە لەگەڵ ئێمە خواردن بخۆ، نەدەڕۆیشتم، تەنها یەک کەس کە ناوی (نیک ئایین)

بوو هەندێک جار لەگەڵ ئەودا دەڕۆیشــتم بۆ نانخواردن، ئەو ئەندامی ڕێکخراوی ســەربازیی بــوو، بە تەنها بوو، هەندێک جــار لەگەڵ ئەودا خواردنم دەخوارد.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ناوی خۆی چی بوو؟**
**سەفەرخان:** ئیســماعیل، ئیســماعیلی نیک ئایــن، بەیەکەوە وێنەمان هەیە، دەتوانیت دواتر ببینی. جارێکیان دوو هێلکە و دوو پەتاتە و یەک باینجانم لەگەڵ خۆم برد تا بەیەکەوە بیخۆین، بەوە زۆر توڕە بوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەویش تودەیی بوو؟**
**سەفەرخان:** بەڵێ، گووتم: لە ڕێکخراوی سەربازیی بوو، سەرگورد بوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشــیان: ئەی بۆچی لەگەڵ ئەفسەرەکاندا ڕێک نەبوو؟**
**سەفەرخان:** ئەخلاقێکی تایبەتی هەبوو، کەسێکی ڕەق و توونـد بوو، ڕووبەڕووی هەموو کەســێک دەوەستایەوە. شێخ و مەلای نەدەناسی، لەگەڵ هەمووان توونـد بوو.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشیان: پاســەوان و چاودێرەکان: لەگەڵ گرووپە جیاوازەکاندا یەک ڕەفتاریان هەبوو، لەگەڵ بەرەی میللی و تودەییەکاندا وەک یەک دەجوولانەوە.**
**ســـەفەرخان:** لە زیندانی بەرازجان لەناو هۆڵەکاندا پاسەوان نەبوو، ئەوان دەڕۆیشتنە حەوشەکە و لەوێ نێرگەلەیان دەکێشا، هیچ کارێکیان بەســەر ئێمەوە نەبوو. گووتم: من دەڕۆیشــتم کەمێک نێرگەلەم لەگەڵ دەکێشــان، من ماوەی یانزە ســاڵ نێرگەلەم کێشا، تووتن هەرزان بوو، ڕۆژانە بایی ســێ شــایی تووتنم دەکڕی. لە سەرەتای هەفتەدا پارەیان

پێدەداین، ماسـییەکم دەکڕی بە دوو قڕان، یان سـێ قڕان، سەروپێ بە پێنج قڕان بوو، هاوبەشم هەبوو بەیەکەوە دەمانکڕی.

**عەلی ئەشرەف دەروێشـیان: ئەو کەسانەی لەگەڵ تۆدا بوون، کەسیان لە بەرامبەر پۆلیسدا هەڵوێستیان نزم بوو؟**

**سـەفەرخان:** بەڵێ، هەبوون، تۆش خۆت بیستووتە، چەند کەسێک هەبوون بە نهێنی کاریان بۆ پۆلیس دەکرد. ژمارەیەکیش بە ئاشکرا.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: مەبەسـتم زیندانی بەرازجانە. لە بەرازجان ئەو جۆرە کەسانە هەبوون؟**

**سـەفەرخان:** لە بەرازجان ئەو جۆرە کەسانە نەبوون، بەڵام دواتر پەیدا بوون، لە تاران ئاخوندێک هەبوو بە ناوی عەبدولڕەزای حیجازی دوای شۆڕش و ئازادبوونمان ڕووتیان کردەوە و جلەکانیان لەبەر دانا، زۆر کەسی ئاوها هەبوون، بەڵام ناویانم بیر نەماوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لەو سەردەمەدا کێ لە هەموو کەس زیاتر لە بەرازجان مایەوە؟**

**سـەفەرخان:** هیچ کەسێک جگە لە ئێمە کە چوار پێنج کەسی تورک و کـورد بووین، هیچ کەسـی تر نەبوو. من و عەزیز یوسـفی و غەنی بلووردیان و جەلیلی گادانی.

**عەلی ئەشرەف دەروێشـیان: بەهۆی توونديی گەرماوە تووشی نەخۆشیی نەدەبوویت؟**

**سـەفەرخان:** مـن تاکو کاتژمێـر (٣)ی دوانیـوەڕۆ لەژێـر پانکەدا دادەنیشـتم، لە کاتژمێر سـێ بەدواوە دەڕۆیشتمە حەوشە و وەرزشم دەکرد، لە ماوەی دوو کاتژمێردا ئارەقە لە گیانم دەچۆڕا، وەرزشـێکی گرانم دەکرد، (١٢٠) کیلۆم هەڵدەگرت، دواتر دەڕۆیشتم بۆ حەمام.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەگەر قسەت نەماوە، لەبارەی زیندانی بەرازجان و پێش ساڵی (١٣٤٧/ ١٩٦٨) پێم باشە بچینە سەر باسی زیندانی قەسر.**

**سەفەرخان:** زۆر حەز دەکەم کەمێک باسی حوسێن قولیخانی گەنجەیی بکەم، ئەو پیاوێکی گەورە بوو، زۆر کاریگەریی لەسەر من هەبوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: هەرچیت پێخۆشە بیڵێ، من حەزدەکەم گوێبیستت بم.**

**سەفەرخان:** حوسێن قولیخان لە گوندی شیشوان لەدایک بووە، واتە هەمان گوندەکەی من، ئەو زەوی نەبوو، هیچ شتێکی نەبوو، لە باخێکدا لەگەڵ باوکی دەژیا، لە سەردەمی لاوێتیدا کەسێکی سەرکێش بوو. لە سەردەمی ڕەزا شادا هەمیشە لەگەڵ ئاغا و دەرەبەگەکانی گوندەکەماندا کێشەی هەبوو، ژمارەیەک لە ئاغاکانی گوندی ئێمە بە خوێنی ئەو تینوو بوون. ڕۆژێک حوسێن قولیخان دەستگیر دەکەن و دەیبەن بۆ زیندانەکانی خۆیان لە ژێرزەمینێک دایدەنێن و تا دەتوانن دارکاریی دەکەن و دوای ماوەیەک ئازادی دەکەن، چەند جارێکی تر دەیگرن و ئازادی دەکەن. ڕۆژێکیان حوسێن قولیخان سەری گەرم دەبێت، ناحەزەکانی کەمێک دەرمانی پێدەدەن، بۆئەوەی سست و بێ توانا بێت و بێن و بیگرن، بەڵام ئەو بەردەوام چەکی پێبوو، لە چایخانەیەکدا دانیشتبوو، پۆلیس بۆی دێن تاکو بیکوژن. ئەو کە پۆلیسەکان دەبینێت ڕادەکات و پۆلیس شوێنی دەکەون و تەقەی لێدەکەن، لەو ناوەدا دوو کەسی بێتاوان دەکوژرێن. یەکێکیان ناوی فەرمان بوو، ئەوی تریان گۆزەکەری گوندەکەمان بوو، ئەو دوو کەسە مردن و هیچ کەسێک نەیتوانی بەرامبەر پۆلیسەکان قسەیەک بکات، یان بڕوات شکات بکات.

حوسێن قولیخان بەردەوام لە ئازەربایجان و کوردستان و

سنووری عێراق و ئێران لە هاتوچۆدا بوو، کەمێک فێری کوردی ببوو، لە کوردستان دۆست و ئاشنای زۆری هەبوو، چونکە لە زیندانەکانی عێراق لەگەڵ زۆر کەس ببوونە هاوڕێ و ناسیاوی یەکتری، بەردەوام لەگەڵ ئەواندا دەڕۆیشت بۆ عێراق شتومەکی دەهێنا، وەک: جلوبەرگ، قوماش و شتی تر... ئەو شتومەکەکانی دەدا بە ئێمە و خۆی نەدەهات بۆ ناوچەکەی خۆمان. لە شوێنێکی دوورەدەست شتەکانی دەدا بە ئێمە و ئێمەش دەمانبردن بۆ تەبرێز و لەوێ دەمانفرۆشتن. لە ساڵی (١٣١٥) (١٩٣٦) بەدواوە بە تەواویی خۆی لە پۆلیس شاردەوە، ڕۆژێکیان سوپای ڕوسیا بە تۆپ و دەبابەوە هاتبوون بۆ گوندەکەی ئێمە، لەشکری سێی تەبرێز هاتبوون و لە گوندەکەی ئێمەدا چەکیان بڵاوکردبووەوە، هەر کەسێک هەر شتێکی دەست بکەوتایە دەیبرد و دەیشاردەوە. لەشکری سێ، تفەنگ و ڕەشاش و تۆپی زۆر هێنابوو، ئەو چەکانەیان جێهێشت و خۆیان هەڵاتن. هەر کەسێک لە خەڵکی گوند و ناوچەکە تفەنگێکیان دەستکەوتایە، هەڵیان دەگرت و دەڕۆیشتن بۆ لای حوسێن قولیخان. نزیکەی دووسەد، یان سێسەد کەس لێی کۆبوونەوە، دوای چەند ڕۆژێک لە کوردستانەوە بەڕێکەوتن و گەیشتنە بناو و مەراغە. لەگەڵ هاتنیاندا چەندین کەسی تر پەیوەندییان پێوەکردن و ژمارەیان بوو بە نزیکەی حەوتسەد کەس. ڕۆژێکیان دەڕۆن بۆ بناو بۆ چەککردنی پۆلیسەکانی ئەوێ. ئێمە کە هەواڵەکەمان زانی ڕۆیشتین بۆ هاوکاریکردنی، ژمارەیەک لە خەڵکی گوندەکەمان چەکدار بوون، بەڵام وەک پێویست هاوکاریی ئەویان نەکرد، چونکە لەنێوان خۆیاندا کێشەیان هەبوو.

ڕۆژێک ژمارەیەک لە ئاغاکانی نەغەدە دێن بۆ بناو و دەچنە ماڵی (سەیف عولەما) تاکو چەک بکرن، ئەوان شەش حەوت ئاغا بوون. حوسێن قولیخان هەواڵی پێدەگات و چەند چەکدارێک دەنێرێت تاکو ئەو ماڵە گەمارۆ بدەن، سەیف عولەما کوڕەکانی لەگەڵدا بوو. شاری بناو لەژێر فەرمانڕەوایی ئەواندا بوو، سەیف عولەما لە قەڵاکەی خۆیدا بوو،

ئەمان لە خوارەوە ئەوانیش لەسەرەوە شەڕە تەقەیان بوو، حەوت کەس لە چەکدارەکانی حوسـێن قولیخان کە لە خوارەوە بوون و هێرشـیان دەبرد، کوژران. یەکێک لە کوژراوەکان ئامۆزای حوسـێن قولیخان بوو ناوی محەمەد بوو، ئەوان سەریان گەرم بوو، لە مردن نەدەترسان، لە پلیکانەکان دەچوونە سەرەوە و گوللەبارانیان دەکردن. کاتێک حوسێن قولیخـان هەواڵەکـە دەزانێت، هێزەکەی دەنێرێتە سـەربانی حەمامەکە کـە لە قەڵاکـەوە نزیک بوو، لە سـەربانی حەمامەکەوە ڕەشاشـەکەی دەخاتـە کار، تەقەیان لێدەکات تاکو تەسـلیم دەبن. واتە دارودەسـتەی سـەیف عولەما تەسـلیم دەبن، کوڕە گەورەکەی سەیف عولەما عەبای ژنـان لـە خۆیەوە دەپێچێـت و ڕادەکات. ئێسـتاش ئـەو دوژمنایەتییە لەنێوان ئەواندا هەر ماوە. حوسـێن قولیخان حەوت کەس لەو ئاغایانە دەگرێـت کـە هاتبوون بۆ چەک کڕین و لە تۆڵەی ئەو حەوت کەسـەی کە کوشتبوویان هەر حەوتیان دەکوژێت، ئیتر چەند ڕۆژێک بناو لەژێر دەسـەڵاتی حوسـێن قولیخانـدا دەبێت و دوای چەنـد ڕۆژێک دەڕوات بەرەو (چارئوسـماخ) و (قوروچای)، کـە ناوچەیەکی گەورەیە و چەند هـەزار ئاوایـی تێدایە و هەمووی بەدەسـت دەرەبەگەکانـەوە بوو. بە هەر شوێنێک دەگەیشـت، ئاغاکانی چەک دەکرد، دواتر ڕۆیشت بەرەو قەرەقاز و ئەوێی کرد بە شـوێنی نیشـتەجێی خۆی. دوای شەش مانگ سـوپا و پۆلیس هاتن و لـە مەراغە جێگیربوون. حوسـێن قولیخانیش دێت بۆ مەراغە. ڕوسەکان دەزانن کە لە تەبرێزەوە سەرباز بەڕێکراون تاکو حوسێن قولیخان دەستگیر بکەن، بۆیە بە زوویی هەواڵی پێدەدەن، بەڵام ئەو ئەوەندە زرنگ دەبێت باوەڕ بە هیچ کەسـێک ناکات، باوەڕی بە ڕوسەکان نەکرد، بەڵام سەربازەکان گەیشتن و شەڕ دەستی پێکرد. سەربازەکان لە ماڵەکاندا سەنگەریان گرت و گەمارۆیان دان، ئەوانیش بە هێرش و هەڵاتن سـواری ئەسـپەکانیان بوون و گەمارۆیان شـکاند و لە مەراغە ڕۆیشـتنە دەرەوە. لە دووریی چوار فرسـەخ لە مەراغەوە ڕوسەکان دێنە سەر ڕێگای و پێشنیاری بۆ دەکەن و دەڵێن وەرە ئێمە

باشــترین چــەک و هەرچییەکی بتەوێت پێتی دەدەیــن و برۆ تەواویان بگــرە و هەمووان چــەک بکە و دەرەبەگەکان تێکبشــکێنە. ڕوســەکان تەواوی ئەو بەڵێنانەی بە ئێمە و بە پیشــەوەریان دابوو، بە ئەویشــیان دابوو، ئەو کاتە هێشتا تیپی ئازەربایجان دروست نەببوو، تەنها حیزبی تودە چالاکی هەبوو، بەڵام موحسین قولیخان باوەڕی بە حیزبی تودە و ڕوسەکان نەبوو، ئەو هەر کاتێک ژمارەی چەکدارەکانی کەمی دەکرد و حکومەت هێرشی بۆ دەهێنا بە زوویی دەڕۆیشت بەرەو لای ڕووباری جەغاتــوی میاندواو، کە بەدەســت کوردەکانەوە بــوو. کوردەکان هەر گرووپێکیان دووســەد، یان سێسەد چەکدار دەبوو، مهابادیش بەدەست عەشــایەری کوردەوە بوو، بەڵام خەڵکیــان ئازار نەدەدا. ئەوکاتە قازی محەمەد پێشــەوایان بوو، دواتر حوســێن قولیخان دەگەڕێتەوە گوندی شیشوان، واتە گوندەکەی ئێمە، دەیەوێت لەوێوە بڕوات دەست بەسەر شــاری ئازەر شەهردا بگرێت، کە حەوت فرسەخ لە تەبرێزەوە دوورە، لــەوێ گوندێک هەیە بە ناوی (شــیرامین) دەڕۆنە ئەو گوندە لە لایەکی گوندەکەوە جەمشــید خانی ئەســفەندیاری بوو، کە تەواوی گوندەکانی (فەرمان فەرماییەکانی) دەســت بەسەردا گرتبوو، چەکدارێکی زۆریشی هەبــوو. نێوانــی میاندواو و مەلەک کەندیش لەژێر دەســتی ئەودا بوو. چەکدارەکانی جەمشیدخان لە میاندواوەوە پۆلیسەکانیش لە تەبرێزەوە دێن لە گوندی شیرامین شەڕێکی سەخت ڕوو دەدات. شیرامین گەمارۆ دەدرێت، بەڵام حوسێن قولیخان بە ئازایەتی خۆی گەمارۆکە دەشکێنێت. یەک کەسی لێ ناکوژرێت و لە گوندەکە دەڕواتە دەرەوە.

دواتر هەندێک لە ئاشــناکانی کە پەیوەندییان بە حوکمەتەوە هەبوو، دێنــە لای و پێــی دەڵێن شــا لێــت دەبووریێت و پلەی بــەرزت پێدەدات وەرە لەنــاو ســوپادا خزمەت بکە، یان لە بەشــی پۆلیــس خزمەت بکە. ئەویــش قبووڵــی دەکات و لە ماڵی مەلەک قاســم ســوێند بــە قورئان دەخــوات کە جارێکــی تر یاخی نابێت و دەڕوات ئــەو ئاغایانەی کە لە حکومەت هەڵگەڕابوونەوە، چەکیان دەکات و لەگەڵ پۆلیســەکان تێکەڵ

دەبێــت و چەکدارەکانیشــی دەبنــە پۆلیس. ڕۆژێک بانگهێشــتی دەکەن بــۆ تەبرێــز و دەڵێن خــۆت و چەکدارەکانــت ســەردانی تەبرێز بکەن بۆ وەرگرتنی مووچەکانتان. کاتێک حوســێن قولیخــان دەگاتە تەبرێز، ســەرهەنگ شــەقاقی لێپرســراوی پۆلیســی تەبرێز بڕیار دەدات کە بە زوویی چواردەوری بگرن و دەســتگیری بکەن. دەســتگیری دەکەن و بەڕێی دەکەن بۆ زیندانی قەســری تاران، پێنج ســاڵ حوکم دەدرێت، لە زیندانی قەســر لەگەڵ چەند کەسێک دەبێتە شەڕیان و هەربۆیە لەوێوە دوانزە زیندانیی دووردەخەنەوە بۆ زیندانی بەندەر عەباس، کە حوسێن قولیخانیش یەکێکە لەوانە.

(زەنگەنە) فەرماندەی لەشــکری چواری ئورومیــە بوو، (کاتوزیان) جێگری بوو، لە ســەردەمی کۆماری ئازەربایجاندا ئەوان هەردووکیان لای ئێمــە دیــل بــوون، چووم بۆ تەبرێز و ڕۆیشــتم بــۆ لای جەنەڕاڵ (کەبیری)و گووتم: بەڵکو کارێک بکەیت ئەو دوانزە کەســەی لە بەندەر عەباس زیندانیین، بەتایبەت باســی حوسێن قولیخانم کرد، بەڵکو لەگەڵ زەنگەنــە و کاتوزیــان ئاڵوگۆڕیان پــێ بکەین، بەداخــەوە ئێمە کەمێک دواکەوتین، کاتێک کۆماری ئازەربایجان تێکشکا و ئاغا و دەرەبەگەکان دەســەڵاتیان گرتەوە دەســت و دادگای ســەردەمی جەنگیان پێکهێنا و حوســێن قولیخانیان هێنایەوە تەبرێز و دادگاییان کرد، لە ماوەی دوو کاتژمێردا هێنایانە بناو و لەوێ لەســێدارەیان دا. من هەرچەندە باســی ئازایەتــی و لێهاتوویــی ئەو پیاوە بکەم، کەمــم گووتووە، ئەو دەیتوانی ئــەو پارانەی دەســتی دەکەوێت بۆ خــۆی بەکاری بهێنێــت و ببێت بە ملیۆنێر، بەڵام کاتێک لەســێدارەیان دا تەنها حەفتا تومەنی لەدوا جێما، کە ئەویش بە قەرز دابووی بە کەسێک.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: گووتت خەڵکی گوندەکەی ئێوە بوو؟**

**ســەفەرخان:** بەڵێ، خزمــی ئێمە بوو، کوڕە پــووری باوکم بوو، لە گوندەکــەی ئێمــەدا ژن و منداڵی هەبوو، کوڕەکەی ئێســتا لە ئورومیە

نیشتەجێیە و نازانم کاری چییە، ژنەکەشی ڕۆیشت بۆ میاندواو لەگەڵ کەسێکی تردا هاوسەرگیریی کردەوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: هاوتەمەنی تۆ بوو؟**
**سەفەرخان:** نەخێر، لە من گەورەتر بوو، هاوتەمەنی زاواکەمان بوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: واتە هاوتەمەنی حەیدەرخانی ئافاقی بوو؟**
**سەفەرخان:** بەڵێ، ئەو کاتە من تەمەنم بیست ساڵ بوو، ئەویش نزیکەی (٣٢) ساڵ بوو، دوانزە ساڵ لە من گەورەتر بوو، هەر کاتێک دەهات بۆ شیشوان زۆربەی کات دەهاتە ماڵی ئێمە. مامێکی لە شیشوان هەبوو نەدەچووە ماڵی ئەوان، لەوە دەترسا پۆلیس مامی دەستگیر بکەن. لە ئازەربایجان کەسێکی زۆر ناسراو بوو، بەڵام هیچ بیروباوەڕێکی سیاسی نەبوو، هیچ شتێکی بۆ خۆی نەدەویست، هەر شتێکی دەستبکەوتایە بەسەر جووتیارانی هەژاردا دابەشی دەکرد. عەمباری گەنمی ئاغاکانی بەتاڵ دەکرد و بەسەر جووتیاراندا دابەشی دەکرد، ئاغاکانیش لە تۆڵەی ئەوەدا بە چەک بەرەوڕووی دەبوونەوە.
حوسێن قولیخان نزیکەی هەزار چەکداری هەبوو، هەموویان کەسانی ئازا و چالاک بوون و سەربازییان کردبوو. کەسانی ئاسایی لەناو ئەواندا نەبوو، هەریەکە و لەسەر کێشەیەک هاتبوو، بۆ نموونە کەسێک ئاغایەکی کوشتبوو ڕایکردبوو، هاتبووە لای ئەو، یان کەسێکی تر لە دەست ئاغا ڕایکردبوو، بەو جۆرە هەموویان لە ئەو کۆببوونەوە و بۆ خۆیان لەشکرێکیان دروستکردبوو.
ڕۆژێک حەوت هەشت کەس لە ئاغاکان لە کۆشکێکی نزیک گوندی (کوقالی) کۆدەبنەوە، حوسێن قولیخان پێیان دەزانێت و دەڕوات دەستگیریان بکات، ئەوانیش کە دەزانن گەمارۆدراون، تەسلیم دەبن و چەکەکانیان دەدەن بە حوسێن قولیخان. حوسێن قولیخان پێیان دەڵێت:

ئێستا بڕۆن بۆ تەبریز و جارێکی تر نەگەڕێنەوە بۆ ئێرە، هەر ئەو ئاغایانە بوون کە ئەویان ڕاکێشایە سەر پەتی سێدارە. سەرەتا ویستیان لە حەمامێکدا بیکوژن، بەڵام حوسێن قولیخان کەسێکی وریا و چالاک بوو، دوو کەسی لە ئەوان کوشت و هەڵات. هەمان ئەو جەمشیدخانەی کە پێشتر باسم کرد، کاتێک ڕاپەڕینی ئازەربایجان دروستبوو هات بۆ تەبریز، نزیکەی (٣٠٠ تا ٤٠٠) چەکداری لەگەڵدا بوو، براکەشی لەگەڵ ئێمەدا بوو، واتە ئەندامی تیپ بوو. چەکی هەڵگرتبوو و هاتبووە لای ئێمە. جەمشیدخان لە هەلێک دەگەڕا تاکو پەیوەندیی بکاتەوە بە حکومەتەوە. کاتێک سوپای شا هاتەوە تەبریز، ئەو بوو بە سەردەستەی ئاژاوەچییەکان. دەیانگووت ڕۆژێک شا ویستوویەتی بەرەو مهاباد بڕوات، لە میاندواو ئەم جەمشیدخانە زۆر بە دەوروبەری شادا دێت و دەچێت. شا دەپرسێت: ئەم سەرهەنگە کێیە؟ دەڵێن ئەمە بۆ ئازادکردنی ئازەربایجان ئەوەندە خەڵکی کوشتووە لەپای ئەو ئازایەتییەیدا ئەو پلەیەیان پێ داوە. ئەویش گۆڕ بەگۆڕ چوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: کاتی ڕاپەڕینی پانزەی خوردادی (١٣٤٢) (١٩٦٣/١/٥) تۆ لە کام زیندان بوویت؟**

**سەفەرخان:** من لە بەرازجان بووم، شا ئینقلابی سپی کردبوو، ئەو دەیویست بە درۆ و ساختەیی وڵات ئاوەدان بکاتەوە، بەڵام سەرکوتکردنی وەحشییانەی عەشیرەتەکانی باشوور، کە سەرکێشییان دەکرد، هەموو وڵاتی هێمن کردەوە. چەند کەسێکی لە خەڵکی ڕاپەڕیو لەسێدارە دا. لە مانگی بەهمەنی (١٣٤١) لە قوم خوێندکارانی خوێندنی زانستی ئایینی (حەوزەی عیلمی) دەستیان کرد بە ڕاپەڕین، ئایەتوڵڵا خومەینی چەند وتارێکی توندوتیژی دا و بەو هۆیەوە دەستگیرکرا. بەهۆی دەستگیرکردنییەوە خەڵکی شارەکانی قوم و شیراز و وارمین و تاران ڕژانە سەر شەقامەکان. شەو ڕادیۆی مۆسکۆمان کردەوە. گووتی: ئەوانە ژمارەیەک بوون لە نەیارانی شا، بەڵام دوایی هەواڵمان

پێگەیشت کە خەڵکانی ڕۆشنبیر و خوێندکاران و تودەییەکان بە گشتی بەشداریی ڕاپەڕینەکە بوون، بەتایبەت خەڵکی وارمین و بە خۆپیشاندان دێـن بەرەو تاران، بەڵام تەقەیان لێ دەکرێـت و زۆربەیان دەکوژرێن. لـە قـوم و تاران و شـیرازیش خەڵکێکـی زۆر کوژران. سـەربازەکان بێبەزەییانە لوولەی چەکەکانیان کردبووە خەڵک و کوشـتبوویانن، بەو جۆرە ڕاپەڕینەکەیان سەرکووت کرد.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: هیچ کەسـێک لەوانەی بەشداریی ڕووداوەکەی پانزەی خوردادیان کرد، لە زیندانی بەرازجان بوون؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، موحسین تاهیری و وەکیلی، دیارە چەند کەسێکی تریـش کـە دوورخرابوونەوە بـۆ بەندەر عەباس و دواتـر هێنایاننەوە بـۆ تـاران، ئەوانیش بە ناوەکانی باقریان، خاقانی، شمشـاو، عەباس و حوسـێن ئەم دووانەیان برابوون، بەردەوام بەیەکەوە شەڕ و هەرایان بـوو، لەگـەڵ خەڵکانـی تریش شـەڕ و هەرایـان بوو. بە حوسـێنیان دەگووت حوسـێن کاردی، تەییب و ئیسماعیل حاجی ڕەزایی لەسێدارە دران، تەییـب پێشـتر لە کەسـانی چەقۆکێش و لایەنگری شـا بوو. لە (٢٨)ی مـوردادی (١٣٣٢) لەگەڵ شـەعبان بێمۆخ کەوتنە سـەر گیانی خۆپیشـاندەران، تەییب دژی حکومەتی موسەدیق بوو، بەڵام لە پانزەی خورداد پشتی میللەتی گرت، هەربۆیە لەسێدارە درا.

**عەلی ئەشـرەف دەروێشـیان: ئەوانەی لە زیندانی بەرازجان لەگەڵتدا بوون، کێت بیردێت؟**

**سـەفەرخان:** زۆر کەسم لەگەڵدا بوو، پێشتر ناوی زۆر کەسم برد، زۆر کەسـی ترم لەگەڵدا بوو، بەڵکو ناویان بێتەوە یادم. یەکێک لەوانە دکتۆر بەنی تەرەقی بوو، کە کتێبی ( ئۆپارین)ی وەرگێڕابوو، ئەو ساڵی (١٣٣٢) خوێندکاری کۆلێژی پزیشـکی بوو، دوای کودەتا دەسـتگیرکرا و سـێ سـاڵ زیندانیی کێشـا، دوای تەواوکردنی ماوەی زیندانییەکەی

ڕۆیشــتەوە بۆ زانکۆ تاکو خوێندنەکەی تەواو بکات، لە کاتی خوێندندا گرووپێکی لە خۆی کۆکردەوە. ساڵی (١٣٣٨) دووبارە دەستگیرکرایەوە و بە پانزە ساڵ زیندانیی حوکم درا. ساڵی (١٣٥٣) ئازادکرا. ئەو کەسێکی زۆر بــاش بوو، لە زیندانــی بەرازجان لەگەڵ ئێمەدا بوو، دکتۆری ئێمە بوو، کەســێکی ڕۆشــنبیر و وردبیــن بوو، دکتــۆری زیندانەکە بوو، لە تــەواوی کارەکانی ناو زیندان بەشــداریی دەکرد، کەســێکی هۆشــیار و ڕۆشــنبیر بوو، بەڵام لە ڕووخســـار و هەڵســوکەوتدا لە کرێکارێکی زەحمەتکێش دەچوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: سەر بە کام گرووپ بوو؟**

**ســـەفەرخان:** خــۆی گرووپێکــی دروســتکردبوو، بەینــی لەگــەڵ تودەییەکان زۆر باش بوو، بەڵام ســەر بە تودە نەبوو، لەســـەر هەمان ڕێبازی تودەییەکان بوو.

## ده ساڵەی سێیەمی زیندان (١٣٤٧– ١٣٥٧)

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ساڵی چەند لە زیندانی بەرازجانەوە گواسترایتەوە بۆ زیندانی تاران؟**

**سەفەرخان:** پاییز بوو، مانگی ئابانی (١٣٤٧) بوو، من و غەنی بلوریان و عەزیز یوسفی و حەمیدخام نەریمانی و بەدرەدین مەدەنی بووین، پێشتر حیکمەتجۆ نێردرابوو بۆ شیراز، دوایی بردیانەوە بۆ تاران. ئێمەیان سواری پاس کرد و ژمارەیەکی زۆر پۆلیس و ئەفسەرێکیان لەگەڵ ناردین، هەموومان کەلەپچەکرابووین، لەو ڕێگا دوورەدا بەدرەدین مەدەنی و نەریمانی خراپ نەخۆشکەوتن، بە درێژایی ڕێگا چەند جارێک گیانیان کەوتە مەترسییەوە، هەر چۆنێک بێت گەیشتینە تاران و بردیانینە زیندانی ژمارە چواری قەسر. لەگەڵ گەیشتنمان ئێمەیان کردە ڕاڕەوەکەوە، چەند کەسێک لە هاوڕێیانی ڕێکخراوی سەربازیی و چەند کەسێکی مەزهەبی لەمبەر و ئەوبەری ڕاڕەوەکە وەستابوون و ئەملاولای یەکتریمان ماچ کرد. ئەو ڕاڕەوە پڕ بوو لە زیندانییانی ڕۆحانی و هاوڕێیانی خۆمان، شەو هەمووومان لە دەوری یەکتری کۆبووینەوە. مەزهەبییەکان خواردنیان هێنا و هەموو بەیەکەوە خواردمان، لەناو مەزهەبییەکاندا؛ ئایەتوڵڵا ڕەبانی شیرازی و ئایەتوڵڵا تاڵەقانی و دیارە مەهدی بازرگان و دکتۆر سەحابیش لەوێ بوون، ئەم دووانەیان دوای یەک مانگ حوکمەکەیان تەواوکرد و ئازادبوون. چەند کەسێکی تریش بە لێبووردنی گشتی ئازادکران. هەر ئەو شەوەی کە ئێمە گەیشتینە زیندانی قەسر لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەی ئەوێ نێوانمان زۆر خۆش بوو، ڕێزێکی زۆریان لێگرتین و زۆریان خزمەت کردین، ئیتر ڕزگارمان بوو لەو دۆزەخەی بەرازجان.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ڕەوشی زیندانی ژمارە چواری قەسر چۆن بوو؟**

**سەفەرخان:** ژمـارە چوار حەوشـێکی گەورەی هەبوو، حەوزێک لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا بوو، چەند دار توویەک بە دەوری حەوزەکەدا بوون، کە لە دەرگاکەوە دەچوویتە ژوورەوە دەگەیشـتی بە ڕاڕەوێکی تەسـک، کە بە گشـتی حەوت ژوور لەسـەر ئەو ڕاڕەوە هەبوو، سـێ ژووریان زۆر گەورە بوون و چوار ژووریان بچووک بوون، ژوورەکان پەنجەرەی گەورەیان تێدابوو و ڕوویان لە حەوشـەکە بوو، لە پشـتی هـەر ژوورێکـدا هەیوانێک هەبـوو، لە لای خوارەوەی حـەوزە ئاوەکە کەپرێکیان دروسـتکردبوو، کە بە توڵی دارمێو داپۆشرابوو. ئەو کاتەی ئێمە گەیشـتین؛ ژمـارە چـوار زیندانییەکی زۆری تێدابـوو. لە حیزبی میللی ئیسـلامی کازم بەجنەوەردی و ئەبوقاسـمی سـەرحەدی زادە و حوجەتی کرمانی. لە لیژنەی موئتەلیفیش ژمارەیەک هەبوو. لە زیندانییە کۆنەکانیش دکتۆر بەنی تەرەفی، ئاغا زادە، شـەیری، ڕەحیم بەغدادی، مەجید ئەمین-ی لێبوو. پێویسـتییەکانی وەرزشـکردن و کتێب هەبوو، ڕەوشـەکە خـراپ نەبـوو، ئێمە خواردنـی وشـک و ئامادەنەکراویان پێدەداین، خۆمان خواردنمان ئامادە دەکرد، گۆشـتیان بەجیا پێدەداین. چاودێریی و ئامادەکردنی خواردنەکەمان بە حاجی عێراقی سـپاردبوو، بۆ نموونە ئێمە خۆمان برنج و نیسـک و نۆکمان پاک دەکرد، تەنانەت سـەوزەش خۆمان چاکمان دەکرد و دەمانبردن بۆ شـوێنی چێشتلێنان و لـەوێ ئامادە دەکـرا. برادەرانی لیژنەی موئتەلیفـە و حاجی عێراقی کەسـانی زۆر باش بـوون، حاجی عێراقـی: زمانێکـی تایبەتی هەبوو، زمانـزان و قسـەزان بوو، ئەو گرووپـە جگە لە یەکێکیـان، ئەوانی تر کەسانی باش بوون.

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان: ئەو کەسە کێ بوو؟**

**ســەفەرخان:** کەســێک بوو زیندانییەکان پێیان دەگووت قەلەڕەش، دەڵێن ئێستا لە وڵاتی کەنەدایە و بازرگانی دەکات و ئۆتۆمبێلی دوایین مۆدێلی هەیە. ئاغای ئەنواریش کەســێکی بەڕێز و خۆشەویســت بوو، ئەو هیچ کاتێک عەمامەکەی ســەری دانەدەگــرت، ڕۆحانییەکانی تر کە دەهاتن عەمامەکەیان پــێ فڕێدەدان و جلوبەرگی تایبەتی زیندانیان پێ لەبەردەکــردن، بەڵام لەگەڵ حاجی ئەنواری وا نەبوون، ناڵێم کەســێک بوو ســەر بە حکومەت بووە، بەڵام ڕێزیان لێدەگرت. ئەوانە هەموویان ڕەفتاریان باش بوو، کەسانی باش بوون، چوار کەسیان، واتە بوخرایی و ســێ کەســی تریــان لەســێدارە دران، بــەڵام یەکێکیــان خۆڕاگــر و بەرگریکار بوو، لەکاتی بەرپابوونی شۆڕش ئازادکرا، ئەو ناوی حاجی عەباسی مودەڕیسی بوو.

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان: من لە زیندانی کرماشان ئەو حاجی عەباســەم بینیبوو، دوورخرابووەوە بۆ کرماشــان، بەیەکەوە لە یەک ژووردا بووین، بەڵام بەڕاســتی کەسێکی ئازا و قارەمان بوو، حوکمی هەتاهەتایی درابوو.**

**سەفەرخان:** بەڵێ، ئەو کەسێکی ئازا و خۆڕاگر بوو، ئەوان بە گشتی هەڵوێســتیان لەگــەڵ ئێمەدا زۆر باش بوو، ئێمەیــان بە گڵاو نەدەزانی، قسە و بووختانیان بۆ هەڵنەدەبەستین، بێڕێزییان پێ نەدەکردین. شتێکت پێ دەڵێم، دیارە من خۆم ئەمەم نەبینیوە، بەڵام زیندانییەکانی تر بۆیان باســکردووم. یەکێک لــەو مەزهەبییانە دەچێت بــۆ لای ئاغای تاڵەقانی و پێــی دەڵێــت: (ئێمە کە لەگەڵ ئەمانەدا هەڵســان و دانیشــتن دەکەین و خواردنیــان لەگەڵــدا دەخۆین، زیانی هەیە، یان نــا. ئاغای تاڵەقانیش دەڵێت ئێوە بەهەشــتتان هەیە و لەبەر خاتری بەهەشت خەبات دەکەن، بەڵام ئەم بەدبەختانە هیچ شتێکیان نییە و دەبێت ڕێزیان لێ بگرین) من ئەمەم لە زمانی زیندانییانی ترەوە بیست، کە گووتی: ماڵ و پێنج یەکی

زەکاتی ئەمانە دەگاتە دەستی ئێمە. تەنانەت گووتیشی ئەگەر ئەمانە لەپێناو ئازادییدا بکوژرێن، ئەوا دەچنە خانەی شەهیدەوە. من بە گوێی خۆم ئەوەم لێ بیستوون، کەچی ئێستا دەیانەوێت گوللەبارانمان بکەن. من لە زیندان بەردەوام بە نهێنی ڕادیۆم لابوو، ئایەتوڵڵا مونتەزیری دەهاتە سەر سفرەی ئێمە، ئێمەش دەچووینە سەر سفرەی ئەوان، هیچ قسەیەکیان نەبوو لەبارەی گڵاوبوونی ئێمەوە، هاتوچۆیەکی دۆستانەمان هەبوو. لەگەڵ ئاتوڵڵا شیرازی لە یەک ژووردا بووین و زۆر هاوڕێی یەکتری بووین، مەهدی کوڕی ئێستاش جار جارێک سەردانیم دەکات. سێ ساڵ لەگەڵ ئاغای تاڵەقانی بەیەکەوە بووین، لەم دواییانەدا تووشی نەخۆشیی شەکرە بوو لە نەخۆشخانە کەوت. حاجی ئەمانیش کەسێکی بێدەنگ و بەڕێز بوو، براکەشی لەسێدارە درا، ئێستا وابزانم بێ کارە. هاشمی ڕەفسنجانیش لە زیندانی ئەوین بوو، کە سەردانیکردنیان دەهاتن، دەیانبردن بۆ لای سەردانیکەران، ئەو و مونتەزیری و تاڵەقانیم زۆر دەبینی. جارێکیان لە زیندانی ئەوین ئایەتوڵڵا مونتەزیری گووتی: تۆ لێرە چی دەکەیت؟ منیش گووتم: ئێرە ماڵی خۆمانە. ئەو کەسێکی قسەخۆش و شۆخیباز بوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: واتە لەسەر دەستی مەزهەبی و چەپەکان، ڕەوشی زیندان ڕێکخرابوو؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، کاتێک ئامادەکردنی خواردن کەوتە ژێر دەستی حاجی عێراقی و زیندانییە هەڵبژێردراوەکانی تر، ئێمە ڕزگارمان بوو لە دەنگەدەنگی پۆلیس. کاتی سەردانیکردنیش زۆر باش و بێ کێشە بوو. زیندانییەکان هەفتەی دوو جار سەردانیکردنیان هەبوو، خۆمان کەسێکمان کردبوو بە لێپرسراوی ڕێکخستنی سەردانی کەرەکان، وابزانم ئەویش ڕەزای شەلتوکی بوو. تاکو کۆتایی ساڵی (١٣٤٨)، کە من لە بەندی چواری زیندانی قەسر بووم تا ڕادەیەک ئارامیی هەبوو. گرووپی بێژەن جەزەنی کە پێشتر دەستگیرکرابوون، ڕۆیشتبوون

بـۆ دادگا، ئەوانیـش بەرگرییەکـی باشـیان لە خۆیان کردبـوو، بێژەن بــە یانزە ســاڵ زیندانی و ئەوانــی تریش بە دە ســاڵ حوکم درابوون. بەیانییەک بە دەنگەدەنگ لە خەو ڕاپەڕیم، سەیرم کرد سەربانی زیندان پـڕ بووە لە ســەربازانی چەکـدار و بە ڕق و کینەوە ســەیری ئێمەیان دەکـرد. بەڵێ، پۆلیس هێرشــی کردبووە ســەر بەندی ســێ و بێژەنی جەزەنــی، هەرچی برنج و نۆک و نیســک و جلوبــەرگ و کتێب هەبوو هەموویان بەســەر یەکدا دابوو، بە پێلەقە کەوتبوونە ســەر ئەو شتانە، دوای یــەک کاتژمێـر چاوەڕوانــی هەواڵیــان هێنا کە گرووپــی بێژەن جەزەنی ویســتوویانە لە بەندی سێوە ڕابکەن، واتە چوار کەس، لەوانە: مەســعوفی کەلانتــەری و محەمەدی چوپانزادە و عەزیزی ســەرمەدی و ســورکی. ئەوان شــەو لە حەوشــەکەدا خۆیان دەشــارنەوە و ناچنە ژوورەکانی خۆیانەوە. توانیبوویان لە پارچەی جلەکانیان و شــەبەکەی یاریکردنی تۆپی باسکە، تەنافێک دروست بکەن و لە گۆشەی حەوشەی بەندی ســێ، کە لە شێوەی سێگۆشەیە، سەرکەونە سەرەوە. ڕووناکی گڵۆپەکان ســەر دیوارەکــەی ڕووناک کردبووەوە، بــە ماندووبوون و سکەخشــکێ خۆیان دەگەیەننە ســەر دیواری باخەکە، لەوێوە تەنافەکە شۆڕدەکەنەوە، دواتر خۆیان بە تەنافەکەدا شۆڕدەکەنەوە بۆ خوارەوە، لەو کاتەدا پاســەوانێک لە دوورەوە دەردەکەوێت. محەمەدی چوپانزادە تازە گەیشــتبووە سەر زەوی، کە پاسەوان تێی دەخوڕێت و دەڵێت: تۆ کێیت نەجوڵێیت. بە زوویی پاســەوان و پۆلیســەکان دەگەنە سەریان و دەســتگیریان دەکەنەوە. ســەرمەدی و سورەکی هێشــتا لە سەربانەکە مابوونەوە و نەچوبوونە خوارەوە. دوای ئەم ڕووداوە پۆلیس دەڕژێنە ناو زیندانییانی سیاســی و ئاســایی، بە شــەق و بە دار تێیان دەکەون، بــە بچووکترین بەهانە زیندانییەکانیان پەلبەســت دەکـرد و دەیانبردن بۆ ژووری تاکەکەســی. بۆ بەیانییەکەی پۆلیس هەڵیکوتایە سەر بەندی سێ و دەستیان کرد بە پشکنینی ژوور و کەلوپەلی زیندانییان و دواتر پشکنین لە تەواوی بەندەکاندا کرا.

ئەو ســەردەمە لە زیندانی قەســردا زیاتر لە (١٢٠) زیندانیی تودەیی هەبــوو، کە لەناو ئەوانــدا زیندانییانی کۆن هەبوو، وەک: (ئیســماعیلی زولقەدر، ئەبوتورابی باقر زادە، ڕەزای شــەلتوکی، عەباسی حەجەری، تەقی کەیمونی، عەلی حەمودی و زەحتاب).

**عەلی ئەشرەف دەروێشــیان: لە جەژنەکانی یادی دوو هەزار و پێنجسەدساڵەی شاهەنشــایی لە زینداندا؛ ڕووبەڕووی هیچ دژە کردارێک بوونەوە؟**

**سەفەرخان:** لە ساڵی (١٣٥٠)دا بە فەرمانی شا یادەوەریی کرایەوە، لەکاتێکدا کە گەلی ئێران لە بەدبەختی و کوللەمەرگی و نەخوێندەوارییدا بوون، زۆربەی گوند و شــارەکان کارەبایان نەبوو. محەمەد ڕەزا شــا و حکومــەت بۆ ئەو یادە کە بە مەینەتی ملیۆنەها کەســی زەحمەتکێش بەرپاکــرا، ســێ ملیۆن و نیــو گڵۆپــی جوانکاریی لە وڵاتانــی دەرەوە هاوردە کرد، تەنها لە فەڕەنســا هەزار کەسی جەواهێر ساز و سێسەد چێشتلێنەری هێنابوو، لەکاتێکدا لەو سەردەمەدا ئێران حەوتسەد ملیۆن دۆلار قــەرزاری وڵاتــان بوو، بەڵام (٣٠٣) ملیــۆن دۆلاری بۆ ئەو یادە خەرجکــرد. هەموو گرووپەکانی ناو زیندان لەو ڕەوشــە توڕە و بێزار بــوون، هەندێک زیندانیی شکســتخواردوو و دابڕاو و ســیخوڕیش کە هەوڵی ئازادییان دەدا دژی ئەو هەموو خەرجییەی شا بوون.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لەو ســەردەمەدا کام گرووپانە لە زیندان بوون؟**

**سەفەرخان:** جۆرەها گرووپ هەبوو، وەکو چریک فیداییەکانی خەلق، موجاهیدینــی خەلق، ئارمانی خەلق، گرووپی فەلەســتینی، ئەســتێرەی ســور، تۆفان، ســاکا، گرووپی ئەبازەڕ، حیزبی میللی ئیسلامی، لیژنەی موئتەلیفــە و زۆر گرووپــی تــر. مــن دژی هەمــوو یــادەکان بووم بە مەزهەبی و نامەزهەبییەوە. هەر یەکێک لەو گرووپانە هەوڵیان دەدا ئەو

زیندانییانەی تازە دەهاتن، ڕایانکێشن بۆ ناو گرووپەکانی خۆیان، بەڵام فیداییانــی خەلق و موجاهدیــن لە هەموویان کاریگەرتــر بوون، ئەوان بــەردەوام لە گفتوگۆ و لێکۆڵینەوەدا بوون. بێژەنی جەزەنی کە پێشــتر دوورخرابــووەوە بۆ زیندانی قوم و تــازە گەڕاندبوویانەوە بۆ زیندانی قەسر، زیاتر دەهاتە لای من، ئەو قسەکانی ئەوەبوو دەیگووت: من زۆر دەمێکــە لەگەڵ حیزبدا ئاشــنام (ئەو باوکی تودەیی بوو، ســاڵی ١٣٢٥ ڕۆیشتبوو بۆ ڕوسیا و لە کۆتایی ساڵەکانی ١٣٤٠دا بە پاشگەزبوونەوە گەڕابووەوە)، ئەو دەیگووت: ئێوە باش دەزانن ماوەی بیستوپێنج ساڵە شــا بە هەموو تواناکانی خۆیەوە دژی حیزبەکەمان وەستاوەتەوە، من ئەگــەر بە ناوی حیزبەوە لەگەڵ ئەم لاوانەدا قســە بکــەم ئەوا ناتوانم، بۆیە واباشــترە باســی ئەزموونــی ڕابردووی حیزبیان بــۆ بکەم، تاکو ڕێگایان نیشــان بدەم بۆ خۆڕاگریی و بەرگرییکردن، بۆئەوەی نەکەونە ئــەو داوەوە کە حیزبی تێکەوتووە. بێژەنی جەزەنی زۆر حەزی دەکرد لەگەڵ کەســانی ســەر بە جوڵانەوەی تیپــی دیموکراتــی ئازەربایجان ئاشنا بێت و شارەزایی لەبارەیانەوە هەبێت، من هەرچیم لەو بارەیەوە دەزانی بۆم باسکردبوو. بێژەنی جەزەنی کەسێکی باش بوو، کاریگەریی لەســەر زیندانییــەکان هەبوو، کەســێکی تیــۆری بــوو، خوێندەوارێکی بــاش بوو، هەمــوو کەس گوێی لە قســەکانی دەگرت. مــن زۆر مەیلم بــە لای ئەودا هەبوو، بەردەوام خەریکی نووســین بوو، چەندین کتێبی نووســی. مێژووی ســی ســاڵە و کتێبەکانی تری لە زینداندا نووســی، ئەو بــەردەوام لەم زیندانــەوە بۆ ئەو زینــدان دەگوازرایەوە. زۆربەی کات لەکاتی پشــکنیندا پۆلیس دەســتی بەسەر نووسینەکانیدا دەگرت و لەنــاوی دەبردن، بەردەوام زیندانییەکانی لە دەوری خۆی کۆدەکردەوە و وانەی پێ دەگووتن، هەر زیندانییەک لە شارەکانی ترەوە دەهات، بە زوویی بەرنامەی بۆ دادەنا، بۆ نموونە فەرزینی ناجی، کە هاوشاری تۆ بوو، بێژەنی جەزەنی ســەرنجی لەسەری هەبوو. ئەو بەرنامەڕێژیی بۆ هەموو زیندانییان دەکرد، بۆئەوەی لەدوای ئازادبوونیان لە دەرەوە چی

بکـەن و چی نەکـەن، بەتایبەت ئەو زیندانییانەی کە ئازادبوونیان نزیک ببووەوە، ڕێنمایی دەکردن کە چی بکەن.

**عەلی ئەشـرەف دەروێشـیان: پەیوەندیی ئەو لەگەڵ پۆلیسدا چۆن بوو، پۆلیس چ بەرکەوتنێکی لەگەڵیدا هەبوو؟**

**سەفەرخان:** پۆلیـس حەقی نەبوو بەسەرییەوە، جارێکیان پۆلیسێک لە کونی دەرگاکەوە سـەیری کردبوو. هەڵسابوو لە پۆلیسەکەی دابوو. پۆلیـس کاری بەسـەرییەوە نەبـوو، نەیاندەتوانی سـەر بخەنە سـەر زیندانییـان، بـەڵام بەهۆی ئـەو ڕووداوەوە. ژمارەیەکیـان بردبوو بۆ ژووری تاکەکەسی، کە لێیان دابوون، گووتبوویان تاکو نەڵێن هەڵەمان کرد وازتان لێ ناهێنین، ئەوەندەیان لێدابوون تاکو بێهۆشیان کردبوون. هەندێکیان گووتبوویـان هەڵەمان کرد، بەڵام هەندێکیان نەیانگووت. بۆ نموونە زۆریان لە موسـای خیابانی دا، بەڵام ئەو هەر نەیگووت هەڵەم کـرد. ئێمە لە پشـتی دەرگاکەوە گوێمان لە وتووێژیـان بوو، نوێنەری ئێمە و پۆلیسـەکان سـەعیدی خاڵی بێژەن جەزەنی بوو، ئەو کەسێکی زۆر بەڕێز بوو، زۆریشیان لە ئەو دا، بەڵام هیچی نەگووت.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ساڵی (١٣٥٤/ ١٩٧٥) کاتێک زانیتان ئەوان لەسێدارەدراون لە زینداندا، کاردانەوەتـان چی بوو؟**

**سـەفەرخان:** کات ئێـوارە بـوو، ڕۆژنامەیان بـۆ هێنایـن، زیندان سەراسـەر بوو بە ماتەم، زیندانییەکان هەموو کەوتنە مقۆمقۆ، کە چی بکەین و چی نەکەین، نەیانتوانی هیچ بڕیارێک بدەن. سەرهەنگ زەمانی چەند زیندانییەکی بانگکرد بۆ نووسینگەی خۆی، لەوێ پێی گووتن من ئـەم زیندانە دەکەم بە زیندانێکی سـەربازیی. ئەوانە ویسـتیان ڕابکەن هەربۆیە کوشـتمانن، هـەر زیندانییەکیش هەوڵی ڕاکـردن بدات، خۆم فەرمانی سـەرکوتکردنم لایە. ئێمە هیچ کارێکمان لەدەست نەدەهات، لە بەندی یەک و دوو و سـێ چەند هاوارێک هات و دواتر بێدەنگ بوون،

چەنــد زیندانییەکیان برد و دواتر بێدەنگیان کردن. ئێمە نەمانتوانی هیچ بکەین تەنها چەند خولەکێک بێدەنگ بووین.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشــیان: لەبارەی موجاهیدەکانەوە هیچ یادەوەرییەکت لایە؟**

**سەفەرخان:** من زۆر لە مەسعود ڕەجەویەوە نزیک بووم، بەردەوام دەردەدڵی خۆی لای من دەکرد، کەمێک حەســودیی بە بێژەنی جەزەنی دەبرد، هەندێک جاریش زەمی دەکرد و دەیگووت: ئەو (ماوییەکان) هان دەدات، ئاخر ئەوان هەموویان لە زینداندا لە یەک گرووپدا کۆببوونەوە و بــەردەوام بەیەکەوە کۆبوونەوەیــان هەبوو. دواتر دەهاتە لای من و دەیگووت: بێژەن ئەوای کرد و بێژەن ئەمای کرد. بۆ نموونە دەهاتە لام و دەیگووت: ئەو زیندانییەکان لە دژی من هان دەدات، بەڵام ڕووبەڕوو بەیەکەوە زۆر ئاســایی قسەیان دەکرد و هاوڕێی گیانی بەگیانی بوون. مەســعود ڕەجەوی کەسێکی سیاسی و سیاســەتمەدار بوو، کارەکانی خــۆی هەمــوو بە نهێنــی دەکرد، بە ئاشــکرا هیــچ کارێکــی نەدەکرد، بــەڵام بێژەنی جەزەنی ڕێک و ڕاســت کارەکانی دەکــرد. گرووپەکەی مەســعود ڕەجەوی یانزە کەس بوون، کە نۆ کەســیان لەسێدارە دران مەســعود ڕەجــەوی و بەهمەن بــازرگان حوکمی لەســێدارەدانەکەیان بــۆ کــرا بە حوکمــی هەتاهەتایی. کاتێــک من لە زیندانــی ئەوین بووم؛ مەســعود ڕەجەوی بە منی دەگووت: ســەفەرخان بە ئەوانە بڵێ کە لە ئێمە جیابوونەتەوە و هێڵێکی تریان گرتووە، ئیتر بە خۆیان نەڵێن ئێمە موجاهیدینیــن، بــا بڵێن ئێمە مارکســین و خۆیان تێکەڵــی ئێمە نەکەن. مەسعود ڕەجەوی حەپی ڤالیۆمی پێ دەدام تاکو شەوانە بتوانم بخەوم، ئەویش سەرئێشــەی هەبوو، بەردەوام ئازاری سەری هەبوو، هەمیشە پارچەقوماشــێکی بەســەرییەوە دەبەست، بەڵام کەســێکی زرنگ بوو، کەسێکی کاریگەر بوو، دەیتوانی هەمووان کۆبکاتەوە و چۆنی بییەوێت ئەوها لەگەڵیاندا بدوێت. ئەوان هەموویان نوێژیان دەکرد، بەیانیان زوو

له خەو هەڵدەستان و دەیانکردە دەنگە دەنگ و دەستنوێژیان دەشوری، پۆلیســەکان دەیانگووت: بۆچی بەیانیان زوو هەڵدەستن و دەنگە دەنگ دەکەن. ئەوانیش دەیانگووت: ئێمە دەمانەوێت زوو هەڵسین و دەستنوێژ بگریــن. دیارە دەنگە دەنگی پۆلیســەکان لە دەنگــە دەنگی ئەوان زیاتر بوو. پۆلیس دەیانویست بەو دەنگە دەنگەیان کێشە لەنێوان چەپەکان و مەزهەبییەکان دروســت بکەن، بــەڵام زیندانییەکان زرنگ بوون، لەگەڵ یەکتریــدا زۆر بــاش بــوون. هیچ کاتێــک موجاهیدیــن و چریکەکان لە بەرامبەر یەکتریدا تووشی هەڵە و ناخۆشی نەبوون.

**عەلی ئەشرەف دەروێشــیان: ئەگەر بکرێت لەبارەی سیرویسی نەهاوەندی شتێکمان بۆ باس بکەیت.**

**سەفەرخان:** سیرویسی نەهاوەندی کەسێکی خائین و خوێڕیی بوو، خیانەتــی لــە هاوڕێکانی کرد، تاکــو لە زینداندا بوو چریــک فیداییەکان مۆڵەتیان نەدەدا لە گەڵیاندا لە گرووپی زیندان بێت. ڕۆژێکیان کامەرانی ڕوفیمی، کە خۆی و براکەی لەسەر پەیوەندیی بە گرووپەکەی سیرویسی نەهاوەنــدی دەســتگیرکرابوون، هاتــە لای من و گووتی: ســەفەرخان نهێنییەک هەیە دەمەوێت بە تۆی بڵێم، بەڵام ئەگەر ساواک پێ بزانن بە دڵنیاییــەوە دەمکوژن. منیش گووتم: چی هەیــە بیڵێ؟ دڵنیابە کەس لێم نابیستێت. ئەویش گووتی: ساواک کارئاسانی بۆ سیرویسی نەهاوەندی کردووە تاکو لە زیندان ڕابکات و لە دەرەوە پەیوەندیی بکات بە کەسانی دژی ڕژێم. دیاربوو قسەکانی ڕاست بوو، چونکە من ماوەی یەک مانگ بەهۆی نەخۆشــییەوە لە نەخۆشخانەی سوپا مابوومەوە، زۆرم بیر لە هەڵاتن کردەوە، شوێنەکە وابوو کە هیچ کەسێک بە ئاسانی نەیدەتوانی ڕابکات. هەڵاتنی سیرویســی نەهاوەندی ســاختە و بەرنامەی ســاواک بوو. ئەمجارەش ســاواک هەروەکو ڕەوتی ئیسلامی واتە عەباس عەلی شەهریاری، دەستی کردەوە بە فێڵ و تەڵەکەبازیی. ژمارەیەک لە لاوانی تێکۆشــەری بەســۆز لەلایــەن بەکرێگیراوێکــەوە بە ناوی سیرویســی

نەهاوەندی خوێنیان بە خاک تێکەڵکرا. سیرویسی نەهاوەندی چەندین کەسی بەناوی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی خەلقی ئێرانی لە دەوری خۆی کۆکردبووەوە، کە زۆربەیان کرێکار و خوێندکار بوون، ئەوانە هەموویان دەستگیرکران. من یەکێک لەوانەم بینی، ناوی حوسێن نامشی بوو، تەمەنی لە سی ساڵ زیاتر بوو، ئەو کاتێ دەستگیرکرا گومانی لە سیرویسی نەهاوەندی هەبوو. ئەوانە ڕێکخراوی شیراز بوون و سیرویسی نەهاوەندی لێپرسراوی ڕاستەوخۆی ئەوان بوو.

ساواک دەیویست بە تەواوی ئەو گرووپە لەناوبەرێت، بۆ ئەم مەبەستە ساڵی (١٣٥٥) لە تاران بەرنامەیەکی دانا بۆ دەستگیرکردنی تەواوی سەرانی ڕێکخراوەکەیان. بە ناوی کۆبوونەوە سیرویسی نەهاوەندی حەوت کەسی لە لێپرسراوانی ڕێکخراوەکە لەماڵێکدا کۆکردەوە، کاتێک لە ماڵەکەدا کۆدەبنەوە، سیرویسی نەهاوەندی خۆی دوادەخات و ناچێت، لەو کاتەدا ساواک گەمارۆیان دەدات و دەیاندەنە بەر دەستڕێژی گوللە. هەر لە جێدا هەر حەوت کەسەکە دەکوژن، کە ئەمانە بوون: ١- محەمەد عەلی پاریاد. ٢- ماهروخ فەیال. ٣- مینا ڕەفیقی. ٤- جەلال دەهقان. ٥- مەسعود سادقی. ٦- محمد حوسێن زەکی زادە. ٧- ڕەحیم تەشەری. ئەوان هیچ کەسێکیان بە زیندوویی دەرنەچوون. دوای ئەو ڕووداوە هیچ کەسێک نەیزانی سیرویسی نەهاوەندی بۆ کوێ ڕۆیشت و لە کوێ خەریکی کارە خیانەتکارییەکانییەتی. دوای شۆڕشیش کەسێک چاوی بە ئەو نەکەوتەوە.

ڕۆژانە ڕەوشی زیندان خراپتر دەبوو، بەهۆی زۆریی دەستگیرکردنی خەڵکانی تازەوە و قەڵەباڵغی ناو زیندان، وای لێهات جێگای خەوتنمان نەبوو. لەنێوان ئەو دەستگیرکراوە تازانەدا کەسانی وا هەبوو کە هیچ ئاگایان لە سیاسەت نەبوو، لایەنگری هیچ ڕێکخراوێک نەبوون، تەنها بەهۆی گومانی ساواک دەستگیرکرابوون و خرابوونە زیندانەوە. ساواک لە شەقامەکاندا بڵاوەبوونەوە، گومانیان لە هەر کەسێک بکردایە دەستگیریان دەکردن و دەیانخستنە ژێر ئەشکەنجە. زۆرێک

له دەســتگیرکراوان جووتیاران و کرێکارانی ئازەربایجان بوون، کە بو بەدەســتهێنانی پــارووە نانێک ڕوویان کردبووە تــاران. بیرم دێت ئەو زیندانییە تازە دەستگیرکراوانە لە ژووری ئەشکەنجەوە دەهاتنە دەر و دەهاتنەوە لای ئێمە هەموویان قاچیان فەلاقە کرابوو، بنەپێکانیان شــین ببوونەوە لەسەر ئەو ئازارەش کە هەیانبوو بە خۆبادان و خوێندنەوەی ســروودی شۆڕشــگێڕانەوە دەهاتنە نــاو بەندییەکانــەوە. زۆرێک لەو زیندانییانــە نەخوێندەوار بوون، بەڵام دواتر هەوڵی خۆیان دا و بەهۆی خوێندەوارەکانــی نــاو زیندان هەموویــان بوون بە خوێنــدەوار. ڕژێم لە بیری دارِشــتنی پیلانێک بوو تاکو ڕەوشــی زینــدان و زیندانییەکان بگۆڕێت، چونکە بەرگەی ئەو ڕەوشــەی نەدەگرت. بۆیە لە ناچارییدا بە بەهانەی بێ بنەما دەستی کرد بە دوورخستنەوەی زیندانییان. هاوڕێیانی ڕێکخراوی ســەربازیی و ڕێکخراوە شۆڕشگێڕەکانی تر دوورخرانەوە بــۆ عادل ئابادی شــیراز، زیندانییەکانی مەشــهەد، بروجــەرد، تەبرێز، پڕکرابوون لە زیندانیی. تەنها کەسانێک کە لە زیندانی قەسر مابوونەوە لە کۆنەکان من و عەزیز یوسفی و چەند زیندانییەکی تر بووین. کاتێک هاوڕێکانمــان بەڕێکــران دوو دانە بەتانی کۆنــە و دڕاویان دا بە من و عەزیز یوســفی. ئێمەشــیان هەروەکو زیندانییە تازە دەستگیرکراوەکان برد بۆ بەندی (٣)، لەوێ تەواوی زیندانییەکان لە پێشوازییماندا وەستان و ڕێزێکی زۆریان لێگرتین. پۆلیس بەم کارە ترســیان لێنیشــت، دیارە ئــەو پێشــوازیی و ڕێزگرتنــە بەهۆی خۆڕاگریــی و بەرگەگرتنی من و عەزیز یوسفی بوو. دوای ماوەیەک پۆلیس هێرشی کردە سەر زیندانی بەندی (٣)، دەستیان کرد بە لێدان و ئەشکەنجەدانی زیندانییانی سیاسی، دەستیان بەسەر تەواوی کتێب و پێویستییەکانی تردا گرت.

**عەلی ئەشـــرەف دەروێشـــیان: لەبـــارەی گرووپـــی ئەبازەڕ چ یادەوەرییەکت هەیە؟**

**ســـەفەرخان:** ماوەیەک بوو لە زیندانی قەسر لەگەڵ چوار زیندانیی تەمەن (١٨- ١٩) ساڵ کە لە دادگاکانی ڕژێمدا حوکمی لەسێدارەدانیان بۆ دەرچووبوو، وەرزشـــم کرد، ئێستا کەمێک باسی ئەوانت بۆ دەکەم، ئـــەو چوار لاوە خەڵکی نەهاوەند بـــوون و گرووپەکەیان ناوی ئەبازەر بـــوو، ئەوان بۆ بەدەســـتهێنانی چەک پەلاماری پاســـەوانێکیان دابوو و پاســـەوانەکەیان کوشـــتبوو، ئەوان لەگـــەڵ مامۆســـتایەکدا پەیوەندییان هەبوو، مامۆســـتاکە ناوی محەمەد تالیبان بوو، لێپرســـراوی ئەو چوار لاوە بوو. محەمەد تالیبان حوکمی دە ساڵ زیندانیی درا و چوار لاوەکەش حوکمی لەســـێدارەدانیان بەســـەردا درا. من زۆر هۆگری ئەوان بووم، ڕۆژێکیان دوانیوەڕۆ بوو خەریکی وەرزشکردن بووم، زیندانییەک هاتە لام و گووتی: ئەو چوار کەسە ناویان خوێنرایەوە، پێدەچێت لەسێدارەیان بدەن، ئێســـتا ئەوان دەیانەوێت چاویان بە تۆ بکەوێت، منیش ڕۆیشـــتم بـــۆ بینینیان، بـــەڵام لەوێدا ســـڵاوکردن و خوداحافیزیی لـــە فەرهەنگی شاهەنشاییدا تاوانێکی گەورە بوو، بە ناچاریی بەرەو لای ئاودەستەکان ڕۆیشـــتین و لەوێ بە نهێنی بۆ دوایین جار خوداحافیزیمان لە یەکتری کرد. ئەوان کەسانی هێمن و لەسەرخۆ بوون، دەستمان خستە دەستی یەکتـــری، بـــۆ دوایین جـــار یەکترییمان مـــاچ کرد. زۆر ئاســـایی بوون، وەک ئـــەوەی لە ئەم بەندەوە بڕۆن بۆ بەندێکی تر. کەوتبوومە دەریای بیرکردنـــەوە. پاســـەوانێک بـــە ناوی مـــورادی لە بەرامبـــەرم پەیدابوو. گووتی: وا دەزانیت چاوم لێ نەبووە، چاوم لێبوو لەگەڵ ئەوانەی بران بـــەرەو لەســـێدارەدان ئەمـــلاولای یەکتریتان ماچ دەکرد. مـــن کە لەناو ئاگـــری زوڵم و ســـتەمی ڕژێمی دیکتاتۆرییدا ســـووتابووم، گووتم: من نەمزانیوە کە ماچکردنی هاوڕێ تاوانە، ئێستاش کە ئەو کارەم کردووە، چیت پێخۆشـــە ئەوە بکە. مورادی کە لەو ســـاڵانەدا خوێنی زیندانییانی کردبووە شووشەوە. زۆرترین زیندانییانی ئەشکەنجە دابوو، پێکەنی و

گووتی: نا تۆ هاوشاریی منیت و هەربۆیە شکاتت لی ناکەم. پاسەوانانی زیندان بەردەوام لە هەوڵی شکاندنی کەسایەتیی زیندانییاندا بوون، هەر زیندانییەک بە هەر هۆیەک بووایە لە شوێنی زیندانیکردنی بەڕێ بکرایە، ئــەوا خوداحافیــزی دەکرد. شــەوێک لە حەوشــی زینــدان خەوتبووم، هەســتم کرد کەســێک دەمجولێنێت، لە جێگاکەم هەڵســام، سەیرم کرد زیندانییەک بوو بە ناوی عوســمان کە بەیانییەکەی ئازاد دەکرا، ئەو بە نهێنی خوداحافیزی لە زیندانییەکان دەکرد، بۆئەوەی پۆلیس نەمانبینێت لەژێر بەتانییەوە خوداحافیزیمان دەکرد و یەکترییمان ماچ دەکرد. زۆر مانەوەم لە زیندان و لەو ڕەوشــە نالەبارەدا مێشــکی تێکدابووم، بەبێ خواردنی حەپی ڤالیۆم شــەوانە نەمدەتوانی چەنــد کاتژمێرێک بخەوم. پۆلیســەکان وەک ئــەوەی تووشــی نەخۆشــیی ئازاردانــی زیندانییان بووبن، بەتایبەتی کەســوکاری ئەو زیندانییانەی لە شــوێنە دوورەکانی وەک ئازەربایجــان و کوردســتان و باکــوور و شــوێنە دوورەکانەوە دەهاتــن، زۆریان ئازار دەدان. زۆربەی ئــەو دایک و باوکە بێچارانەی کە لە تاران ئاشــنا و ناســیاویان نەبوو، یان حەزیان نەدەکرد ببنە بار بەسەر خەڵکییەوە، شەوانە تاکو بەیانی لەبەردەم زیندانەکاندا دەمانەوە و چەندیــن شــەو چاوەڕوانی خۆشەویســتەکانیان بوون، لــە کۆتاییدا بەبــێ ئەوەی چاویان بە خۆشەویســتەکانیان بکەوێت، بە نائومێدییەوە دەگەڕانەوە بۆ شــارەکانی خۆیان. من ســاڵی یەک جار سەردانیکردنم هەبوو.

لە زیندانییەکانی شــادا ئەو زیندانییانەی کە بە زمانەکانی نافارســی قســەیان دەکرد، زوڵمیان زیاتر لێدەکرا. ئەوان کەســوکارەکانیان کە لە شــوێنە دوورەکانەوە دەهاتن بۆ ســەردانیکردنیان، بەڵام لێپرسراوانی زینــدان بە بیانووی نەبوونــی کارمەندی کورد زمان، یان تورک زمان، نەیاندەهێشــت چاویــان بە زیندانییەکان بکەوێت. مــن بە درێژایی (٣٢) ســاڵ مانەوەم لە زیندانداا شــاهیدی بینینی چەندیــن ڕووداوی خەمبار بــووم. لەیادمە ڕۆژێــک یەکێک لە زیندانە سیاســییەکان، دوای ئەوەی

کەسـوکاری دێـن بـۆ سـەردانیکردنی، بـەڵام پۆلیـس بـە بیانـووی ئـەوەی کە کارمەندێکی تورکیان نییە بەشـداریی لە دیـدار و یەکتری بینینیـان بکات، بە ناچاریی کەسـوکاری دەگەڕێنـەوە بۆ ئازەربایجان، زیندانییەکەش دوای ئەوەی دەگەڕێتەوە بۆ ناو هاوڕێکانی، بە دەنگێکی بڵند هۆنراوەیەکی شۆڕشگێڕانە دەڵێت. دوای خوێندنەوەی هۆنراوەکە، زیندانییە ئازەربایجانی و کوردسـتانییەکان هەموو بەیەکەوە دەستیان کرد بە خوێندنەوەی چەندین هۆنراوەی شۆڕشگێڕانە.

لـە کۆتایـی سـاڵی (١٣٥٣) کـە لـە بەنـدی (٣)ی زیندانـی قەسـر بـووم، ڕۆژێـک لە بڵندگـۆی زیندانـەوە هاواریان کـرد هەرچی زووە کەلوپەلەکانتـان کۆبکەنەوە. هەروەکو پۆلیـس پڕوپاگەندەیان کردبوو؛ بڕیاربوو هەموو زیندانییانی قەسر بگوازنەوە بۆ زیندانی ئەوین. دوای چەند خولەکێک لەپڕدا پۆلیس هێرشی کردە سەرمان؛ هەرچی هەمانبوو خسـتییانە ژێر چەکمەکانیانەوە، هەموو شـتەکانیان ورد و خاش کرد و شـکاندیانن. تەنانـەت بەتانی و دۆشەکەکانیشـمان کە کەسـوکاری زیندانییانی سیاسـی بە هەزار بەدبەختی هێنابوویانن، پارچە پارچەیان کـردن. دوای کەلەپچەکـردن، زیندانییەکانیـان برد بـۆ بەندەکانی تری زیندانی قەسـر. من، حاجی عێراقی، ئاغای ڕەبانی شـیرازی، ئەنواری، عەبدولڕەزای حیجازی و ئەفسـەرێکی عێراقی بە ناوی هاشـم نوری، کە دوای دەستگیرکردنی بە تاوانی سیخوڕیی، ساڵەها بە هەمان کاری سـیخوڕیی لەنـاو زینداندا بـەردەوام بوو، لـە کۆتاییـدا پەیوەندیی بە ساواکەوە کرد و ناردییانە ژوورێکی تایبەت، کە تازە نۆژەنکرابووەوە، ئەم هاشم نورییە لە عێراق پەیوەندیی لەگەڵ کەسێکدا هەبوو، بە ناوی بەختیـار، کـە گرتبوویان و حوکمـی هەتاهەتایی درابوو. ئـەو ناپیاوە ببـووە بەڵا لەنـاو زینداندا، دەڕۆیشـت ڕاپۆرتی لەسـەر زیندانییەکان دەنووسـی، کار گەیشتە ئەوەی ئەو زیندانییانەی دەیانویست پەشیمان ببنەوە، هانایان بۆ ئەو دەبرد، ئەو پلەی سـەروانی هەبوو. دەیانگووت: دوای ئازادبوونی؛ سـەدام لەسـێدارەی داوە. چەند کەسـێکی ترمان لە

هاوشـێوەی ئەو هەبوو، وەکو ڕاشـد عەرەب کە کەسـێکی سادە بوو، کەسـێکی تریش هەبوو بە ناوی سیسـان کە ئەرمەنی بوو، دواتر بوو بە موسڵمان.

**عەلی ئەشـرەف دەروێشیان: ئەی زەردەشـت فروهەر کەسێکی چۆن بوو؟**

**سـەفەرخان:** ئەو وانەبوو، هەمیشـە جوێنی بە ڕژێـم دەدا، نامەی دەنووسـی، بەو نامەنووسینە هەندێک کەس گومانیان لێ دەکرد، بەڵام ئەو کەسـێکی باش بـوو، کاری خراپی نەدەکرد، هەرچەندە کەسـێکی بـزۆز بوو، هاواری دەکـرد، بەردەوام لەگەڵ پۆلیسـدا لە تێهەڵچووندا بوو، ئێستا ئەو مردووە، بەڵام پێویستە ڕاستییەکان بڵێین؛ ئەو بەردەوام پیاسـەی دەکرد و جوێنی دەدا. مـن ڕۆژێکیان پێم گووت کارێک مەکە کە زیندانییەکان ناڕەحەت ببن. گووتی: نا نا خەمت نەبێت، من دوژمنی سەرسەختی ئەم ڕژێمەم.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: هیچ کاتێک ڕوویداوە کەسێک لەناو فشاری زیندان خۆی بکوژێت؟**

**سەفەرخان:** زۆر کـەم، ئەوانەی خۆیان دەکوشت زیاتر زیندانییانی ئاسـایی بـوون، نەک سیاسـی، لە زیندانـی بەرازجان چەند کەسـێک نەیانتوانـی خۆیان ڕابگرن لە بەرامبـەر گەرما، بۆیە ئاگریان لە خۆیان بـەردا. دیارە ئەوانـەش زیندانییانی ئاسـایی بوون، بـەڵام زیندانییانی سیاسـی لەوانەبوو پێش لێکۆڵینەوە هەوڵی خۆکوشتن بدەن، بەتایبەت چریک فیداییەکان و موجاهیدەکان کەپسولی (سیاتور)یان لەژێر زماندا بوو بۆئەوەی قوتی بدەن و بمرن، یان وەکو دەیانگووت سیمین ساڵحی ویسـتوویەتی بە شووشـەی چاویلکەکەی دەمارەکانی دەستی ببڕێت، بەڵام کارمەندەکان پێیان زانیوە و دەستیان بەسەر هەموو چاویلکەکاندا گرتووە، موجاهیدێکیش هەبوو لەناو حەمامدا دەرمانی خۆپاککردنەوەی

خواردبوو و خۆی کوشتبوو، بەڵام ئەو لەژێر ئەشکەنجەدا تووشی نەخۆشیی دەروونیی ببوو، ئەو کوڕێکی لاو بوو، ئیتر کەسی ترم پێ شک نایات.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: باسی ئەو دکتۆرەم بۆ بکە کە بۆ چارەسەرکردنی گوێت سەردانت کرد؟**

**سەفەرخان:** لە سەرەتای پاییز و سەرتاسەری زستان گوێم ئازارێکی زۆری هەبوو، ئازار هێزی لێ بڕیبووم، بەردەوام دەستم لەسەر گوێچکەم بوو، ڕۆژێکیان زیندانییەکان بردیانم بۆ نەخۆشخانەی زیندان، دەستم لەسەر گوێچکەم بوو چوومە ژوورەوە، دکتۆرێکی لاو لەوێ بوو، ئەو تازە هاتبوو بۆ نەخۆشخانەی زیندان، بۆ یەکەمجاری بوو کە زیندانییەکی وەکو من ببینێت، بە بینینم سەیری مووە سپییەکانی کردم و گووتی: (ئەها پیرەمێرد بۆچی بەم تەمەنەوە ئارامت نەگرتووە کەوتوویتە زیندانەوە). منیش لە وەڵامی دکتۆردا گووتم: دکتۆر کاتێک من کەوتوومە زیندانەوە لە ئێستای تۆ لاوتر بووم، مووەکانم سپی نەببوون، من لە ئەنجامی مەینەتی و چەوسانەوە بەم ڕۆژە گەیشتووم. دکتۆر گووتی: تاوانت چییە؟ لەکاتێکدا لەتاو ئازاری گوێم نەمدەتوانی لەسەر قاچەکانی خۆم بوەستم. گووتم: تاوانی من عەشقی وڵات و ئارەزووی بەختەوەریی چینی زەحمەتکێشانە، منیش هەروەکو کەسانی دیموکراسی دەمەوێت لە وڵاتی ئێمەدا هەموو کەسێک مافی خۆی هەبێت و بە یەکسانی لەسەر خاکی لەمێژینەی خۆی بژی، ئێران ئاوەدان و ئازاد بێت و خەڵکی بە زمانی دایکی خۆیان قسە بکەن.

لەو کاتەدا پزیشکێکی پیر کە چەندین ساڵ بوو لە زینداندا خزمەتی دەکرد، زۆر باش منی دەناسی، گوێی لە گفتوگۆی من و دکتۆرەکە بوو، ئەو هات و باسی ژیانی منی بۆ دکتۆرە لاوەکە کرد. دکتۆر بە بیستنی وتەکانی ئەو دکتۆرە چارەسەرێکی باشی بۆ کردم و گووتی: بەڕاستی تۆ کەسێکی قارەمانیت، خزمەتکردنی کەسانی وەکو تۆ ئەرکی

سەرشانی هەموو کەسێکی ڕاستگۆیە، مامە گیان بمبەخشە.

دوای وەرگرتنی چارەسەر و خوداحافیزی بەهۆی ئەو کارمەندانەوە کە هەمیشـــە وەکو مۆتەکە بە دوامەوە بوون، گەڕامەوە بۆ ناو زیندان، لەو ڕۆژە بەدواوە ئیتر هیچ کەسێک ئەو دکتۆرەی لە زیندان نەبینییەوە و هیچ کەسێک نەیزانی چارەنووسی بە کوێ گەیشت!

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لە کاتی هەڵاتنی ئەشرەفی دەهقانی تۆ لە کام زیندان بوویت؟**

**سەفەرخان:** ئەشـــرەف دەهقانی لـــە کتێبی ئازایەتی و بەرگریکردندا هەموو شـــتێکی نووســـیوە، ئـــەو ڕۆژەی ئەو لە زینـــدان هەڵات ڕۆژی سەردانیکردنی زیندانییانی سیاسی بوو، ژنێک هاتبوو بۆ سەردانیکردنی، ئەو ژنە لە دەرەوە هەموو کارەکانی هەڵاتنی بۆ ڕێکخستبوو، عەبایەکی بـــۆ ئەشـــرەف دەهقانـــی هێنابـــوو، لە کاتـــی دانیشـــتن و قســـەکردندا عەباکـــەی پێـــدەدات. ئەو ژنە لەگـــەڵ موجاهیدینی خەلق لـــە پەیوەندیدا بـــوو، دوای هەڵاتنـــی ئەشـــرەف دەهقانـــی، ژنەکـــە و چەند کەســـێکی تریان دەســـتگیرکردن. ئـــەو ژنە منداڵێکی شـــیرەخۆرەی هەبوو، دوای دەستگیرکردنی منداڵەکەیان برد بۆ بنکەی پۆلیس بۆ لای دایکی. دوای تەواوبوونی سەردانیکردن بە بڵندگۆ هاواریان کرد هەموو زیندانییەکان بڕۆنە ژوورەکانی خۆیان. من بۆ شەوەکەی هەواڵی هەڵاتنی ئەشرەف دەهقانیم زانی، بۆ ســـبەینێ پۆلیس هەڵیکوتایە ســـەر بەندەکان هەموو شتێکی بەسەر یەکدا کرد، نزیکەی سەدو پەنجا کۆمیدی تەختە هەبوون هەموویانیـــان شـــکاند و فڕێیاندایە دەرەوە، دەســـتیان بەســـەر هەموو کەلوپەلەکانمـــدا گرت، ســـەرۆکی زیندانیان گـــۆڕی و زیندانیان کرد بە دۆزەخ و ڕەوشـــەکە بـــە جۆرێک گـــۆڕا، ئەگەر لە نەخۆشـــخانە دەنکە حەبێکیان پێ بدایانایە، دەبووایە پاســـەوانەکان ســـەیری بکەن و خۆیان دەمیان دەکردینەوە و حەبەکەیان دەکردە دەمتەوە و دەیانگووت قوتی بدە. ئەگـــەر ســـەردانیکاران باینجانێکیان بهێنایە، دەســـتیان بەســـەردا

دەگرت، دەبووایە زۆر بپاڕایتایەوە تاکو پێیان دەدایتەوە، ئەگەر کەسێک کەمێک قسەی بکردایە، دەیانبردە ژێرزەمینەکە و ئەشکەنجەیان دەدا. ڕۆژێک بێژەنی جەزەنی و دکتۆر شەیبانی و موسای خیابانیان برد، تاکو ئێوارە لێیاندان.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لەدوای ئازادبوونت، چاوت بە ئەشرەف دەهقانی کەوتەوە؟**

**سەفەرخان:** چونکە من لەگەڵ هەموو گرووپ و لایەنەکان ڕێک بووم، دوای ئازادبوونم زۆربەیان هاتن بۆ سەردانیکردنم، هەم چەپەکان و هەم مەزهەبییەکان، ئاخر مانای چییە ئێمە هەموومان ئامانجمان یەک بوو. ڕۆیشتنی شا و دواتر پیادەکردنی بنەمایەک بۆ کۆمەڵگە تاکو زوڵم و ستەم نەمێنێت، دیکتاتۆرییەت نەمێنێت، ئازادیی بەرقەرار بێت، هەژاریی و بەدبەختیی ڕیشەکێش بکرێت، ئەمە ئامانجی هەموومان بوو. دوای ئازادبوونمان هەرکەسە و چەند کەسێکی لە دەوری خۆی کۆکردەوە و خۆی کردە ڕێبەریان. فیداییەکان زۆریان هاتن بە شوێنمدا تاکو منیش لەگەڵ خۆیاندا ببەن، من نەڕۆیشتم. ئەشرەفی دەهقانی خۆشی هات و گووتم: نازانم ئێوە چیتان دەوێت، ئەو دوو سێ ڕۆژ لە ماڵی ئێمە مایەوە، ئەو دوای شۆڕش گەڕابووەوە بۆ ئێران و بەردەوام کەسێک پاسەوانی بوو، ڕۆژێک بە پاسەوانەکەی گووت: بڕۆ ئۆتۆمبێلەکە پڕ بکە لە کەلوپەل و بیهێنە بۆ سەفەرخان.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لە کوێ ئۆتۆمبیلەکەیان پڕکردبوو؟**

**سەفەرخان:** لە بارەگاکەی خۆیان، لە شەقامی مەیکە، بە پاسەوانەکەی گووت: بڕۆ فەرش و بەتانی و جلوبەرگ و قاپ و قاچاخ بهێنە. من گووتم: نامەوێت، گووتی: بۆچی ناتەوێت؟ لەوێ دانراون و هی ئەمریکاییەکانە. دواتر کە ئەشرەفی دەهقانی لە گرووپەکە جیابووەوە و کۆمەڵێکی لە دەوری خۆی کۆکردەوە، دەیانویست خۆیان چەکدار

بکەن. ڕوح ئەنگیزی خوشکیشی لە تەبریز دەستگیرکرا و لەسیدارەیان دا، هاوسەری خوشکەکەشی هەر لەسێدارە درا، بەهرۆزی دەهقانی براشی لەژێر ئەشکەنجەدا گیانی سپارد، براکەی نووسەریش بوو، کتێبی ئەفسانەکانی ئازەربایجانی لەگەڵ سەمەدی بەهرەنگیدا نووسیبوو. من کاتێک لە زیندان ئازادکرام، لەگەڵ چەند کەسێک ڕۆیشتم بۆ تەبریز و چووم بۆ ماڵی دەهقانییەکان و چەپکەگوڵم پێشکەش کردن.

**عەلی ئەشرەف دەەوێشیان: محەمەد دەهقانی برای ئەشرەفت بینی؟**
**سەفەرخان:** بەڵێ بینیم، لە زیندانی قەسر بەیەکەوە بووین، ئەو لە ژمارە سێ بوو، ئەو وەک ئەوان نەبوو، کرێکارێکی ئاسایی بوو، کەسێکی زۆر تووڕە بوو، ئەوەندەیان ئەشکەنجە دابوو تووشی نەخۆشیی دەروونیی ببوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: منیش لە بەندی سێ لەگەڵ ئەودا بووم، فێری زمانی ئینگلیزیم دەکرد، زۆریان ئەشکەنجە دابوو.**
**سەفەرخان:** لە بنەماڵەی ئەواندا کەسێک نەماوە، تەنها ئەشرەفی دەهقانی ماوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ماوە! مەگەر نەیانکوشت؟**
**سەفەرخان:** نا، ماوە، منداڵیشی هەیە، ئێستا لە فەڕەنسایە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: شووی بە کێ کردووە؟**
**سەفەرخان:** هاوسەری ئەشرەفی دەهقانی فەریبورزی سنجەریە، کە براکەی لەسێدارە درا، فەریبورز لە زیندانی ئەوین بوو، حوکمی هەتاهەتایی بوو.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشــیان: لەگەڵ فەریبورزی سنجەری لە زیندانی ئەوین بەیەکەوە بووین، کەسێکی کەمێک قەڵەو بوو.**

**سەفەرخان:** بەڵێ، خەڵکی نەهاوەند و ئەو دەوروبەرە بوو، کوڕێکی زۆر بــاش بــوو، ئەویش هات بۆ ماڵی ئێمە. ئەشــرەفی دەهقانی لەگەڵ ئەوەدا هاوســەرگیریی کرد، منداڵیشیان هەیە و لە فەڕەنسا دادەنیشن. ئــەوکات لە کوردســتانیش بنکەیان هەبــوو، مەبەســتم ئەوەیە هەموو زیندانییەکانی ئەویَ بنکەیان هەبوو. ئەشرەفی دەهقانی لە هەمان ساڵی شۆڕشــدا، ڕۆیشــتبوو بۆ کوردســتان و لە بارەگاکەی خۆیان وتاری دابــوو، خەڵکیش چەپڵەی بۆ لێدابوو، لە ڕۆژنامەکانیشــدا نووســرابوو خانمی کلاشــینکۆف بەدەســت. بەڵێ، ئەوەی من دەیڵێم ئەوەیە زۆرێک لــە چریکــەکان، چریک نەبوون، لە زیندان بوون بــە چریک، هەموویان ئەوانە بوون کە کتێبیان خوێندبووەوە و هاتبوونە زیندان، بەڵام کاتێک هاتنــە نــاو زیندان بێژەن جەزەنی ئەوانی کرد بــە چریک، ماویەکانیش زۆر کاریگەر بوون، ئەوانیش ئەو زیندانییانەیان بۆ لای خۆیان پەلکێش دەکــرد. پەنجا گرووپ زیاتر لە زیندانەدا هەبوو. ئەوانەی لەو ســاڵانەدا دەســتگیر دەکران هەموویان بەهۆی خوێندنەوەوە دەســتگیرکرابوون. دە کــەس کتێبیــان خوێندبووەوە، یەکێک نــاوی یەکێکی تری دەگووت، ئەویش ناوی کەســێکی تــر، ئیتر ئەوانیان هەموو دەســتگیرکردبوو و کۆیــان کردبوونــەوە و هێنابوویاننــە زیندان، هەموویــان لاو بوون و هاوتەمــەن بــوون. ئــەوان کاتێــک دەهاتنە نــاو زینــدان، زیندانییەکان دەچــوون و دەیانهێنــان بــۆ لای خۆیــان و لێیان دەپرســین تۆ چیت؟ ماوی؟ شەفەقی؟ ئەستێرەی سوریت؟ تودەیی؟ چریکی؟ هەندێک لەوانە دەیانگــووت چریک، هەندێکیــان دەیانگووت تودەییــم، ئیتر چریکەکان چریکەکانیــان دەبردە لای خۆیان، تودەییەکانیش تودەییەکانیان دەبرد، ئیتــر بەو جۆرە هەر لایەنە و لایەنی خۆی دەبرد. دواتر زۆرێک لەوانە لەســێدارە دران و هەندێکیشــیان لەژێر ئەشکەنجەدا دەمردن. بە هاتنی ئــەو هەمــوو زیندانییە، زینــدان تــەواو قەرەباڵغ بوو. کاتێک کەســێک

ماوەی زیندانییەکەی تەواو دەکرد و دەیویست بڕوات، لە پاڵ دیوارەکە دەوەستا و دروشمی دەدا و هاواری دەکرد و چەپڵەی لێدەدا، هەر ئەوە بووە هۆی ئەوەی پۆلیس هێرش بکەنە سەر زیندانییان.

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان: ئەو زیندانییانەی دەهاتنە زیندانی قەسر زۆر حەزیان دەکرد تۆ ببینن. لەو بارەیەوە چی یادەوەرییەکت هەیە؟**

**سەفەرخان:** یادەوەرییەکان زۆرن، کەسانێک کە لە دەرەوەی زیندان بوون، بەهۆی کەسانی ترەوە ناوی منیان بیستبوو، یان کەسێک باسی منی بۆ کردبوون. لاوەکان حەزیان دەکرد بزانن کە چۆن کەسێک هەیە و چەندین ساڵە لە زینداندایە، چۆن کەسێک ئەوەندە ساڵە لە زینداندا ماوەتەوە، ئەوان لە دڵی خۆیاندا بیریان کردبووەوە کە کەسانێک هەن لەم وڵاتەدا لەپێناو بیروباوەڕی خۆیاندا چەندین ساڵە لە زینداندان، ئەوان بەو ناوانە ئاشنا بوون و حەزیان دەکرد لە نزیکەوە من ببینن. بۆ نموونە یەکێک لەوانە عەلی پایندە بوو، ساڵی (١٣٣٩) کە دەستگیر دەکرێت و دێتە زیندان بەدوای مندا دەگەڕێت، بۆئەوەی چاوی پێم بکەوێت، ئەو چەند جارێک دەستگیر دەکرێت و ئازاد دەبێت، تاکو ساڵی (١٣٤٩) بەهۆی پەیوەندیی لەگەڵ ڕێکخراوی تۆفان-دا دەستگیر دەکرێت، دیارە ئەندامی ئەو ڕێکخراوەش نەبوو. بەهەرحاڵ دوای لێکۆڵینەوە بۆ چەندین زیندان گواسترایەوە، لەوانە زیندانی عەشرەت ئاباد، زیندانی جەمشیدیە، زیندانی ژمارە چواری قەسر، من ئەو کاتە لە ژمارەی سێی قەسر بووم.

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان: هەمان زیندان کە سێگۆشە بوو؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، حەوشەیەکی سێگۆشەی هەبوو، کۆتایی مانگی ئەسفەندی ساڵی (١٣٥١) بوو، کاتژمێر یەک تاکو سێ کاتی بێدەنگیی بوو، هەندێک لە زیندانییەکان خەوتبوون، هەندێکیش بەبێدەنگیی

خەریکی خوێندنەوە بوون. لەو کاتەدا ئەو دێتە بەندی سێ. یەکەم کەس کە چاوی پێی دەکەوێت بێژەنی جەزەنی بوو، کە لە هۆڵەکەدا بەدەم پیاسەکردنەوە خەریکی خوێندنەوە بوو، لەگەڵ ئەودا چاکوچۆنی دەکات و هەواڵی من دەپرسێت و دەڵێت: سەفەرخان لە کوێیە و چۆن ببینم؟ بێژەنیش پێی دەڵێت برۆ بۆ ئەو ژوورە و سەیری ئەوانە بکە کە خەوتوون، کامەیان لە هەموویان درێژتر بوو ئەوە سەفەرخانە.

عەلی پایندە بە پێکەنینەوە دەڵێت: لە تۆش درێژترە؟

بێژەن دەڵێت: سەر و گەردنی لە من بەرزترە، برۆ سەیرکە و خۆت بڕیار بدە.

من لە ژووری ژمارە هەشت بووم، ئەو هاتە ژوورەوە و منی دۆزییەوە و هاتە لامەوە و لە خەو هەڵیساندم.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: پێت ناخۆش نەبوو کە لە خەوی کردیت؟**

**سەفەرخان:** نەخێر مرۆڤ کە لە زینداندا بێت، هەمیشە چاوەڕوانی ڕووداوێکە بێن و لە خەو هەڵیسێنن و ببیەن، بەڵێ، لە خەو هەڵیساندم و ئەملاولای یەکتریمان ماچ کرد. ئیتر خەوم ڕەوییەوە، بەیەکەوە ڕۆیشتین بۆ چێشتخانە و بەیەکەوە دانیشتین و باسی دۆسیەکەی و ئەو کەسانەم لەگەڵدا کرد کە لە زیندانەکانی تر بینیبوونی. من زۆر حەزم دەکرد ئەو زیندانییانەی تازە دەهاتن، وتووێژیان لەگەڵدا بکەم و پرسیاریان لێ بکەم. ئەو ساڵی (١٣٤٩) دەستگیرکرابوو، بردبوویان بۆ زیندانی (قزل قەڵا)، دوای لێکۆڵینەوە بردبوویان بۆ زیندانێکی گشتیی ئاسایی. لەوێ کێشەی (سیاهکول) هاتبووە پێش، واتە ڕووداوی (١٩)ی بەهمەنی (١٣٤٩) (١٩٦١/٢/٨)، کە سیاگوڵییەکانیان دەستگیرکردبوو. ئیتر لە زیندانی قزل قەڵا جێگا نەمابوو، چواردە کەسیان لە ئەندامانی سەرەکی سیاگوڵ بردبووە زیندانی ئەوین، ئەوانی تریان هێنابووە قزل قەڵا. ئەوانەیان کە لێکۆڵینەوەیان تەواو ببوو، کەسوکاریان دەیانتوانی

سـەردانیان بکەن، ئەوانیان بردن بۆ جەمشـیدییە و لەژێر چاودێریی ساواکدا بوون.

**عەلی ئەشـرەف دەروێشـیان: زیندانی جەمشیدییە کەوتووەتە کوێی تارانەوە؟**

**عەلی پایندە:** (هاوڕێی سەفەرخان بوو، کە لە زۆربەی زیندانەکاندا بەیەکـەوە بوون، لە کاتی ئەم گفتوگۆیەدا ئەویش لە ماڵی سـەفەرخان بـوو) دەکەوێتە خۆرهەڵاتی شـاری تـاران، کەمێک لە پشـت مەیدانی تەوحید.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەو زیندانە ئێستاش ماوە؟**

**سەفەرخان:** بەڵـێ هەر ماوەو زیندانییشی تێدایە، بنکەی سەربازیی و زیندانیـی تێدایـە، ئەوکاتـە سـاواک سەرپەرشـتی ئـەو زیندانییەی دەکرد. دواتر لەگەڵ لێپرسـراوانی زیندان کەوتنە کێشەوە و ساواکیان ئاگادارکردەوە کـە زیندانییەکانیان لەوێ بگوازنەوە. هەربۆیە لە مانگی ئەسـفەندی (١٣٤٩) هەمـوو زیندانییەکانیـان گواسـتەوە بـۆ زیندانی عەشـرەت ئاباد، کە زیندانێکـی بێکەڵک و وێرانە بوو. ئـەو زیندانییانە بچوونایەتە هەر زیندانێک زیندانەکەیان ڕێکدەخسـت، چونکە دەبووایە لەوێدا بژین، تاکو ڕۆژی (٢٦)ی ئەسفەند کە سیاگوڵییەکانیان لەسێدارە دا، هیچ کەسـێک سـەردانیکردنی نەبوو، ڕۆژنامەش قەدەغە بوو، تەنها بەشـێوەیەکی نهێنی ڕۆژنامە دەگەیشـتە دەسـت زیندانییـەکان و بەو هۆیەوە ئاگاداری لەسـێدارەدانی هاوڕێکانیان دەبوون. سـەردانیکردن قەدەغە بوو، ڕۆژنامە قەدەغە بوو. تەنها لەلایەن کەسێکی پاسەوانەوە کە لەگەڵ زیندانییەکاندا هاوڕێیەتی پەیداکردبوو، جار جارێک ڕۆژنامەمان بەدەست دەگەیشت.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ڕەوشـــی زیندانییەکان لەو کاتەدا چۆن بوو، زیندانییەکانی ناو زیندان لە چ بارێکدا بوون؟**

**ســـەفەرخان:** ڕەوشی زیندان لە ســالّی (١٣٥١) هەروەکو ئەو کاتە وابوو کە خۆت لە ساڵی (١٣٥٠) بینیبووت. هەندێک لە بەشە ئیدارییەکانی نــاو زیندان هەر بەدەســت زیندانییــەکان خۆیانەوە بــوو، بۆ کاتەکانی خەوتن و هەڵســان هەر خۆیان بڕیاریان دەدا، دیارە پۆلیســیش ڕۆڵی خۆی هەبوو، بەڵام ڕۆڵێکی بەرچاویان نەبوو. واتە تەنها چاودێرییەکی ئاســاییان دەکــرد، بەڵام زیاتر زیندانییەکان خۆیــان بڕیاردەر بوون لە کاروبــاری ناو زیندانەکە. بۆ نموونە خۆیــان کۆبوونەوەی هەفتانەیان ڕێک دەخســت، ســەرەتای کۆبوونەوەکانیان بە خوێندنەوەی ســروود بــوو، دواتــر بڕیاریــان لــە کارە ئیدارییەکانی ناو زینــدان دەدا. ئەگەر پۆلیس بیویســتایە دەســت بخاتە ناو کاروباریان، ئــەوا ڕووبەڕوویان دەبوونــەوە. بە گشــتی ئازادییەکی کەم لە زینداندا هەبــوو. لەو کاتەدا لە زیندانی قەســر زۆرترین بڕیار بە دەســت زیندانییەکان بوو، کاتێک عەلی پایندە گەیشــتە بەشــی چواری زیندانی قەسر، کۆبوونەوەیەکیان کــرد و ئەویــان کرد بە نوێنەری خۆیان، بۆیە ناچار بوون کێشــەکانی نێــوان زیندانییان و پۆلیس بەشــێوەیەکی ئاشــتییانە چارەســەر بکەن. لــەو کاتەدا ســەرۆکی ئیدارەی زیندانەکان (تیمســار تاهیری) بوو، لەو کاتەدا زیندانییەکان دەیانتوانی داواکارییەکانی خۆیان پێشــکەش بکەن، دیــارە چەند کەســێک هەبــوو توندڕەوییان دەکرد، هــەر بۆیە ئەوانە ڕووبەڕووی هەڕەشە دەبوونەوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەو توندڕەوییە چۆن بوو؟**

**ســـەفەرخان:** دیــارە خــۆت ئاگاداریت لــەو کاتەدا زۆر کەســیان لەسێدارە دا، بەتایبەت ئەو کەسانەی بە تاوانی پەیوەندییکردن بە چریک و موجاهیدین دەستگیرکرابوون. زیندانییەکان لەناو زینداندا مەراسیمی تایبەتیــان بۆ ئەو لەســێدارەدراوانە ڕێکدەخســت، ئەو مەراســیمانەش

زۆربەی کات پۆلیسەکانی ناڕەحەت دەکرد و ڕووبەڕووبوونەوە ڕووی دەدا. زیندانییەکان لە ژوورێکی گەورەدا کۆدەبوونەوە و باسی ژیان و تێکۆشانی کەسانی لەسێدارەدراویان دەکرد و سرووودی شۆڕشگێڕییان دەگووتـــەوە، پۆلیس دژی ئەم جۆرە مەراســیمانە بوو، زیندانییەکانیش کاردانەوەیـــان لـــە دژی پۆلیس هەبوو. لەو کاتەدا زیندانی ژمارە ســـێ و چـــواری قەســـر ســـەرۆکێک و جێگرێکـــی هەبوو، ســـەرۆکەکە ناوی ســـەرگورد (کومیلیـــان) بوو، جێگرەکەش ناوی ســـەروان (تەجزیەچی) بوو، واتە لە ساڵی (١٣٥١)دا.

**عەلی ئەشـــرەف دەروێشـــیان: ئەوانەی ئـــەوکات لەوێ بوون کەسانی میانڕەو بوون.**

**ســـەفەرخان:** بەڵێ ڕاســـتە، ئەوانەی لەوێ بوون کەسانی میانڕەو بـــوون، واتە مـــن هیچ کات توندڕەوییـــم لە ئەوان نەبینیوە، پێویســـتە ڕاســـتییەکان بڵێین، ســـەرۆکی زیندانی قەســـر کەســـێک بـــوو بە ناوی سەرهەنگ تەیموری.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: دەڵێن تەیموری خانەنشین کراوە؟**

**ســـەفەرخان:** بەڵێ، ئەو ئێســـتا پیر بووە، ئەو کەســـێکی باش بوو بـــە دڵنیاییەوە تۆش ئاگاداریت، بە گشـــتی هەمیشـــە ســـەرۆکی زیندان هاوشـــارییەکانی خۆی لـــە خۆی نزیک دەکردەوە. بـــۆ نموونە جێگر و سەرۆک بەشەکانی لە هاوشارییەکانی خۆی دادەنا. سەرهەنگ تەیموری هەمەدانی بوو، لە تورک زمانەکانی هەمەدان بوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: خەڵکی دەوروبەری قروە بوو؟**

**ســـەفەرخان:** نازانـــم قروەیی بوو، یان شـــوێنێکی تـــر، بەڵام ئەو هەمەدانییەکانی هێنابووە زیندان بە ناونیشانی جێگر و سەرۆک بەش، یەکێک لەوانە (کیمیلیان) ســـەرۆکی زیندانی ســـێ و چواری قەســـر و

(تەجزیەچـی) هەمەدانـی بوو، کە بە شـێوەزمانی هەمەدانی قسـەی دەکرد.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: دکتۆر تەجزیەچی؟**

**عەلـی پایندە:** بەڵـێ تەجزیـە چـی، تەجزیەچـی چەنـد جارێک زیندانییانـی ئاگادارکردەوە کەمێک ڕەفتارتان بگۆڕن، مەهێڵن سـاواک قـاچ بخاتـە ئێرە. ڕۆژێک سـێ گرووپیان لـە زیندانییـەکان بانگ کرد بـۆ کۆمیتـەی هاوبـەش، لـەوێ ئاگاداریـان کردنەوە ئەگـەر واز لەو توندڕەوییە نەهێنن، ئێمە ناچار دەبین هەڵوێسـتمان بگۆڕین. گرووپی یەکەم من و دوو کەسـی تر بووین، ئەو دوو کەسـەش یەکێکیان سەر بە ڕێکخراوی موجاهیدین بوو، ئەوی تریشـیان یەکێک بوو لەوانەی لە خۆپیشـاندانەکاندا دەسـتگیرکرابوو، گرووپی دووەمیش دکتۆر غولام ئیبراهیم زادەی خەڵکی کەنگاوەر بوو، کە لە سـاڵی (١٣٥٧) ئازادکرا و ئێستاش لە ژیاندا ماوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: دەمناسی، پزیشک بوو.**

**عەلـی پایندە:** بەڵێ، خەڵکی کەنگاوەر بوو، پزیشـکێکی باش بوو، زۆر هاوکاریی زیندانییەکانی دەکرد، گرووپی سـێیەم نازانم کێ بوون، کە بردیانن بۆ کۆمیتەی هاوبەش و ئاگاداریان کردنەوە و پێیان گووتن ئەگـەر ناتانەوێت ڕەفتاری خۆتان بگـۆڕن، ئێمە ناچار دەبین ڕەفتاری خۆمـان لـە بەرامبەر ئێـوەدا بگۆڕین. دوای ئەوەی ئەم سـێ گرووپە گەڕانـەوە بۆ زیندان و تەواوی قسـەکانیان بـۆ زیندانییەکان گێڕایەوە. زیندانییـەکان لـە دەوری یەکتـری کۆبوونـەوە و کەوتنـە وتووێژ، لە کۆتاییدا بەو ئاکامە گەیشتن کە پێویستە لەسەر کێشەکانی خۆیان، واتە کێشەی چەپ و توندڕەویی پاشەکشە بکەن. ئێستا دوو نموونە لەسەر چەپڕەوەکان باس دەکەم. ڕۆژێکیان لێپرسراوی فرۆشگای زیندان هات بۆ بەندی چوار و گووتی: مۆڵەتیان پێداوین کە دۆشەک بۆ زیندانییەکان

بکڕین، ئەگەر ئێوە حەز دەکەن دۆشەکتان بۆ بکڕین، ئەوا لیستێکمان بۆ بنووسن و ژمارەی دۆشەکەکان بنووسن تا بۆتانی بکڕین، نرخی دۆشەکەکانیشی گووت. بۆ نموونە (٨٠ یا ٩٠) تومەن بوو. نوێنەری زیندانییان هات و هاواری کرد کە فرۆشگا دەیەوێت دۆشەکی ئیسفنج بکرێت، واتە نوێنەری زیندانییان ئەو داواکارییەی بە تەواوی زیندانییان ڕاگەیاند. یەکێک لە زیندانییەکان داوایکرد کۆبوونەوەیەکی کۆمەڵەی زیندانییان بکرێت. ئێمە لە زینداندا کۆمەڵەیەکمان دروستکردبوو، کە تەواوی ڕێکخراو و گرووپەکان بەیەکەوە لەناو ئەو کۆمەڵەیەدا بووین، لە هەموو شتێکدا هاوبەش بووین، تەنانەت لەو جلوبەرگانەشدا هاوبەش بووین کە لە دەرەوە بۆمان دەهات، هەموو شتەکانمان تێکەڵ دەکران و دواتر لەنێوان زیندانییاندا دابەش دەکران. بۆ ئەو دابەشکردنەش لێپرسراوێکمان دانابوو، بەڵام چەند کەسێک ناڕازیی بوون لەسەر دابەشکردنی ئەو جلوبەرگانە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان:** دوایی چی ڕوویدا؟

**عەلی پایندە:** بەهۆی کۆکردنەوەی جلوبەرگەکان، بەتایبەت جلی ژێرەوە، ڕووبەڕووی کێشەیەکی گەورە بووینەوە، نەخۆشیی پێست لەنێو زیندانییاندا بڵاوبووەوە و بوو بە هەرا، گووتیان بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشییە بەهۆی جلوبەرگەکانەوەیە، هەربۆیە ناچاربوون کارمەندانی زیندان لەسەر ئەو بابەتە ئاگادار بکەنەوە، چونکە دەبووایە نەخۆشەکان چارەسەر بکرێن و پێویستمان بە دەرمان هەبوو. پۆلیس کاری بەسەرمانەوە نەبوو، گووتیان چارەسەرتان دەکەین و دەتانبەین بۆ نەخۆشخانە، بەڵام ئێوە کارێکی هەڵەتان کردووە. نەیانبردین بۆ نەخۆشخانە، بەڵام دەرمانێکی زۆریان پێداین، زیاتر لە بیست شووشەی پڕ دەرمانیان پێداین. دەرمانەکە دوو جۆر بوو، پێیان دەگووت دەرمانی یەکەم و دەرمانی دووەم. دەرمانی یەکەممان لە خۆمان دەدا، دوای دە خولەک بەهەمان شێوە بە دەرمانی دووەم خۆمان چەور دەکرد.

زۆربـەی زۆری زیندانییـان تووشـی نەخۆشـییەکە ببـوون، تەنانەت ئەوانـەی لە کۆمەڵەکەشـدا نەبـوون و جلوبەرگیان تێکـەڵ نەکرابوو، هـەر تووش ببـوون، چونکە جێگەکەمان بەرتەسـک بـوو، هەموومان بە پاڵ یەکەوە دەخەوتین. هەر بەهۆی ئەو کێشـەیەوە بوو کە باسـی دۆشـەکەکان هاتـە پێش و کەوتینە گفتوگۆ نزیکـەی (٩٠٪)ی ئەوانەی لە کۆمەڵەکەدا بوون دژی کڕینی دۆشـەک بوون. گرنگترین هۆکاریش ئەوە بوو، کە حکومەت دەیویست بە هێنانی دۆشەک گیانی ئێمە ئاسودە بکات، بەم ئاسودەبوونەش گیانی شۆڕشگێڕیی ئێمە لەناوبەرێت. دیارە پێشـتریش قسەمان زۆر لەسەر ئەوە کردبوو کە نابێت خواردنی باش بخۆیـن، ئەگەر خواردنی باش بخۆین، لەوانەیە باوەڕی شۆڕشـگێڕیی خۆمان لەدەسـت بدەین و ئێمەش وەک زیندانییانی ئاسـاییمان لێبێت، ئەمـەش ئەوەیە کە حکومـەت دەیەوێت. بەڵێ، ئەم ڕووداوە لە سـاڵی (١٣٤٩/ ١٩٧٠) ڕوویـدا. بەڵێ، زۆربـەی زۆری زیندانییان دژی کڕینی دۆشـەک بوون، تەنهـا نزیکەی لە سـەدا دە، یان یانـزە لەگەڵ کڕینی دۆشـەک بوون، بەڵام دواتر چەندین کەسـی تر داوای دۆشەکیان کرد و ناردیان دۆشـەکیان بۆ هات، یەکەمجار تەنها هەشـت دۆشەک هات و دواتـر وردە وردە زیادی کرد، ئـەوەش یەکێک بوو لە توندڕەویی زیندانییـەکان. دیارە بێژەنی جەزەنی لەو بارەیەوە زۆر قسـەی لەگەڵ زیندانییان کرد، دەیگووت جلوبەرگ بپۆشـن، لەسەر قەرەوێڵە بخەون، ئـەوە چییـە چەندیـن پینەتان لـە جلوبەرگەکانتان داوە و لەسـەر ئەو زەوییە ڕەقە دەخەون. بێژەن دەیگووت: شۆڕشگێڕیی بەو هەڵسوکەوت و قسەکردنە نییە.

ئێستا شتێکم هاتەوە یاد، کە هەموو زیندانییەکان ئاگادارن، لە زیندانی عەشـرەت ئاباد زیندانییەک هەبوو. ئێستا ئەو کەسە باری دارایی زۆر باشـە و خاوەن پارەیەکی زۆرە. ئەو زیندانییە ناوی مەهدی بوو، ئەو بەهـۆی پەیوەندیی بە ڕێکخراوی تۆفان دەسـتگیرکرابوو، حوکمەکەی دوو سـاڵ بوو، دوای ئەوەی نیوەی زیندانییەکەی تەواوکرد، ئازادکرا.

ئەو جارێکیان قاتێک چاکەت و بیجامەی تازەی بۆ هاتبوو، کاتژمێرێکی پێ نەچوو کە سەیرم کرد پینەی لەسەر ئەژنۆی بیجامەکەی داوە و لە چەندین لاوە چاکەت و بیجامەکەی دڕاندبوو، پینەی لێدابوون، پینەکانیش ڕەنگیان سور و ڕەش بوون. کاتێک لەناو حەوشەکەدا پیاسەی دەکرد و بەو جۆرە بینیمان، لێی نزیکبووینەوە و گووتمان ئەوە چیت کردووە ئەو جلوبەرگانەت بۆ وا لێکردووە. لە وەڵامدا گووتی: نابێت ئێمە جلوبەرگی تازە بپۆشین، دەبێت جلە تازەکانمان بکەین بە کۆنە؛ تاکو زیاتر بەرگریی بکەین.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەمە خۆدەرخستن بوو، یان بیروباوەڕ؟**

**عەلی پایندە:** بە دڵنیاییەوە بیروباوەڕ بوو، باوەڕ بکە ئەگەر بێژەنی جەزەنی نەبووایە ئەوان بە پێی پەتی دەگەڕان و بە ڕووتی دەخەوتن. زیندانییەکمان لابوو بە ناوی حوسێن ڕەحیمی، ئەو دە ساڵ حوکم درابوو، بەڵام دواتر لەسێدارەدرا، ئەو دەیگووت دەبێت ئەم دە ساڵە لەسەر بەردی ڕەق بخەوم.

ئەمانە نموونەیەک بوون لە توندڕەویی زیندانییەکان، یان توندڕەوییان لە بەرامبەر پۆلیسەکان، بیرمە شەوێک کاتژمێر دەی شەو بوو، پاسەوانێکمان ناوی کوێخا بوو، کەسێکی بەتەمەن بوو، خەڵکی هەمەدان بوو، کەسێکی باڵابەرز بوو، کات زستان بوو، بەفر باریبوو، هەوا زۆر سارد بوو، ئەم کوێخایە کاتژمێر دەی شەو هاتە حەوشی زیندانەکەوە و گووتی: بڕۆنە ژوورەوە دەمەوێت دەرگاکە دابخەم، زیندانییەکمان لابوو ناوی جیهان شاهی بوو، لەو ساڵانەدا لەگەڵ ئێمەدا زیندانیی بوو، کەسێکی بێدەنگ و بەڕێز بوو، ئەو لەلایەن زیندانییەکانەوە هاندرابوو، ڕۆیشت بەرەوڕووی پاسەوانەکە و کردی بە شەڕ لەگەڵیدا و شەپازلەیەکی بەهێزی لە پاسەوانە پیرەکە دا، ئەمەش لەلایەن هەندێکمانەوە کارێکی قبووڵ نەکراو بوو. ئەو کوڕە لاوە هەرگیز کەسێکی شەڕانی

نەبوو، لە بنەماڵەیەکی بەڕێز بوو، نە جوێندانی دەزانی و نە شــەڕکردن، کەســێکی بێدەنگ بوو، بەڵام لەلایەن چەند زیندانییەکەوە هاندرابوو. ئەو پاسەوانە کە لێیدرا، یەکسەر بە زەویدا کەوت. من کە نوێنەری زیندانییەکان بووم، پاســەوانە پیرەکەمان هەڵگرتەوە و بردمانە هۆڵەکە، ســەیرم کرد جیهان شــاهی وەستاوە و ئەو پاســەوانە پیرە خەریکە دەگری. تەلەفۆن کرا و پۆلیس هاتن و گووتیان ئەم پاسەوانە کوڕەکەی لەم زیندانییەی کە لێــی داوە، گەورەترە. ئەم کوڕە چۆن توانیویەتــی ئەوها لێی بدات؟ ئێوە چۆن وەڵام دەدەنەوە. من نەمتوانی هیچ وەڵامێک بدەمەوە، تەنها ئەوەندە نەبێــت کەوتمــە پاڕانــەوە و داوای لێبووردنم کرد. کاتێــک گەڕامەوە بۆ ناو زیندانییــەکان، زیندانییەکان لێم هاتنە پێش و گووتیان بۆچی چوویت داوای لێبووردنت کردووە. من ویستم کێشەکە چارەسەر بکەم، لە لایەکی ترەوە هەوڵم داوە ســەروان (ســارمی) بە بابەتەکە نەزانێت، چونکە ئەو ئەفســەرێکی زۆر بەد بوو، بەدوای بەهانەیەکدا دەگەڕا تاکو زیندانییەکان ببات و دارکارییان بکات. ڕۆژێکیان ســەروان ســارمی هاتە ژوورەکەی ئێمــەوە و لە دەرگاکەوە ســەیری ناو ژوورەکەی دەکــرد، زیندانییەکمان لابوو بە ناوی (بەهرامی بەراتی)، کە بەداخەوە ئێســتا لە ژیاندا نەماوە و بەهۆی نەخۆشــییەکی سەختەوە کۆچی دوایی کردووە، بە هەموو هێزی خۆی یەک بۆکسی لە سنگی سەروان سارمی دا و ئینجا بە هەموو هێزی خۆی سەری خۆی کێشا بە دیوارەکەدا و بوورایەوە. نموونەی ئەو جۆرە توندڕەوییانەم زۆر لایە، دیارە ئەوانەی من باسمکردن لە زیندانی ژمارە چوار بوو، زیندانی ژمارە سێش بەهەمان شێوە بوو. توندڕەوییەکان بە جۆرێکــی تر بەردەوامیی هەبوو. ئەو زیندانییانەی لە ژمارە ســێ بوون، زیاتر کەســانی بەتەمەن بوون، واتە کەســانی شــارەزا و دنیادیدە لەوێ زیاتر بوون. ئەوکاتە، واتە ساڵی (١٣٥١) من لە زیندانی ژمارە سێ بووم، کەســانی زرنگمــان لەلابوو، لەوانــە: بێژەنی جەزەنی کە کەســێکی چەپ بوو، لــە ڕێکخراوی موجاهیدین مەســعود ڕەجەویمان لابــوو، هەروەها موســای خیابانی و چەند کەســێکی تــر کە تەمەنیان لە چل ســاڵ زیاتر

بوو، هەروەها عەباسی شەیبانیش لەوێ بوو، ئەوانە کەسانێک بوون کە کەمتر دووچاری توندڕەویی دەبوونەوە. ڕێکەوتی (٣)ی خوردادی (١٣٥٣/ ١٩٧٤) بوو، کە زیندانییەکانی زیندانی (قزل حەسار)یان هێنا بۆ زیندانی قەسر، ئەوان ماوەی ساڵێک بەسەر سەرکوتکردنیاندا تێپەڕیبوو، بەڵام هێشتا ترس بەسەریاندا زاڵ بوو، بەندی سێ و چوار داخرابوون و دووبارە کرابوونەوە، بەڵام زیندانی ژمارە یەک دانەخرابوو. ئەو زیندانە هەمان ئەو زیندانە بوو کە لە یانزەی بەهمەنی (١٣٢٨) ئەو زیندانییانەی تەقەیان لە شا کردبوو؛ سەر بە حیزبی تودە بوون، هێنابوویاننە ئەم زیندانە. زیندانی ژمارە یەک زیندانێکی گەورە بوو، دەرگاکانی لە ئاسن دروستکرابوون.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەوە هەمان زیندانە کە من لێی زیندانیی بووم و لە بەندی چوار بووم و بەندی چوار و پێنج و شەش لەلایەکی ترەوە بوون.**

**سەفەرخان:** بەڵێ، هەمان زیندان بوو، تۆ لە بەندی چوار بوویت و من لە بەندی شەش بووم و بەندی پێنجیش بەولاترەوە بوو، ڕێگاشیان بەسەریەکەوە بوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: حەمام و ئاودەستیش لەو ژوورەدا بوون کە دایانخستبوو.**

**عەلی پاینده:** بەڵێ، ماوەیەک ژمارە یەک داخرابوو، تاکو لە ساڵی (١٣٣٣) کە ڕێکخراوی ئەفسەرانی تودە دەستگیرکران، دووبارە کرایەوە، نازانم تۆ کتێبی (ئەفسانەی ئێمە)ت خوێندووەتەوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: بەڵێ، خوێندوومەتەوە لە نووسینی (غ-فروتن).**

**عەلی پاینده:** بەڵێ، لە نووسینی (فروتن)ە، هەمان زیندان کە لەو

کتێبەدا باسکراوە زیندانی ژمارە یەکە. کە دوای سەرکوتکردنەکەی ساڵی (١٣٥٢) دووبارە کردیانەوە و زیندانییانی هەردوو بەندی (٣و ٤) گواسترانەوە بۆ بەندی یەک. یەک بەندی (٢و ٣) و یەک بەندی (٤ و ٥ و ٦)ی هەبوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: بەندی (٧و ٨)ی هەبوو.**

**عەلی پایندە:** دواتر بەندی یەکیان دەستکاری کرد و دوو بەندی تریان لێ زیاد کرد، کە بەندی (٧ و ٨)ی بوون. دوای دەستکاریکردنی بوو بە بەندی (١و ٧و ٨)، کاتێک زیندانییەکانیان لە زیندانی (قسل حەسار)ەوە هێنا، شەوی یەکەم سەرهەنگ مەنسور زەمانی وتارێکی دا و هەمووانی تەهدید کرد و گووتی: دارکاریتان دەکەم و دەتانکوژم، زیندەبەچاڵتان دەکەم، هەر بە زیندوویی لە پاڵ درەختەکانی حەوشەکەدا دەتانخەمە ژێر خاکەوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئیتر کوردەکانیان هێنا و کردیانن بە سەرۆکی زیندانی قەسر.**

**سەفەرخان:** بەڵێ، کرماشانییەکان، ئەوان کوردانی کرماشان بوون.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: دیارە سەرۆکی تەواوی زیندانییەکە کوردێکی سنەیی بوو.**

**سەفەرخان:** بەڵێ، خەڵکی سنە بوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: وا هەست دەکەم هەموو کورد بوون.**

**سەفەرخان:** سەرهەنگ مەنسور زەمانی کرماشانی بوو، زۆربەی کوردەکان کرماشانی بوون.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: یەحیایی چۆن بوو؟**
**سەفەرخان:** یەحیایی کرماشانی نەبوو، ژمارەیەک لە فەرمانبەران و پاسەوانەکان کرماشانی بوون.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئیتر کوردەکان هاتنە سەر کار.**
**ســـەفەرخان:** بەڵێ. کوردەکان هاتن، بەڵام لە پاڵ ئەواندا کەسانێک هەبوون کە کورد نەبوون، وەکو ســـەروان ســـارمی کە کەســـێکی زۆر خراپ و بەد بوو، ئەو کورد نەبوو، یان ســـەروان عەلایی کە کەســـێکی زۆر باش بوو.

**عەلی ئەشرەف دەرەوێشیان: سەرەوان عەلایی کامە بوو؟**
**عەلی پایندە:** هەمان ئەو سەروان عەلاییە کەسێکی ڕاست و دروست بـــوو، زۆر هاوکاریـــی زیندانییەکانـــی دەکـــرد و ســـاڵی (١٣٥٧) کاتێک بارودۆخـــی وڵات گۆڕا، پەیوەندیی کرد بـــە ڕێکخراوی موجاهیدینەوە، لـــە تێکهەڵچوونەکانی ناو بازاڕدا کوژرا، ئـــەو کادیری ئیدارەی زیندان بوو، ئەو ڕۆژەی کە سەرهەنگ زەمانی هات و وتاری دا، ئەویش لەوێ بوو. سەرهەنگ زەمانی جێگرێکی تری هەبوو، ئەو کەسێکی زۆر خراپ و بەدفەڕ بوو ناوی (قاســـم ژیانپەنا) بوو، ناســـرابوو بە قاســـمە ڕەش، چونکە کەســـێکی ڕەشپێســـت بوو. ئەو ڕۆژەی کە ســـەرهەنگ زەمانی وتـــاری دا ئەویش لـــەوێ ئامادە بـــوو، ڕۆژی دوای وتارەکەی زەمانی زیندانییەکانـــی ئاڵوگۆڕ پێکـــردن. ژمارەیەکیان ناردنـــەوە بۆ بەندی (٢ و ٣). پۆلیـــس بە زیندانییەکانی گووتبوو کە شـــوێنەکانتان دەگۆڕێت و دەچنە لای زیندانییانی تر، نابێت بەیەکەوە چاکوچۆنی بکەن و یەکتری لەئامێـــز بگـــرن. ئەوکات من نوێنـــەری زیندانییەکان بـــووم، کە چوومە ژوورەوە یەکـــەم کـــەس چاوم پێی کـــەوت، ئایەتوڵـــڵا لاهوتی بوو، کە پێشتر لە ساڵی (١٣٥١) لە زیندانی قزل قەڵا بەیەکەوە زیندانیی بووین. ئایەتوڵـــڵا لاهوتی هـــات بۆ لام و یەکتریمان لەئامێز گرت. پاســـەوانێک

چاوی لیمان بوو منی گەڕاندەوە بۆ ئەملاو ئایەتوڵڵا لاهوتیشـــی هێنایە لای منەوە، هەردووکمانی برد بۆ لای سەرهەنگ زەمانی و گووتی: ئەم دووانە یەکتریان ماچکردووە. سەرهەنگ زەمانی گووتی: من تەنها پێنج خولــەک دەبێت بە ئێوەم گووت نابێت یەکتری لەئامێز بگرن و یەکتری ماچ بکەن، ئێستا بۆ ئەو کارەتان کرد؟ سەرهەنگ زەمانی منی دەناسی و شـــارەزای ڕابردووم بوو لە زینداندا، خۆشـــی نەدەویستم و بەدوای بەهانەیەکدا دەگەڕا کە ئازارم بدات. من ویستم وەڵامی نەدەمەوە، بەڵام ئایەتوڵــڵا لاهوتی وەڵامی دایــەوە و گووتی: ئەم برادەرە هیچ تاوانێکی نەکــردووە، مــن هاتم بــۆ لای و لەباوەشــم گرت، من ســاڵی (١٣٥١) لەگەڵ ئەودا لە زینداندا بووم، ئایا دەکرێت دوو کەس لە شوێنێکدا ببنە هاوڕێ و لە یەکتری داببڕێن و دوای ســاڵ و نیوێک یەکتری ببیننەوە و یەکتری لەئامێز نەگرن. ئێستاش تۆ چیت پێخۆشە ئەوە بکە. وەڵامی منیـش هەمان وەڵامــی ئایەتوڵڵا لاهوتی بوو. ســەرهەنگ کەمێک ڕاما و دواتــر ئێمەی گەڕاندەوە بۆ ناو زینــدان و هیچی نەکرد. دوای چەند ڕۆژێک دووبارە منیان گواستەوە بۆ بەندی (٤ و ٥) لەوێ سەفەرخانم دۆزییەوە و یەکتریمان لەئامێز گرت و گووتم: سەفەرخان چی دەکەیت! یەکەمجــار بــوو ئەم وتەیە لە ســەفەرخان ببیســتم، گووتی: دەمەوێت ئازاری زیندان بکێشم، ئەو هەرگیز بەوجۆرە قسەی نەکردبوو. گووتم: چی بووە؟ کە سەیرم کرد زانیم زۆر ناڕەحەتە. گووتی: ئەم زیندانییانە کاریگەریــان کردووە ئەم زیندانەیان بە تەواوی گۆڕیوە، کە ئێســتا خۆت دەبینــی، تەنانــەت جگەرە بە من نادەن، ئێســتا من جگــەرەی لە کاغەز دروستکراو دەکێشم، پۆلیس کاریگەری کردووە تەنانەت جگەرەشمان پێ نادەن. بەهەرحاڵ باری زیندان زۆر گران ببوو، پاســەوانی وەکو ستار مورادی پەیدابیوو. نازانم بیرتە، یان نا.

**عەلی ئەشـــرەف دەروێشـــیان: بەڵێ، لەیادمە بە زمانی تورکی قسەی دەکرد.**

**ســـەفەرخان:** بەڵێ، ئەو تورک بـــوو، پاســـەوانێکی توندوتیژ بوو، بەبـێ هـۆ زیندانییەکانی ئازار دەدا، دیارە لەگـەڵ مندا باش بوو، بەڵام زۆرجـار بەبێ هـۆ زیندانییەکانی دەبرد و ئەشـکەنجەی دەدان. چەند پاســـەوانێکی تری لەو جۆرەش هەبوون، کە بەردەوام بەدوای کێشە و ئاژاوەدا دەگەڕان، هەروەکو (نامیان و عەبدی)، کە دوو جەللاد بوون و زیندانییەکانیان ئەشکەنجە دەدا و جێژیان لەو ئەشکەنجەیە وەردەگرت.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەی لەبارەی کەشایی، کە سەرۆکی پاسەوانان بوو.**

**سەفەرخان:** بەڵـێ کەشایی! یەک هەفتە دوای هاتنی عەلی پایندە بۆ بەندی (٤ و ٥)، کێشـــەیەک هاتە پێش و ئەو لە کۆمەڵەکە هاتە دەرەوە، ئەمــە بەلای زیندانییەکانـــەوە نامۆ بوو، چەند زیندانییەک ڕۆیشـــتن بۆ لای و گووتیان بۆچی لە کۆمەڵەکە چوویتە دەرەوە. هاتوچۆ و وتووێژ ماوەیەک بەردەوام بوو، پۆلیس و پاسەوانەکان هەستیان بەم هاتوچۆیە کرد و لە حەوشـــەکەوە هەموو شـــتێکیان دەبینی. ئەم ڕەوشـــە ماوەی (٢٤) کاتژمێـری خایانـد، دوای ئەو ماوەیە پۆلیس بانگی عەلی پایندەی کرد و بردیان بۆ ژووری تاکەکەسی. خۆت ژووری تاکەکەسی زیندانی قەسرت بینیوە.

**عەلی ئەشـــرەف دەروێشـــیان: بەڵێ، بەو ژوورانەیان دەگووت ژووری دەرگای تەختە.**

**ســـەفەرخان:** ڕاســـتە، پێیـــان دەگـــووت دەرگای تەختەیـــی، لەوێ ســـەرهەنگ زەمانی و ســـەروان ژیانپەنا، عەلی پایندەیان هەڵواســـی و دەســـتیان کرد بە لێدانی و پێیان دەگووت باســـی ئەو کۆبوونەوانەمان بۆ بکە کە لەگەڵ ئەو زیندانییانەی دەهاتن بۆ بەندی (٤ و ٥) ئەنجامتان

دەدا. ئەویش دەیگووت لەگەڵ ئەو زیندانییانە لە زیندانەکانی تر بەیەکەوە بووین و ئێمە دەمێکە یەکتری دەناسین، ئێمە تەنها چاک و خۆشیمان لەگەڵ یەکتردا کردووە. دوای لێدانێکی زۆر، دواتر بۆ تەمێکردن سێ ڕۆژ خستیانە ژووری تاکەکەسییەوە، دواتر بردیانە زیندانێکی تری ئاسایی، چونکە یاساکە ئەوها بوو نەدەبوو زیاتر لە سێ ڕۆژ لە ژووری تاکەکەسیدا بمێنێتەوە، واتە زۆرترین کاتی مانەوە لە ژووری تاکەکەسیدا سێ ڕۆژ بوو. هەموو زیندانییەک پێش تەواوکردنی حوکمی دادگا، دەبووایە دوو سێ ڕۆژ بخرێتە ژووری تاکەکەسییەوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەو ژوورانەش زۆر تاریک بوون.**

**سەفەرخان:** بەڵێ، تاریک و گەرم و پیس بوون. بەهەرحاڵ پاسەوانەکان دەهاتن و ئەویان دەبینی و دەیانگووت بۆچی ڕووتیت؟ ئەویش دەیگووت من بە تەواویی خۆم ڕووت نەکردووەتەوە، نابینن شۆرتم لەبەردایە و گەرمامە و چی بکەم؟ پاسەوانەکانیش دەیانگووت: نابێت، دەبێت جلەکانت بە تەواویی لەبەر بکەیت. عەلی پایندە دەیگووت من ئەو کارە ناکەم، پاسەوانەکانیش هەڵیاندەواسی و لێیان دەدا. عەلی دەیگووت: ئەگەر ئەوەندەم لێبدەن، ئەوا مان دەگرم و نان ناخۆم. منیش ڕۆیشتم و ناڕەزاییم دەربڕی، هەڕەشەی مانگرتنم کرد. ئیتر ئەوانیش بە ناچاریی دەستیان لە عەلی هەڵگرت و هێنایانەوە بۆ لای ئێمە بۆ بەندی (٤ و ٥). دووبارە زیندان خەریکبوو دەگەڕایەوە باری ئاسایی خۆی، بەڵام هێشتا توندوتیژیی مابوو، دووبارە پێداویستییە وەرزشییەکانیان بە من دایەوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەو پێداویستییانە هەمان پێداویستی ئاسنین بوون.**

**سەفەرخان:** بەڵێ، ئەو پێداویستییانە ئاسنین بوون، میلی وەرزشیم هەبوو، من بە تەنها دەژیام و لە کۆمەڵەکەدا نەبووم. کۆمەڵە بۆ من

نەدەبوو، کێشەی هەبوو، ئەو کۆمەڵەیە بۆ کەسانی بەتەمەنی وەکو من نەدەبـوو، هەرچەندە حەزیشـم نەدەکرد لـە دەرەوەی کۆمەڵەکە بژیم، بەڵام لە دەرەوەی کۆمەڵەکە ئاسوودەتر بووم، کاتی خەو و خواردن و ئامادەکردنی خواردن بەدەست خۆم بوو، بۆیە بەو جۆرە بۆ من باشتر بـوو، دوای دەرچوونی عەلـی پایندە لە کۆمەڵەکە، چوار پێنج کەسـی تریـش بەدوای ئەودا دەرچوون، کە دووانیان بریتیبوون لە عەبدوڵڵای مەهدی و سابیری قولیزادە، کە نازانم ئەوانت بینیبوو، یان نا؟

**عەلی ئەشـرەف دەروێشـیان: عەبدوڵڵای مەهدیم بینیبوو، لە زیندانی ئەوین بەیەکەوە بووین.**

**سـەفەرخان:** بەڵێ، بە دڵنیاییەوە دەیناسـیت، ئەو کەسێکی ناسراو بوو، نەجی ڕەسوڵی و سەید زیائەدین تەباتەبایش بوون.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: نەجی ڕەسوڵی کەسە لاوازەکە بوو.**

**سـەفەرخان:** بەڵـێ، زاوای عەبدوڵـڵای مەهدیە، بەڵـێ، جگە لەوە خزمایەتیشـیان بەیەکـەوە هەیـە، ئەوانیش و ئەسـغەری فەتاحیش کە ئێستا لە دەرەوەی ئێرانە بەیەکەوە لە کۆمەڵەکە هاتنە دەرەوە.

**عەلی ئەشـرەف دەروێشیان: ئەسـغەری فەتاحی کەسێکی باڵا کورتی چوارشانە بوو.**

**سـەفەرخان:** بەڵێ، ئەوان لەسـەر ئەو ڕەفتارانەی بەرامبەر عەلی پایندە کرا، لە کۆمەڵەکە هاتنە دەرەوە و خۆیان کۆمەڵەیەکیان دروستکرد و منیش چوومە ناو ئەو کۆمەڵەیەوە.

**عەلی ئەشـرەف دەروێشیان: هۆکاری هاتنەدەرەوەی ئەوانم لە کۆمەڵەکە پێ بڵێ.**

**سـەفەرخان:** کێشـەی هەریەکێکیان جیـاواز بوو، دواتر لە سـاڵی

(١٣٥٥) برادەرانی موجاهیدینیش لە کۆمەڵەکە هاتنە دەرەوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەی دوای بردنی ئاغای ئەنواری و ئاغای حاجی عێراقی بۆ کۆمیتە؟**

**عەلی پایندە:** بەڵێ، ئەو کێشەیە دواتر دروستبوو، ئەوان بە زۆری دوو کێشەیان هەبوو، یەکێکیان جیاوازیی ئایدیۆلۆژی بوو، کە چریکەکان ئەوانیان قبووڵ نەدەکرد. ئەوان بۆچوونێکی ماینرەوییان پێشنیارکردبوو، کە دواتر بووە هۆی جیابوونەوەی (ڕاهی کارگەر) بە ڕێبەرایەتی هیدایەتی سوڵتان زادە و ئەسغەری ئەیزەدی و محەمەدی شالگونی و ئیبراهیمی ئەنزایی بوو، کە زۆربەیان چووبووونە ناو گرووپی فەلەستینییەکان، لە ڕوانگەی مارکسییەوە ئەمانە لە ئەوان پێشکەوتووتر بوون، بە تایبەت محەمەد ڕەزای شالگونی زانیاری لە ئەوانی تر زیاتربوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ناسری کاخساز لەگەڵ ئەواندا نەبوو؟**

**عەلی پایندە:** نەخێر، ناسر لەگەڵ ئەواندا نەبوو، ئەو لە زیندانی ئەوین بوو، بەهۆی لێدانەوە مێشکی زیانی پێکەوتبوو خوێن لە گوێچکەیەوە دەهات. بەڵێ، ئەوانەی کە گووتم ڕێگەی کارگەر (ڕاه کارگر)یان دامەزراند، نزیکەی (٦٤) کەس دەبوون و لە کۆمەڵەکە هاتنە دەرەوە. لەو کاتەدا ئەو کێشەیە دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبوو. خاڵی دووەم ئەوەبوو کە هەندێک ئاماژەیان بە کێشە کەسییەکان دەکرد. بۆ نموونە ئەگەر کەسێکی نەخوازراوی بێ بیروباوەڕ فەرمانەکانی کۆمەڵەکەی جێبەجێ بکردایە، ئەویان دەخستە سەرووی کۆمەڵەوە، بەبێ ئەوەی کە سەیری ڕابردووی بکەن، بەڵام لەبەرئەوەی هەموو فەرمانەکانی ئەوانی جێبەجێ دەکرد، ئەوانیش کاری گرنگیان پێ دەسپارد. هەر بەو هۆیەشەوە بوو شەش حەوت کەس لە کۆمەڵەکە

هاتنــه دەرەوە و لایەنگری هیچ لایەنێکیان نەکرد و خۆیان کەنار گرت، چونکــە بۆچوونەکانــی ئەوان ئــەوە نەبوو، بەڵکــو زۆر گەورەتر بوو، ئەوان ڕەخنەیان لەسەر ڕووداوەکان هەبوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ڕەخنەیان لە چی هەبوو؟**
**سەفەرخان:** ئەوان لە سەرەتاوە ڕەخنەیان لە دامەزراندنی کۆمەڵەکە هەبوو، بە هەڵەیان دەزانی، من دەمویســت لەبارەی ژیانی خۆم قسەت بۆ بکەم، بۆیە ئەمانەم بۆ باسکردیت، چونکە پەیوەندییان بە باسەکەوە هەبوو، بۆیە بەشێوەیەکی سادە ئاماژەم پێداوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: بەڵێ، پەیوەندییان هەیە.**
**سەفەرخان:** ئەو کاتە من لە ژوورەکانی ژمارە (٤ و ٦) بووم، چەند کەسێکی تریش لەوێ هەبوون.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: شەهید زەندیش هەر لەوێ بوو؟**
**ســەفەرخان:** نەخێر شــەهید زەند لە ژووری ژمارە یــەک بوو، لە ژوورەکــەی مندا محەمــەد عەلی هەبوو، جەلال سەمســامی هەبوو کە ســەر بــە موجاهیدین بــوون. ئەبولقاســمی ســەرحەدی زادە و کامیل بەجنەوەردی و حوســێن ڕەزاییــش لەوێ بــوون، ئاخوندێکیش لەوێ بوو، ئەو کەســێکی زۆر چەپ بوو، نــاوی کلانتەری بوو، نازانم دوایی چی بەسەرهات.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشــیان: حوجەتولئیســلام بــوو، یان ئایەتوڵلا؟**
**سەفەرخان:** حوجەتولئیسلام بوو، کەسێکی لاو بوو، زۆر چەپ بوو.

**عەلـــی ئەشـــرەف دەروێشـــیان: حوســـێن ڕەزاییـــش ئەندامی کۆنفدراسیۆن بوو؟**

**سەفەرخان:** ئەندامـــی کۆنفدراسیۆن بوو، لەگەڵ نوێنەرێکی ئەڵمانی کـــە ناوەکەیم لەیاد نەماوە هاتبوو بۆ ئێران، لەگەڵ ئەودا هاتبوو، بەڵام دەســـتگیریان کردبـــوو، لە ژوورەکەی بەرامبەر ئێمـــەدا ژووری ژمارە حـــەوت هەبـــوو، کە لەو ژوورەدا ئەم عەلی پایندە و عەباس ســـەماکار و ڕەزای عەلامـــەزادەی تێدابـــوون، لەگـــەڵ کوڕێکـــی شـــێتی خەڵکـــی سیســـتان. بەهـــزاد نەبەویش لەوێ بوو کە لەگەڵ کەســـێکی عێراقی بە ناوی عەبدول عەلی عۆدە، کە بە تاوانی ســـیخوڕیی دەســـتگیرکرابوو، ئەشـــکەنجەیەکی زۆریان دابوو، مێشـــکی تێکچووبوو، بەردەوام لەگەڵ تەواوی زیندانییەکاندا لە شەڕدا بوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: بەرنامەی ڕۆژانەی تۆ چی بوو؟**

**ســـەفەرخان:** ئەگـــەر ڕەوشـــەکە لەبـــار بووایە و پۆلیس کێشـــەی دروســـت نەکردایـــە، بەیانیـــان زوو لە خەو هەڵدەســـام و ســـەرەتا لە حەوشـــەکەدا پیاســـەیەکم دەکـــرد، دوای خواردنـــی نانـــی بەیانی، یەک چارەکـــە کاتژمێر دەخەوتم و دواتر دەڕۆیشـــتم بـــۆ ئامادەکردنی نانی نیوەڕۆ. دیارە پێش خواردنی نانی نیوەڕۆ ســـەیرێکی ڕۆژنامەم دەکرد و زیندانییەکان ســـەردانیان دەکردم و باســـی باری ناوخۆ و دەرەوەی زیندانمـــان دەکـــرد. دوای نانخواردنـــی نیوەڕۆ، چونکە لـــە کاتژمێر (١ تـــا ٢) دەبووایـــە هەموومـــان بێدەنگ دانیشـــین، نزیکەی نیـــو کاتژمێر، یـــان کاتژمێرێـــک دەخەوتم، دواتـــر تەرمۆزەی چایەکـــەم هەڵدەگرت و دەڕۆیشـــتم لە حەوشـــەکەدا لەژێر درەختێکدا دادەنیشـــتم. (دیارە کاتی هاوین) و لەگەڵ زیندانییەکان دەکەوتمە وتووێژ، دیارە من بە شکاندنی شەکر حەساسییەتم هەیە، عەلی پایندە شەکرەکەی دەشکاند و دەیکردە کیســـەوە، ئەو بەرنامەیەم ئەو کاتە پیادە دەکرد کە کەشەکە لەبار بوو، پۆلیـــس هێرشـــی نەدەکـــردە ســـەرمان و زیندانییەکان تـــا ڕادەیەک لە

ئارامیدا بوون. لە پێش نانخواردنی ئێوارەدا ماوەیەک وەرزشم دەکرد. لە لای باشووری خۆرئاوای حەوشی بەندی سێ، شوێنێک هەبوو ئێمە دەڕۆیشتین بۆ ئەوێ، زیندانییەکان کەلوپەلی وەرزشییەکانیان دەهێنا و کاتێک وەرزشکردن تەواو دەبوو، کەلوپەلەکانیان تەسلیم بە پۆلیس دەکردەوە، چونکە قەدەغە بوو ئەو کەلوپەلانە لای خۆمان بمێنێتەوە.

لەولای منەوە چەند کەسێکی تر هەبوون، ئەوانیش دەیانویست وەرزش بکەن، یادەوەرییەک هاتەوە یادم لە کەسێک بە ناوی زاگرۆسی خوسرەوی، ئەو خەڵکی مهاباد بوو، لە کوردەکانی مهاباد بوو، خۆی لە بنەڕەتدا خەڵکی نەغەدە بوو، بەڵام لە مهاباد دەژیا، ئەو لەسەر ئەوە دەستگیرکرابوو، کە پەیوەندیی بە کوردەکانەوە هەبوو، پێنج ساڵ حوکم درابوو، ئەو کەسێکی بەهێز و پتەو و بەخۆوە بوو، زۆر بە باشی بە زمانی تورکی قسەی دەکرد. ڕۆژێکیان کاتی عەسر بوو، ئەم زاگرۆسە هات و دەستیکرد بە وەرزشکردن، کاتی هاوین بوو، هەوا زۆر گەرم بوو، زۆر بە پەلەپەل و بەخێرایی وەرزشی دەکرد. دەستیکرد بە بەرزکردنەوەی ئاسنی قورس و لەپڕێکدا هاوارێکی کرد و کەوتە سەر زەوی و بێهۆش کەوت و ئاگای لە خۆی نەما. بە زوویی هەندێک شەکراومان بۆ گرتەوە و کردمان بە دەمییەوە و دوای کەمێک بەهۆش خۆی هاتەوە و بردمانەوە ژوورەکەی خۆی. من ڕۆیشتم بۆ حەمام و ئاوێکم بە خۆمدا کرد و هاتمەوە و سەردانێکم کرد، سەیرم کرد زاگرۆس باش بووەو قنج دانیشتووە خەریکی چایی خواردنەوەیە. منیش هێشتا خاولییەکەم بەسەر شانمەوە بوو، بۆ بەرزکردنەوەی ورەی ئەو بە زمانی تورکی پێم گووت: زاگرۆس تۆ بەو تەقوتۆقەت ویستت ببیت بە تۆپچی. من ئەوەم گووت و زاگرۆس دەستیکرد بە پێکەنین. ئەو کەسێکی بەڕێز و خۆشەویست بوو، لە کوردە تێکۆشەرەکان بوو، وابزانم ئێستا لە وڵاتی ئەڵمانیایە.

دوای وەرزشکردن دەڕۆیشتم بۆ حەمام و دواتر نانی ئێوارەم دەخوارد، دوای نانخواردنی ئێوارەش لە حەوشەکەدا پیاسەم دەکرد

تاکـو کاتی خەوتن. ڕۆژی دواتریش لەسـەر هەمان بەرنامە بەردەوام دەبووم. چەند جارێکیش ڕێک دەکەوت چەندین ڕۆژ وەرزشم نەدەکرد، چونکـە کەلوپەلـی وەرزشـکردنیان پـێ نەدەدایـن. بۆیە بـە ناچاریی هەریەکەمان لە گۆشـەیەکدا دادەنیشـتین و بیرمان لـە گرفتارییەکانی خۆمـان دەکردەوە. ئێمـە لە زینداندا تووشـی کێشـەیەک ببووین، کە ئەویش سەرهەنگ زەمانی بۆی دروستکردبووین، کێشەکەش ئەوەبوو دەبووایـە زیندانییە مەزهەبییەکان بەیانیـان دوای هەتاوکەوتن نوێژی بەیانی بکەن. مەزهەبییەکان ئەو بڕیارەیان پەسـەند نەکرد و دەستیان کـرد بـە مانگرتـن و دەیانگووت پێویسـتە ئێمە نوێژەکانمـان لە کاتی خۆیـدا بکەین. هەربۆیە موجاهیـدەکان و مەزهەبییەکانـی تر بەیانیان زوو هەڵدەسـتان و دەستیان دەکرد بە نوێژکردن. پۆلیسیش دەهات و دارکاریی دەکردن و دەیبردن بۆ شوێنی ئەشکەنجەدان و ئەشکەنجەیان دەدان. خۆ ئەگەر کەسـێکیش پێویسـتبووایە بەیانی زوو هەڵبسـتایە و بچووایە بۆ حەمام، ئەوا ئەویش ئەشکەنجە دەدرا. چەندین جار پۆلیس هاتـن و ئەوانی ئەشـکەنجە دەدا، لەسـەر ئەو بابەتە ئێمـە نەمانتوانی بێدەنگ بین و ڕۆیشـتین بۆ لای پۆلیس و ناڕەزاییمان دەربڕی. پێمان گووتن ئێوە یان موسـڵمانن، یان لانیکەم لە وڵاتێکی موسڵماندا دەژین، ئاخـر تاکو ئێسـتا کێ دوای خۆرهەڵاتن نوێـژی بەیانی کردووە؟ ئێوە باوکیشـتان ئەو کارەی نەکردووە، ئەگەر خۆشتان نوێژخوێن بن، بەو جـۆرە نوێژ ناکەن، بۆچی فشـار بۆ ئەم نوێژخوێنانـە دەهێنن؟ ئەمانە مافی خۆیانە لە کاتی خۆیدا هەڵسن و نوێژەکانیان بخوێنن. لەسەر ئەم ناڕەزایـی دەربڕینە ئازاریاندایـن و چەند کەسـێکیان بردین بۆ ژووری تاکەکەسـی. ئەوانی تریشـمان گەڕاینەوە بۆ ژوورەکانی خۆمان. دوای چەنـد ڕۆژێـک هەمـوو ئەوانەی کە برابـوون بۆ ژووری تاکەکەسـی گەڕاندیاننەوە بۆ ژوورەکانی خۆیان.

ڕۆژێکیان کاتی بەیانی بوو، تازە نانی بەیانیمان خواردبوو، هەندێک کەس نانیان نەخواردبوو، پاسەوانێک هات و گووتی: هەمووتان بە پێی

پەتی بڕۆنە حەوشـــەکەوە، هیچ کەســێک بۆی نییە پێڵاوی لەپێدا بێت. بەندی (٤ و ٥ و ٦) نزیکەی پێنجسەد زیندانیی دەبووین، هەموومانیان بردە حەوشەکەوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان:** ئەوە ساڵی چەند بوو؟

**عەلـــی پاینـــدە:** ســاڵی (١٣٥٣)، هاوینــی ســاڵی (١٣٥٣/ ١٩٧٤) بــوو، ئێمەیان بــردە ناو حەوشــەکە و لە لایەکی حەوشــەکەدا کۆیان کردینەوە، سەرم هەڵبڕی و سەیرم کرد لەسەرەوە ئەوەندەی ژمارەی زیندانییــەکان ســـەربازیان هێنابــوو و لــە ســـەربانی زیندانەکە کۆیان کردبوونــەوە. لەناویاندا ســەرهەنگ موحەڕەڕی و ســەهەنگ زەمانی هەبــوون، هەروەهــا ژیانپەنــا و چەنــد ئەفســـەرێکی تریش. ســەرەتا جەنەڕاڵ موحەڕەڕی ڕۆیشــتە ســـەربان بۆ وتــاردان و هەمان وتاری ســاڵی پێشــووتری دووبارەکردەوە و هەمان ڕستەی قەوام سەڵتەنەی دووبارەکردەوە، کە گووتبووی ئێمە بڕیارمان داوە هەڵسوکەوتی تازە ڕەچاو بکەین بەرامبەر بە زیندانییان. ئەو وتاری خۆی پێشــکەش کرد و دوای ئــەو ســـەرهەنگ زەمانی هات، ئەو لــە وتارەکەیدا ئاماژەی بە ئــەوە داو گووتی: ئێمــە ئاگادارین هەندێک لە ئێوە دەتانەوێت یاســای زینــدان جێبەجێ بکەن، بەڵام لە ئەوانی ترتان دەترســن، وەک نموونە ناوی چەند کەسێکی هێنا و گووتی: ئەمانە دوای کاتژمێر پێنج دەتوانن نوێژەکانیــان بەبــێ کێشــە ئەنجام بــدەن، دەزانم چەند کەســێکتان لە کردەوەکانتــان پەشــیمانن، بەڵام لە ترســی هاوڕێکانتان ناوێرن دەری ببــڕن، بۆیە من لێرەوە بە هەمــوو ئەوانە دەڵێم: ئەگەر ئێوە دەتانەوێت لــە زیندان ئازاد بکرێن، ئەوا دەتوانن ڕاســتەوخۆ پەیوەندیی بە ئێمەوە بکەن تاکو ئێمەش کێشەکانتان بۆ چارەسەر بکەین.

ســەرهەنگ زەمانیــش وتارێکی پێشــکەش کرد، کە بــە لای ئێمە و مەزهەبییەکانــەوە وتارێکــی ناڕاســت و دووڕوو بــوو، ئەویــش هاتە خوارەوە و دوای وتارەکانی ئەوان، مەســعود ڕەجەوی ویســتی قســە

بکات و گووتی: سوێند بە خودای گەورە، سوێند بە قورئان و بە پێغەمبەر، ئێمە هیچ مەبەستێکی خراپکارانەمان نییە، تەنها دەمانەوێت بەیانیان نوێژەکانمان بکەین، بەڵام ئێوە دەتانەوێت ڕێگریمان لێ بکەن و ئازارمان بدەن و دۆسیەمان بۆ دروست بکەن، لێمانگەڕێن با چەند بەیانییەک هەڵسین و نوێژەکانمان بکەین، ئەگەر کێشەیەکمان دروستکرد، ئەوکات هەر کارێک دەکەن بیکەن. دوای ئەو شوکروڵڵای پاکزاد مۆڵەتی قسەکردنی وەرگرت و چووە سەر تەختەکە و ڕووبەڕووی موحەڕەڕی وەستا و گووتی: تۆ ئاماژەت بە ئەوە کرد کە چەند کەسێک پەشیمانن لە هەڵوێستەکانیان، تکات لێدەکەم من لەگەڵ ئەو زیندانییانەدا نیم کە پەشیمانییان دەربڕیوە، من هەرگیز لە کارەکانی خۆم پەشیمان نیم.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ڕووبەڕووی سەرهەنگ موحەڕەڕی ئەو قسانەی کرد؟**

**عەلی پایندە:** بەڵێ، ڕووی کردبووە موحەڕەڕی و زەمانی. پاک نەژاد گووتی: من نەک تەنها پەشیمان نیم، بەڵکو خۆشحاڵم کە چوومەتە دادگا و بەرگریم کردووە، خۆشحاڵم کە بە حوکمی هەتاهەتایی حوکم دراوم، خۆشحاڵم کە لەگەڵ کەسانێکدا لە زینداندام، کە دەتوانین بەیەکەوە لە بەرامبەر ئێوەدا بوەستینەوە، بەڵێن دەدەم هەتا توانام هەبێت لە دژایەتیکردنی ئێوەدا بەردەوام دەبم، لێرەدا تەنها تکای ئەوەتان لێ دەکەم من لەگەڵ ئەو کەسانەدا حساب مەکەن کە دەڵێن پەشیمانین لەو کارەی کردوومانە. تکایە ئاگاداربن من جیاوازم لەگەڵ ئەو کەسانەدا، ئەم قسانەی کرد و لەسەر تەختەکە هاتە خوارەوە.

دیارە پۆلیس لەو وتانە هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو، هیچ کارێکیان نەکرد، سەرهەنگ موحەڕەڕی و داروودەستەکەی ڕۆیشتنە دەرەوە. لەو ڕێکەوتە بەدواوە فشارەکانیان کەمتر کردەوە. بۆ سبەی بەیانی مەزهەبییەکان هەڵسان بۆ نوێژکردن، بەڵام پۆلیسەکان هیچ

کاردانەوەیەکیان نەبوو، ئەمە یەکێک بوو لەو ئاڵۆزییانە کە پۆلیسەکان خۆیـان خولقاندیان، خۆشـبەختانە ئـەم ئاڵۆزییە هیچ کێشـەیەکی لێ نەکەوتەوە، تەنها چەند کەسێکیان بردن و هەندێکیان لێدان و خستیاننە ژووری تاکەکەسـییەوە، بەڵام بە گشتی ئاڵۆزییەکە کۆتایی هات و هیچ زیانێکـی ئەوتـۆی لێ نەکەوتـەوە. لەو ماوەیەدا سـەفەرخان خەریکی ژیانی ئاسـایی خۆی بوو، نە گرفتاری هەڵوێسـتی توندڕەوەکان بوو، نە گرفتـاری بۆچوونەکانی پۆلیس بوو، ئـەو زیندانییەکی دوورخراوە بوو، زۆر کاریان بەسەریەوە نەبوو، زۆر ئازاریان نەدەدا، من ئەوکات زۆر ئاگاداری زیندانی ژمارە شـەش نەبووم، نازانم تۆ لە چ سـاڵێکدا ڕۆیشتبوویت بۆ ئەوێ.

**عەلی ئەشـرەف دەروێشـیان: من لە سـەرەتای ساڵی (١٣٥٤) هاتمە بەندی یەک، سـەرەتا لە بەندی دوو و سـێ بووم، دواتر گواسـترامەوە بۆ (٧ و ٨). دوای ئەوەی دادگایـی کرام، بردیانمە بەندی (٤).**

**سەفەرخان:** بەڵێ، من جارجارێک تۆم دەبینی، تۆ ئەوکات لە بەندی ژمارە چوار بوویت، بەندی ژمارە شەش لە بەندی ژمارە چوار هێمنتر و بێدەنگتر بوو.

**عەلی ئەشـرەف دەروێشیان: بەڵێ ڕاست دەکەیت، دێتەوە یادم ڕۆژێکیـان میوانی تۆ بووم، لە هەمان تەرمۆزەکەی خۆت چایەکت بۆ تێکردم.**

**سـەفەرخان:** بەڵێ تـۆش چایی ئـەو تەرمۆزەیەت خـواردەوە، تۆ دۆسـیەکەت لەگەڵ ناسـری ڕەحمان نەژاد بوو، دێتەوە یادم زۆر کات لەسـەر کێشـەیەکی بچووک لێیان قەڵس دەبووم، ئایـا هیچ کات لە تۆ قەڵس بووم؟

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: نەخێر، هیچ کات.**

**ســەفەرخان:** ئەم عاجزبوونە جۆرێک بوو لە ســەرگەرمی، ئامانج لێــی ئــازاردان نەبــوو، ڕۆژێکیــان عەلــی پایــندە دۆڵمــەی گەڵامێوی دروســتکردبوو، واتــە لەگــەڵ هەمان ئەو گرووپەی کە شــەش حەوت کەس بوون، ئەو هات بۆ لام و گووتی: ئەمڕۆ خواردن دروســت مەکە و نیوەڕۆ لای ئێمە میوانیت. گووتم: زۆر باشە.

ڕۆژانــە لە کاتــی نانخواردنی نیوەڕۆ و ئێوارەدا دەرگای هەرســێ بەنــدی (٤ و ٥ و ٦) دەکرانــەوە و هەمووومــان بەیەکــەوە نانی نیوەڕۆ و ئێوارەمــان دەخوارد، دەرگاکان کرانەوە و دیســانەوە عەلی هات بە شوێنمدا و گووتی: خواردن ئامادەیە وەرە با نانەکەمان بخۆین. منیش گووتم: تۆ بڕۆ ئێســتا منیش دێم، دوای دە خولەک دووبارە هاتەوە بە شوێنمدا و گووتی: خان بۆچی نایەیت، خواردنەکەمان سارد دەبێتەوە. گووتم: بڕۆ وا دێم، چەند خولەکیکی پێچوو من هەر نەڕۆیشــتم. عەلی دووبارە هاتەوە و گووتی: بابە خان بۆ نەهاتی. گووتم بڕۆ من هەرگیز نایــەم بۆ لاتان. ئەو پیداگریی کرد کــە بچم، منیش تورە بووم و چەند ڕۆژێک خۆم لێ زیز کرد، بۆ بەیانی بە لامدا تێپەڕی و سڵاوێکی کرد، منیش بە هێواشی وەڵامم دایەوە، دواتر بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک چاوم پێی نەکەوتەوە، ئاگام لێی نەما. ڕۆژێک چاوم بە (نەجی ڕەسوڵی) کەوت و هەواڵی عەلیم لێپرســی. گووتی: بەهۆی سەرماوە نەخۆشکەوتووە و تایەکی زۆری هەیە و لە جێگادا کەوتووە. منیش کاتی عەسر تەرمۆزە چایەکەم و دوو پەرداخم هەڵگرت، چونکە نەخۆش بوو زیزبوونی خۆم وەلانا و چووم بۆ سەردانی.

بەڵێ، ســەرهەنگ زەمانی هەمــوو هەوڵەکانی لەپێناوی ئەوەدا بوو کــە زیندانییــان ئازار بــدات، واتە هەمــوو ئامانجی ئەوەبــوو کە لەناو زیندانــدا پشــێویی دروســت بــکات و نەهێڵێــت زیندانییــەکان ئارام و ئاســودە بن. ئەوەش ڕاستە هەندێک جار ئێمەی زیندانییش پشێوییمان دروســت دەکرد، زۆرباش لە یادمە ڕۆژی مەراسیمی (٢٨)ی موردادی

ساڵی (١٣٥٣) بوو. کاتژمێر دووی دوانیوەڕۆ بوو، بڵندگۆی زیندان کەوتە کار و دەستی کرد بە ناو خوێندنەوە، هەر ناوێکی دەخوێندەوە؛ ئێمە بە سەرسوڕمانەوە سەیری یەکتریمان دەکرد. یەکەم ناویش کە خوێندرایەوە، بەهزادی نەبەوی بوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: بۆئەوەی بڕۆن بۆ مەراسیمەکە؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، بۆئەوەی بڕۆن بۆ مەراسیمی (٢٨)ی مورداد. بەهزادی نەبەوی بە هیچ جۆرێک باوەڕی بەو مەراسیمە نەبوو، بەدوای ئەودا ناوی ڕەزای عەلامە زادە و عەباسی سامکار خوێندرایەوە. دواتر ناوی چەند کەسێکی تر خوێندرایەوە، کە هیچ کام لەوانە لایەنگری مەراسیمی (٢٨)ی مورداد نەبوون، بەڵکو زۆر دژایەتییان دەکرد. لەپڕێکدا ناوی منیش خوێندرایەوە، من لەو کاتەدا خەریکی وەرزشکردن بووم و گوێم لە خوێندنەوەی ناوی خۆم نەبوو، ئەوانەی ناویان خوێندرایەوە، هیچ کامێکیان باوەڕیان بە مەراسیمی (٢٨)ی مورداد نەبوو، ئەم مەراسیمە تەنها بۆ ئازاردانی زیندانییان بوو. ئێمە بۆ ساڵی داهاتوو هەمان پێشبینیمان هەبوو، کە چەندین کەس ناویان بخوێندرێتەوە بۆ بەشداریکردنی هەمان مەراسیم، بۆیە ساڵی داهاتوو کە لە (٢٨)ی مورداد نزیکبووینەوە بە عەلی پایندەم گووت: یەک کەللە شەکری گەورەم بۆ بکڕە. عەلی گووتی: خان تۆ کەللە شەکرت بۆچییە؟ خۆ تۆ شەکر ناشکێنیت. گووتم: باسی مەکە، من کەللە شەکرێکم دەوێت بۆئەوەی ئەگەر بانگیان کردم بۆ مەراسیمی (٢٨)ی مورداد کەللە شەکرەکە بکێشم بە سەری پاسەوانەکەدا، یان بە سەری ئەو کەسەی دێت بە زۆر بمبات بۆ مەراسیمەکە. عەلی گووتی: کاکە ئەوان بەزۆر کەس نابەن، تەنها بانگتان دەکەن، خۆ ئەگەر بە بانگکردنەکە نەڕۆیشتن، دوایی لێکۆڵینەوەتان لەگەڵدا دەکەن، خۆ دیارە مەبەستیان لەو بانگکردنە چییە؟ تەنها دەیانەوێت ئازارمان بدەن و تووشی کێشەمان بکەن.

**عەلی ئەشـــرەف دەروێشـــیان: عەلـــی کەللـە شـــەکرەکەی بۆ دابینکردیت؟**

**سەفەرخان:** نەخێر. کار بە ئەوە نەگەیشت، ناوی من نەخوێنرایەوە، مـن ئەم فێڵە لە زیندانییەکی کورد لـە زیندانی بەرازجان فێربووم، ئەو هەمیشـە کەللە شـەکرێکی پێبوو، من لێم پرسـی ئەم کەللە شەکرەت بـۆ چییە هەمیشـە لەلاتە بۆ نایشـکێنی و بە چـاوە نایخۆیت، ئەویش وەڵامـی دامـەوە و گووتی: ئەمـە لای خۆم دەیپارێـزم، تاکو لەکاتێکدا دەیکێشم بە سەری پاسەوانێکدا. بە هەرحاڵ هاورێکانم قسەیان لەگەڵدا کـردم و کەللـە شـەکرەکەیان بۆ دابیـن نەکردم، ئەو سـاڵە ناوی من نەخوێندرایەوە.

ژمارەیـەک زیندانیـی ناویـان خوێندرایەوە، یەکێـک لەوانەی ناوی خوێندرایـەوە عەلـی پایندە بـوو، عەلی هاتە لای مـن و گووتی: گوێت لێبـوو ناوی منیش خوێندرایەوە، من نامەوێـت برۆم، دەمەوێت دژیان بوەسـتمەوە. گووتم: زۆرباشـە بزانم چـی دەکەیت؟ تەنهـا ئاگاداربە کوتەک زۆر نەخۆیت، کراسێکم هەبوو پێم دا و لەبەری کرد و رۆیشت لـە گۆشـەیەکدا خۆی خسـتە ژێر بەتانییـەوە. چەند کەسـێکی تریش کـە ناویان خوێندرایەوە، نەرۆیشـتن و چوونە ژێـر پلیکانەکان خۆیان حەشاردا.

**عەلی ئەشـرەف دەروێشـیان: لە ڕووداوە گرنگەکانی سـاڵی (١٣٥٣/ ١٩٧٤) چیت لەیادە؟**

**عەلـی پاینـدە:** گرنگترین ڕووداوی سـاڵی (١٣٥٣) بردنـی ئەو زیندانییانـە بـوو کە لە لای ئێمە بـوون و دواتر هەموویان لەسـێدارە دران، ڕۆژی (٢٦)ی ڕەشەمەی (١٣٥٣) بوو، ڕۆژی سەردانیکردن بوو، ڕۆژێک بوو ئێمە دەمانویست بۆ شەوەکەی مەراسیمی ساڵوەگەڕی ئەو هاوڕێیانەمان بکەین کە لەسـێدارە درابوون. هەمان شەو هاتن و ناوی

پەنجاو چوار کەسیان خوێندەوە. ئەو ڕۆژە یەکێک بوو لە ناخۆشترین ڕۆژەکانی زینـدان، ئەو ناو خوێندنەوەیە لـە کاتژمێر (٨)ی بەیانییەوە دەستی پێکرد تاکو کاتژمێر (٤)ی دوانیوەڕۆ. هەرجارەو ناوی دوو سێ کەسـیان دەخوێندەوە و دەیانبردن، دوای تەواوبوونی ناو خوێندنەوە، تەواوی زیندانییەکان بەلای یەکەوە دانیشتن و دەستیان کرد بە گفتوگۆ. هەروەکو ئەوەی کە خۆت دەیزانیت، سـاواکییەکان لەسەر فەرمانی شا بڕیاریان دابوو ساڵی (١٣٥٢) دەست بکەن بە چاکسازیی و لەناوبردنی تەواوی ئەندامانی چریک فیداییەکان، بڕیاریان دابوو لە ماوەی (٥) ساڵدا بە تەواوی لەناویان بەرن. سـەرەتا ئەم سەرکوتکردنەیان لە زیندانەوە دەستپێکرد، بەڵێ، لەو ڕۆژەدا ئەمە بەرنامەی ڕژێم بوو بۆ پاکردنەوەی کۆمەڵـگا لە تەوژمی سیاسـی، بەڵام لـە هەمان کاتیشـدا زیندانییەکان خۆیان بەهانەیان دەدا بە دەستەوە، خۆ دیارە ئەم بەهانەیەش نەبووایە، ئەوان خۆیان بەهانەیەکیان دروسـت دەکرد، ڕژێمە دیکتاتۆرییەکان بۆ ئەنجامدانی کارەکانی خۆیان پێویستیان بە دۆزینەوەی بەهانە نییە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەوانەی بردیانن (٥٤) کەس بوون.**
**سەفەرخان:** لەنێوان (٥٤ تا ٦٠) کەس بوون.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: بەڵام لەنێوان ئەوانەدا، هەر لەناو زیندان (نۆ) کەسیان هەڵبژارد بۆ کوشتن.**

**عەلی پایندە:** بەڵێ، هەر لەوێ (نۆ) کەسیان کوشت، حەوت کەسیان دۆسـیەکەیان لەگەڵ دۆسیەی بێژەنی جەزەنی بوو، دوو کەسەکەی تر سـەر بە ڕێکخـراوی موجاهیدین بوون، کازمی زوئەنوار و مسـتەفای جەوان سـەر بە موجاهیدین بوون، حەوت کەسەکەی تریش لایەنگری بێژەنـی جەزەنی بـوون. دیارە مسـتەفای جەوان پلەیەکـی بەرزی لە ڕێکخستندا هەبوو، کەسی پلە دووی موجاهیدین بوو، لانگرێکی زۆری هەبـوو. دیـارە بەهۆی ئـەوەوە نزیکەی (٢٠) کەس بەیەکـەوە هێنرانە

زیندان، نەک وەک ئەوەی ئەو ناوی دابن، بەڵکو لە سـەرەتادا یەکێکیان دەسـتگیرکرابوو، ئیتر یـەک بۆ یەک ناوی هاوڕێکانیـان دابوو. کاتێک ئەمانە هاتنە زیندان بە کەسانی پلە یەک سەیر دەکران و ئەشکەنجەیەکی زۆریان دان. حەوت کەسـەکەی تر کە لەگەڵ بێژەنی جەزەنیدا بوون و ساڵی (١٣٥٠) بە بڵاوکراوەوە گیرابوون.

ڕێکەوتی (٣٠)ی فەروەردین بوو، کات شـەو بـوو، ڕۆژنامەیان بۆ هێنان کاتێک زیندانییان ڕۆژنامەکەیان خوێندەوە، بۆیان دەرکەوت کە هەر نۆ کەسەکە گوللەباران کراون، تەواوی زیندانییان مات و مەلوول بوون. بۆ سبەی بەیانی کە کاتی وەرزش بوو؛ هیچ زیندانییەک نەیتوانی بچێت بۆ وەرزشکردن. ڕۆژانە یاریی دووگۆڵی دەکرا، بەڵام ئەو ڕۆژە یاریی دووگۆڵی و یاریی باسکە و هیچ جۆرە وەرزشێک ئەنجام نەدرا. تەواوی زیندانییەکان وەک شـێتیان لێهاتبوو، هەواڵ درا بە سـەرهەنگ زەمانـی، ئەویـش هات و هـاواری کرد بۆچی ناچن بۆ وەرزشـکردن، بەڵام هیچ کەسێک وەڵامی نەدایەوە، ئیتر ئەم بێدەنگییە تا ڕۆژی دواتر درێژەی کێشا و ڕۆژی دواتر زیندان باری ئاسایی خۆی وەرگرتەوە.

**سەفەرخان:** من یەکەمجارم نەبوو کە ئەم کوشت و کوشتارە ببینم، بەڵام ئەم ڕووداوە کاریگەرییەکی زۆری لەسـەر دەروونی من هەبوو، ماوەیـەک هەروەک ئەوەی شـتێکم ونکردبێت، ئەمـلا و ئەولام دەکرد، چونکـە لەگەڵ ئـەو هاوڕێیانە زۆر نزیـک بـووم و تێکەڵییەکی زۆرم لەگەڵیاندا هەبوو، ئەوان بەردەوام دەهاتنە لای من و بەیەکەوە گفتوگۆمان دەکرد، زۆرجار نانی نیوەڕۆ و ئێوارەمان بەیەکەوە دەخوارد، بەتایبەت ڕۆژانە لەگەڵ بێژەن بەیەکەوە لە سـاڵۆنەکە پیاسـەمان دەکرد، ڕاستە ئێمە بیرکردنەوەمان لەگەڵ یەکتردا جیاواز بوو، بەڵام هەمیشە ڕێزمان لە یەکتری دەگرت. ئیتر ڕۆژەکان تێپەڕین و هاوینی ساڵی (١٣٥٤) هات و سـاڵۆنی خەوتن دروسـتکرا، دەرگای بەندی (٥) داخرا و زیندانییانی بەندی (٤ و ٦) ئاگادارکرانەوە کە لە ساڵۆنی بەندی (٦) بخەون.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: تۆ چ کاتێک لە زیندان دەتخوێندەوە؟**

**سەفەرخان:** زۆربەی کات دوای نانخواردنی بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارە کاتی خوێندنەوە بوو، هەموو زیندانییەکان دادەنیشتن و خەریکی خوێندنەوە دەبووین، چونکە من دوا کەس بووم خواردنم دروست دەکرد، هەندێک جار میوانیشم هەبوو، کاتی خوێندنەوەم کەمتر بوو. ئەگەر خەریکی دروستکردنی خواردن نەبوومایە، کاتی نێوان بەیانی و نیوەڕۆم تەرخان دەکرد بۆ خوێندنەوە. زۆربەی زیندانییەکان دوای نانخواردنی ئێوارەیان تەرخانکردبوو بۆ خوێندنەوە، چونکە ئەو کاتە ڕۆژنامەکان دەگەیشتنە دەستمان و زۆربەی زیندانییەکان دەیانخوێندنەوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: هەندێک جار بە بۆنە جیاوازەکانەوە، بۆ نموونە ئەو مەراسیمانەی کە خۆمان لە زیندان دروستمان دەکرد (وەکو ڕۆژی سەرکەوتنی گەلی ڤێتنام بەسەر ئەمریکادا) تۆ کفتەیەکی خۆش و بەلەزەتت دروست دەکرد...**

**سەفەرخان:** بەڵێ، کفتەی باشم دروست دەکرد، چەند برادەرێکیش بەردەستییان دەکردم، هەندێکجار کفتەم بۆ دوو سەد کەس دروستکردووە، بۆ ئامادەکردنی کفتە سەرەتا لەسەر پارچە کاغەزێک ناوی هەموو پێویستییەکانی کفتەم دەنووسی و دەمدا بە سەرپەرشتیاری کۆمەڵەکەمان، ئەو هەموو پێویستییەکانی بۆ ئامادە دەکردم و منیش قۆڵم لێ هەڵدەماڵی.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لەم کفتە دروستکردنەدا هەڵسوکەوتی پۆلیس چۆن بوو؟**

**سەفەرخان:** پۆلیس بە هیچ جۆرێک نەیدەویست کفتە دروست بکەین، چونکە ئەو کارەی بە کاری هاوبەش و بەکۆمەڵ دەبینی، بۆ نموونە هەندێکجار دەهاتن مەکینەی قیمەی گۆشتەکەیان دەبرد و دەیانگووت

ئەم مەکینەیە هی پۆلیســە، منیش دەمگووت: ئەوە مەکینەی خۆمە و لە زیندانــی بەرازجانەوە لەگەڵ خۆم هێناومە. ئــەوان دەیانگووت نەخێر. دیــارە پۆلیــس و دیکتاتــۆرەکان هیــچ کاتێــک کاری هەرەوەزیی و بە کۆمەڵیان پێ خۆش نییە، ئەم کفتە دروســتکردنەش کارێکی بە کۆمەڵ بوو، چەند کەســێک گۆشتیان لە مەکینە دەدا، چەند کەسێک سەوزەیان پــاک دەکرد، چەند کەســێک برنجیان دەبژارد و دەیانشــۆرییەوە، هەر چەند کەســێک و کارێکیــان ئەنجام دەدا، بۆیە ئەم کارە بە هاوبەشــی دەکــرا. لە یادمە ڕۆژێکیان کفتەم دروســت دەکرد، نزیکەی (٣٠) کەس لەبەر دەستی مندا کاریان دەکرد.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: من یادمە برنجیان دەهێنا بۆ زیندان و ئێمە برنجەکەمان پاک دەکرد، دواتر گووتیان ئەوانەی کە چاویان کزە دەبەخشرێن لە برنج پاککردن.**

ســەفەرخان: بەڵــێ، ئەمــەش خۆی لە خۆیدا داســتانێک بــوو، ئەم برنج پاکردنە بەهۆی زیندانییەکانەوە نەبووایە وا بە ئاســانی بەدەست نەدەهات، لەدوای پێشــهاتی (سیاهکوڵ)یەکان لە ساڵی (١٣٤٩) ژمارەی زیندانییــەکان زیادی کرد و بۆچوونی حکومەت بەرامبەر بە زیندانییان و جــۆری خواردن گۆڕا، چونکە ڕژێم هەســتی دەکرد ئاڕاســتەکان بە لایەکــی تــردا دەڕوات، هەربۆیە خواردنەکەمــان زۆر پیس بوو. بیرمە جارێکیان چەند پارچە تەڵاشێک لە خواردنەکەماندا بوو، کاتێک حوسێن زادەی چاودێــر هاتــە ژوورەوە، هــادی جەفــرودی ناڕەزایی دەربڕی و گووتــی: ئەو خواردنەی پێمان دەدەن پیســە و تەڵاشــەداری تێدایە. حوســێن زادەش بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد و گووتی: پێیان دەڵێم ئەمجارە مشک بکەنە ناو خواردنەکانتانەوە.

ئەوە بوو لە ساڵی (١٣٥٠) ناڕەزاییمان دەربڕی کە خواردنەکەمان خراپە و ناتوانین بیخۆین و پێویستە گۆڕانکاریی لە خواردنەکەدا بکرێت، دوای ماوەیــەک ئــەوان هەڕەشــەکانیان زیــاد کــرد و زیندانییەکانیش

لــە ناڕەزایــی دەربڕین بەردەوام بوون، دواجــار بڕیاریان دا خواردنی وشکەمان پێ بدەن و خۆمان خواردن بۆ خۆمان دروست بکەین.

**عەلی ئەشرەف دەروێشــیان: لەبارەی گرووپی سوپاس، چیت دێتەوە یاد؟**

**سەفەرخان:** ساڵی (١٣٥٤/ ١٩٧٥) چەند زیندانییەک کە حوکمەکەیان تەواو کردبوو؛ ئازاد نەکران و بۆ هێشتنەوەیان ڕەوانەی زیندانی ئەوین کران، لەناو ئەوانەدا کەسانی وەک هەیبەتوڵڵای موعینی و فەرەیدوونی تەنکابی هەبوون، کە دواتر هەیبەتوڵڵای موعینیان کوشت. من ماوەیەک لەگەڵ ئەواندا بووم، بەڕاســتی کەســانی ئازا و خۆڕاگــر بوون. دوای ماوەیــەک هاتــن و منیان برد بــۆ کۆمیتەی هاوبەش، کە ســەیرم کرد ژمارەیەکی زۆر زیندانییان لە زیندانی قەسرەوە هێنابوو بۆ چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنی، ئەمانە دواتر بە گرووپی سوپاس ناسرابوون.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشــیان: ئەگەر لەیادت مابێت ئەوانە کێ بوون؟**

**ســەفەرخان:** وا باشــترە ناویان نەهێنم، ئەوان لــە (٥)ی بەهمەنی (١٣٥٥) بەبۆنــەی ڕۆژی شەشــی بەهمەنــەوە چاوپێکەوتنیــان لەگەڵدا کرا، سەرپەرشتیاری ئەو چاوپێکەوتنە مەنوچەهری سەلیمی ئەقدەم لە ئەستۆی گرتبوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەو چاوپێکەوتنە لەگەڵ گرووپەکەی گوڵسورخیدا بوو؟**

**سەفەرخان:** بەڵــێ، لەگەڵ ئەو گرووپە بوو، چاوپێکەوتنێکی باشیان لەگەڵــدا کــردن، گرووپی ســوپاس نزیکەی (٦٠) کــەس دەبوون، تەنها هێنایانن و لە تەلەفزیۆن نیشــانیاندان. منیشــیان لەگەڵ ئەواندا بردبوو، بــەڵام مــن ناڕەزاییم دەربڕی و گووتــم: من نایەمــە بەردەمی کامێرا،

ئەگــەر بــەزۆر بمبەن بــە دڵنیاییەوە خــۆم دەکوژم، هەربۆیــە وازیان لێهێنام و هێنایانمەوە زیندانی ئەوین. لەوێ زانیم کە ڕێکخراوی خاچی سور هاتوون و ئێمەش لە لای ئەوان سکاڵامان کرد، ئاخر هێشتا چەند مانگێک بەســەر پشکنینەکەی شــادا تێنەپەڕیبوو، کە ڕێکخراوی خاچی ســوری جیهانی بــۆ گفتوگــۆ و چاوپێکەوتنی زیندانییەکان ســەردانی ئێرانیــان کرد. ئەو زیندانییانەی کــە حوکمیان تەواوکردبوو و ئازادیان نەدەکــردن، ئەوانە نزیکەی (١٤٦) کەس بــوون، لەبەرئەوەی ژمارەیان زۆر بــوو، جێگاش کەم بوو، بۆیە هەر ســێ کەس، یان پێنج کەســیان کردبوونــە یــەک ژووری تاکەکەســییەوە. دوای چەنــد ڕۆژێک (١٢٦) کەســیان بردن بۆ زیندانی قەســر و تەنها بیســت کەســیان هێشتنەوە، ئەوەندەی من بزانم ئەو بیســت کەســە موحســین مودیر شــانەچی و ســەعید ئازەڕەنگ و سەمەد ئاینەچی و فەرەخ نیگاداری و عیسای هند نەژاد و عەبدوڵڵای شوکری و عەلی پایندە بوون.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: هەیبەتی موعینیان لەگەڵدا نەبوو؟**

**عەلــی پایندە:** ئەویان بردبــوو بۆ زیندانی ئەویــن، خۆت دەزانیت لەدواییدا ئەویان کوشــت، ئەو تەنها کچێکــی بچووکی لەدوا بەجێما بە نــاوی (میهەن). ئــەوەی لەیادم بێــت دوای ئەوەی ئــەو زیندانییانەیان برد دوو دوو خســتیاننە ژووری تاکەکەســییەوە، کردیاننە دە ژووری تاکەکەسییەوە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەی لە کۆمیتەی هاوبەش؟**

**عەلی پایــندە:** بەڵێ، بەندی شەشــی کۆمیتەی هاوبــەش، ئەوێش هەروەکو ژووری (٢٠٩)ی زیندانی ئەوین زۆر ترســناک بوو، شەوێک کاتژمێــر یانــزە ئاگاداریــان کردیــن، هەرکەســێک پانتۆڵەکــەی، یــان چاکەتەکــەی دڕاوە بــا لە دەرگا بــدات و ئێمە جلەکانی بــۆ دەگۆڕین. ئێمــە هەموومــان، یــان جلەکانمان دڕابــوون، یا بە ئەنــدازەی خۆمان

نەبــوون، بۆیە هەموومان لە دەرگامان دا. ئەوانیش جلوبەرگیان هێنا و هەرکەسێک قاتێک جلیان پێدا. دووبارە دوای (١٠) خولەک بانگەوازیان کردەوە، هەرکەسـێک پەرداخ و قاپی نییە با لە دەرگا بدات. هەموومان بەیەکـەوە بــە دەنگێکی بەرز دەسـتمان کرد بە پێکەنیـن، چونکە هیچ کاتێک قاپ و پەرداخمان لە زینداندا نەبینیبوو.

**عەلــی ئەشــرەف دەروێشــیان: بە هیــچ جۆرێک ســوراحی ئاوخوادنەوەیان پێ نەدەدایـن، چ شووشە و چ نایلۆن.**

**عەلــی پایندە:** بەڵــێ، بە هیــچ جۆرێــک ســوراحی و پەرداخیان نەدەدا، هەرکەسـێک تینووی بووایە، بۆ خۆی دەڕۆیشــت لە بەلۆعەی ئاودەســتەکاندا ئاوی دەخــواردەوە، هەندێک جار ســوراحی نایلۆنیان دەدا. لە ئاکامدا لەناو زیندانییەکاندا بوو بە یەک پێکەنین و گاڵتەوگەپ، کە پاســەوانەکانیش کەوتبوونە پێکەنین. هەرچۆنێک بێت ســوراحییەک و دوو پەرداخی شووشــەیان پێداین، ئەمجارەیان بانگەوازیان کردەوە کــە کەوچک و چەتاڵتــان پێدەدەین. ئێمەش لە دەرگامــان دا، دووبارە بانگەوازیــان کرد کێ پارچە ڕاخــەری دەوێت، ئێمەش لە دەرگامان دا. دواجار گووتیان هەمووتان ئامادە بن سەر و ڕیشتان بۆ چاک دەکەین، ئەم ڕەوشــە تا کاتژمێری دووی دوانیوەشــەوی خایاند. کاتژمێر دوو هاتن و ســەر و ڕیشــیان بۆ چاک کردین و دواتر بردیانین بۆ حەمام. ئێمە وامان هەستکرد بەسەر سەرمانەوە دەوەستن، تاکو بە زوویی لە حەمام خۆمان بشۆرین، بەڵام بە پێچەوانەی بۆچوونەکەمانەوە ماوەی یــەک کاتژمێــر و نیو لــە حەمامدا ماینــەوە. هەموومان تــەواو خۆمان شـۆریبوو، بەڵام هێشتا نەهاتبوون دەرگامان لێ بکەنەوە و بمانبەنەوە بۆ ژوورەکانمان.

کاتژمێــر چوار بوو کە لــە حەمامەوە گەڕاینەوە، لەنــاو زیندانییاندا چەندین لێکدانەوە بۆ ئەو ڕەوشە کرا، چونکە ڕەوشەکە ئاسایی نەبوو، هەموومــان بــەدوای هۆکارەکەیدا دەگەڕاین، هەرکەســە و بە جۆرێک

لێکدانەوەی بۆ دەکرد، کە دەبێت کێ بیبەوێت بێت بۆ سەردانی زیندان، هەرکەسەمان لە ژوورەکانی خۆماندا بووین، بەڵام بە دەنگی بەرز لەگەڵ یەکتریدا قسەمان دەکرد، پاسەوانەکانیش کاریان بەسەرمانەوە نەبوو. کەمێک خەوتین کاتژمێر هەشتی بەیانی هەموومانیان لە خەو هەڵساند و بردیانین بۆ ڕاڕەوەکە. دەرگاکە کرایەوە و سەیرمانکرد، (سەروان لوتفی) کە ئەوکات لێپرسراوی بەشی خراپەکاریی زیندان بوو لەگەڵ حوسێن زادە و دکتۆر جەوان و چەند کەسێکی تری ئەشکەنجەگەر و لێکۆڵەر هاتن. حوسێن زادە هاتە پێشەوە و گووتی: ئاغایان لەلایەن خاچی سوری نێودەوڵەتییەوە چەند کەسێک هاتوون، دەیانەوێت لەگەڵ ئێوەدا قسە بکەن، ئێمە تەنها چاوەڕوانی ئەوە لە ئێوە دەکەین کە ڕاستییەکان بڵێن و درۆ نەکەن.

ئێستا کەسێک بە ئێمە دەڵێت کە درۆ نەکەین و ڕاستگۆ بین، لەکاتێکدا خۆی سەدان کەسی بێتاوانی لەژێر ئەشکەنجەدا کوشتبوو، ئەو کەسە تاوانبارە لەدوای کودەتای (٢٨)ی مورداد پلەکەی نزم بوو، بەڵام دواتر بەهۆی زۆرداریی و بێ ڕەحمی خۆی و کوشتنی سەدان کەسی ئازادیخواز، بەردەوام پلەکەی بەرز دەکرایەوە، تاکو وای لێهات پێیان دەگووت دکتۆر حوسێن زادە. بەڵێ، ئەوان ڕۆیشتن و سێ کەس لە نوێنەرانی خاچی سور هاتن. هەموومانیان دابەشکرد بەسەر سێ گرووپی حەوت کەسی و شەش کەسی. لەناو هەر گرووپێکدا کەسێکی زیندانیی بۆ وەرگێڕ دیاریکرا. یەکێک لە وەرگێڕەکان سەعید ئازڕەنگ بوو، یەکێکیان فەرەح نیگادار بوو، سێیەمیانم بیر نەماوە کێ بوو. ئەوان بە زمانی ئینگلیزی قسەیان دەکرد. ئێمە داوای بەڵگەمان لە ئەوان کرد، ئەوانیش ناسنامەی خاچی سوریان پیشان داین. ئێمە ئەو بیست کەسە کە لە زیندانییانی تر جیاکرابووینەوە، زیندانییانی تر هەموویان نیگەرانی ئێمە بوون، وایان هەست کردبوو بەڵایەکمان بەسەر هاتووە، ئەوان چەندین جار لە لێپرسراوانی زیندانیان پرسیبوو، کە ئاخۆ ئێمە چیمان بەسەرهاتووە، ئەوانیش گووتبوویان ئێمە نازانین ئەوە کاری ساواکە.

کاتێـک نوێنەرانی خاچی سـور سـەردانی زیندانی قەسـر دەکەن زیندانییـەکان دەڵێـن ئێمە یەک قسـەتان بۆ ناکەین تاکـو هەواڵی ئەو بیسـت زیندانییـەی هاوڕێمـان نەزانین، چونکـە هاوڕێکانمان پێشـتر پێشـینەی لەسـێدارەدانی بێژەنـی جەزەنـی و هاوڕێکانیـان دەزانی و نیگەرانـی ئێمـەش بوون، بۆیـە نوێنەرانی خاچی سـور گومان دەبەن لە چارەنووسـی ئەو بیسـت کەسـە. بۆیە سەردانی سـاواک دەکەن و سـاواک پێیان دەڵێـت ئەوانمان ئازاد کردووە. نوێنەرانی خاچی سـور دەگەڕێنـەوە بـۆ زیندان و بـە زیندانییان دەڵێن سـاواک گووتوویەتی هاوڕێکانتان ئازادکراون. زیندانییەکانیش دەڵێن بۆ ڕاسـتی و دروستی قسەکانی ساواک بڕۆن سـەردانی ماڵەکانیان بکەن، بزانن ئازادکراون، یـان نا، ئێمـە دڵنیاین ئەوان ئازاد نەکراون، ئەگەر ئازادکراون با نامەی ئیمزاکراوی ئازادبوونیان نیشانی ئێوە بدەن. ئەوانیش سەردانی ساواک دەکەنەوە. ئەمجارە سـاواک بە ناچاریی پێیان دەڵێت ئەوان لە زیندانی کۆمیتەی هاوبەشـن. ئینجا پێیان دەڵێن هـۆکاری ئەوەمان پێ بڵێن کە بۆچـی ئـەم زیندانییانەتان شـاردووەتەوە. جا نازانم وەڵامی سـاواک چـی بووە، هەربۆیە ئەوان بەدوای ئێمەدا گەڕابوون لە ئاکامدا ئێمەیان نیشاندان.

ئێمە لە کاتژمێر (٨)ی بەیانی تاکو (١٠)ی شەو لەگەڵ ئەواندا بووین، ئـەوان زۆر پرسـیاریان کرد، ئێمـەش هەرچی بینیبوومـان و هەرچی دەمانزانی بۆمان باسـکردن، دوای تەواوبوونی پرسـیار و لێکۆڵینەوە؛ نوێنەرانی خاچی سور ڕۆیشتن.

ڕۆژی دواتـر کاتژمێـر چـواری بەیانـی هاتـن و دەرگای ژووری یەکەمیان کردەوە، کە فەرەخ نیگادار و عەبدوڵڵای شوکری و موحسین مودیر شانەچی لەو ژوورەدا بوون. فەرەخ نیگاداریان برد و ڕۆیشتن. کاتژمێـر دووی دوانیوەڕۆ فەرەخ نیـگادار گەڕایەوە و بە دەنگی بەرز گووتـی: عەلـی پایندە خۆت ئامادە بکە ئێسـتا دێن و تۆش دەبەن. ئەو پاسـەوانەی کـە ئەوی هێنایـەوە فڕێیدایە ناو ژوورەکـە و دەرگاکەی

داخستەوە و منیان بردە لای دکتۆر جەوان و لێی پرسیم و گووتی: تۆ بە کەسێکی ڕاست و ڕاستگۆ ناسراویت. گووتم: بەڵێ، مەگەر چی بووە؟ گووتی: بۆچی درۆتان لەگەڵ خاچی سـور کردووە؟ ئەی بڕیار نەبوو ڕاسـتگۆ بن لەگەڵیاندا. منیش گووتم: هەرچیمان گووتووە ڕاست بووە، کـوا درۆی چیمان کردووە؟ دکتـۆر جەوان گووتی: بۆچی گووتووتانە بێژەنـی جەزەنـی و ئەوان لـە کاتی هەڵاتندا لێیـان دراوە و کوژراون، ئەی ئەوان نەیانویسـت ڕابکەن. منیش گووتـم: درۆم نەگووتووە ئێوە ئەوانتان کوشت.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەو دکتۆر جەوانە دکتۆرای لە چیدا هەبوو؟**

**سـەفەرخان:** دەیانگووت لـە تەبریز خوێندوویەتـی و دکتۆرای لە مافدا هەیە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەو ناوە ناوی نهێنی بوو؟**

**سەفەرخان:** نەخێر، ناوی خۆی بوو، سەری کەچەڵ بوو، ناوچاوانی شوێنی شکاوی پێوە دیاربوو، شوێنی دوورینەوەی ناوچاوانی دیاربوو، ئەوە نیشانەیەکی دیار بوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: دوای شۆڕش چییان لێهات؟**

**سـەفەرخان:** چەند کەسـێک لەو تاوانبارانە کـە خەڵکێکی زۆریان کوشـتبوو، هەڵاتن بەرەو ئیسرائیل، چونکە لە هەمان شوێن دەورەیان بینیبوو، ئەوانیش بریتیبوون لە حوسێن زادە، پەروێزی سابتی، ڕەسوڵی و چەندانـی تر، ئەوان بە زوویی هەڵاتن و ڕۆیشـتن بۆ دەرەوە. بەڵێ، عەلـی پایندە بە دکتـۆر جەوانی گووتبوو: ئێوە هەمـوو هێز و توانای خۆتـان بەکارهێناوە بۆ ڕێگریکردن لە هەڵاتنـی زیندانییان، بۆ نموونە کاتێک من بەهۆی ئەشکەنجەی ئێوەوە تووشی نەخۆشیی بووم؛ کێشم

ئەوەنــدە دابەزیبوو کــە نەمدەتوانی بە ڕێگادا بڕۆم، ویســتتان بمنێرن بۆ نەخۆشــخانە، چەند پاســەوانێکتان لەگەڵ ناردم، پاســەوانێک لەلای ڕاستمەوە، پاســەوانێک لە لای چەپەوە، دەستەکانم کەلەپچە کرابوون، قاچەکانیشم پێوەند کرابوون، کاتێک خستیانمە ئۆتۆمبێلەوە چەکدارێک لە لای شوفێرەکەوە بوو، چەندین چەکداری تر لەگەڵمدا هاتبوون.

هەر لەســەر ئــەم ڕووداوە دووبارە منیان بــردەوە زیندانی ئەوین، چونکــە زۆر نارەزاییم دەربــڕی، دوای چەند ڕۆژێک دووبارە منیان لە زیندانــی ئەوینەوە بردەوە بۆ زیندانی قەســر، لــەوێ لەگەڵ نوێنەرانی خاچی سور قسەم کرد و ئەبو توراب باقر زادە وەرگێڕ بوو.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشیان: دوای کوشتارەکەی مەیدانی ژاڵە، ئێوە ئەو کاتە لە زیندانی قەســر بــوون، کاردانەوەتان چی بوو؟ ئێمە لە زیندانی ئەوین ماوەی پانزە ڕۆژ مانمان لە خواردن گرت.**

**ســەفەرخان:** ئێمەش لە زیندانی قەســر مانمان لە خــواردن گرت، پۆلیس بەردەوام دەهاتن و داوایان دەکرد مانگرتنەکە بشکێنین، هەموو هەوڵێکیــان شــکاندنی مانگرتنەکە بــوو، لەلایەکی تــرەوە ئەنجوومەنی داکۆکیکــردن لــە زیندانییانــی سیاســی هاتــن و پســتگیرییان کردین، ئەنجومەنێک بۆ داکۆکیکردن لە زیندانییانی سیاســی دروست ببوو، کە کوردێکی خەڵکی شاری سنەیان لەگەڵدا بوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەی لەبارەی سادقی وەزیرییەوە؟**

**ســەفەرخان:** ئافەرین بۆ ســادقی وەزیری، ئەو چووبووە بەردەم ســەر لەشــکر بەهزادی و پێــی گووتبوو: باشــە ئێوە دەڵێــن گرووپە چەکدارەکان ئازاد ناکەین و ئەوانی تر ئازاد دەکەین، ئەی ســەفەرخان بۆچــی ئازاد ناکەن. ئەویش گووتبووی کاری ئەو بەدەســت ئێمە نییە، بە دەست شایە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئایا لەناو ئێوەدا کەسانێک هەبوون بەهۆی مانگرتن لە خواردنەوە تووشی بوورانەوە و بێهۆشیی ببن؟**

**سەفەرخان:** هەموو لەو ناوە درێژ ببوون، هەرئەوە بوو هەناسەیان دەدا، ئێمـــە مانمان لە هەموو خـــواردن و خواردنەوەیەک گرتبوو، زۆر پەرێشان بووین، هیچ شتێکمان نەدەخوارد، چەند کەسێک تەواو بێهۆش ببوون، دەیانبردنە لای دکتۆر و بەزۆر دەیانویست خواردنیان پێ بدەن.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەی تۆ چۆن بوویت؟**

**ســـەفەرخان:** من وا نەبووم، من جگەرەم زۆر کێشابوو، هەستم بە برســـێتی نەدەکرد. (گاگیـــک) هاتە لام و گووتی: شـــتێکت بۆ دەهێنم و بیخـــۆ. گووتم (گاگیک) ئێمە هەموومان بەیەکـــەوە بەڵێنمان بە یەکتری داوە، ئـــەوە خیانەتـــە، مـــن ئەگـــەر خواردن بخـــۆم کەواتـــە خیانەتم لە هاورێکانم کردووە، ئێمە بەڵێنمان بە یەکتری داوە هەموومان بەیەکەوە مان لە خواردن بگرین، ئێســـتا تۆ پەنیـــرت هێناوە کە من بیخۆم، بەڵام مـــن هەرگیز خیانەت لە هاورێکانم ناکـــەم، زۆر هەوڵیان دا و گووتیان تۆ نەخۆشیی گەدەت هەیە وا باشترە مانگرتنەکەت بشکێنیت، بەڵام من بەقسەم نەکردن.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: کەسێک هەبوو مانگرتن لە خواردن نەکات؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، هەبوو پێداو و هاشم نوری...

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەوان مانیان نەگرت.**

**سەفەرخان:** نا ئەوانەی خواردنیان دەخوارد لە حەوت هەشت کەس زیاتـــر نەبوون، دەرۆیشـــتن خواردنیـــان وەردەگرت و لە گۆشـــەیەکی ژوورەکەدا دەیانخوارد.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: یەکەمینجار کەی تەلەفزیۆنت بینی؟**
سەفەرخان: وەڵڵا مـن تەلەفزیۆنم نەبینیبوو، من ڕۆیشـتبووم بۆ عێراق، ڕادیۆشم نەبینیبوو، ئۆتۆمبێلیش تەنها سەرۆکەکەمان جەنەڕاڵ کەبیری هەیبوو.

**عەلی ئەشـرەف دەروێشـیان: هەمان کات کە ئەفسـەری تیپ بوویت.**
سەفەرخان: بەڵێ ئێمە ڕۆیشتبووین بۆ عێراق، سەیرم کرد لەوێ لە چایخانەکانـدا ڕادیۆ هەیـە، لە ئێران ڕادیۆ نەبوو، خۆ ئەگەر هەبووبێت تەنهـا ماڵە دەوڵەمەنـدەکان هەیانبوو. من ڕادیۆم نەبینیبـوو، ئۆتۆمبێلم نەبینیبوو، هەموو شـتێکم لێرە بینی. ئەو کاتـەی کە تیپی ئازەربایجان بـڵاوەی پێکرا چەند کەسـێک ڕۆیشـتن بۆ باکـۆ لـەوێ ڕادیۆیەکیان دامەزراند بە ناوی (ئازەربایجان دیموکرات فرقەسـی)، کە دواتر ناوی گـۆڕا بە ڕادیۆی (پەیکی ئێـران)، تا ئەم دواییانەش ئـەو ڕادیۆیە هەر مابوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: تەلەفزیۆنت لە کوێ بینی؟**
سەفەرخان: تەلەفزیۆنم لە زیندانی قەسر بینی، من گووتم: تەلەفزیۆن چییە؟ گووتیان وەک سـینەما وایە و بچووکترە مرۆڤ پیشـان دەدات و قسە دەکات.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: دواتر تەلەفزیۆنیان هێنا بۆ زیندان؟**
سەفەرخان: بەڵـێ، زیندانییەکان پارەیان کۆکردەوە و تەلەفزیۆنیان کڕی.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لە زینداندا ئارەزووی چیت هەبوو؟**

**سەفەرخان:** من هیچ ئارەزوویەکی تایبەت بە خۆمم نەبوو، دەمگووت لە زینداندا دەمرم و ئازاد نابم، دیارە ئومێدێکی زۆریشم هەبوو بەوەی خەڵکی شۆڕش بەرپا بکەن و بێن و دەرگای زیندانەکان بشکێنن، من هەر یەکەم ساڵی زیندانیم ئەو قسەیەم کردبوو، بەڵام گەورەترین ئارەزووم ئەوەبوو کە لاوەکانمان بە ئازادیی بژین و ژیانێکی بەختەوەر بەسەربەرن.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لەبارەی خەسرەوی گوڵسورخی چی دەزانیت؟**

**سەفەرخان:** لەگەڵ خەسرەوی گوڵسورخی هەشت مانگ لە زیندانی ژمارە چوار بەیەکەوە بووین، ئەو بە دوو ساڵ حوکم درابوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئێوە بەیەکەوە بوون؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، ئەو ئاگاداری هیچ نەبوو، گرتبوویان و هێنابوویان، تەنانەت لەو کاتەدا کە پۆلیس هێرشی کردبووە سەر بەندی چوار ئەویش لەوێ بوو، لێدانێکی باشی خوارد، ئەو لە زیندان هاوڕێیەکی هەبوو پۆلیس بە باتووم لەسەری ئەو هاوڕێیەی دابوو، ناوچاوانی شکابوو، ناوی ئەسەدوڵڵای عەمادی بوو خەڵکی ساری بوو، خوێن بە گیانیدا دەهاتە خوارەوە، بەڵام بەسەر خۆیدا نەدەهێنا و هیچی نەدەگووت، بەڵێ گوڵسورخی ئاگاداری ڕووداوەکانی دەرەوە نەبوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەی بۆچی خەسرەوی گوڵسورخی و کەرامەتوڵڵای دانشیان لەسێدارە دران؟**

**سەفەرخان:** چونکە لە دادگادا بەرگرییەکی زۆریان کرد لە مارکسیزم و ڕاپەڕینی خەڵک، گووتبوویان ئێمە مارکسین و ڕێزیش بۆ ئیسلام دادەنێین، ڕۆژنامەکانی ئەو کاتە کەمێک لەسەریان نووسیبوون، لە

تەفزیۆنیش خۆیان و کەمێک لە وتەکانیانی نیشـان دابوون، خۆ ئەگەر بەرگرییان نەکردایە لەسـێدارە نـەدەدران. کاتێک لە زیندان لەگەڵ مندا بـوو، پێی دەگووتم: پێویسـتە تەواوی زیندانییـەکان تێبگەیەنین کە بە باشی بەرگریی لە بیروباوەڕەکانیان بکەن.

**عەلی ئەشرەف دەروێشـیان: کەرامەتوڵلای دانشیان خزمایەتی هەبوو لەگەڵ غولام یەحیای دانشیان؟**

**سەفەرخان:** نەخێر خزمایەتی چی، غولام یەحیا تورک بوو، کەرامەت فارس بوو، خەڵکی شیراز بوو. کەرامەت ئەفسەر بوو، نۆکەری دەوڵەت بوو، هیچ پەیوەندییەکیان بەیەکەوە نەبوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لەسێدارەدانی ئەوان کاریگەریی چی بوو لەسەر زیندانییەکان؟**

**سـەفەرخان:** خەڵکیی هەموو کێشـەکانیان دەزانی، هەموو خەڵکیی ئاشـنا بـوون بە کارەکانـی ڕژێـم، دادگاییەکە دادگاییەکـی ڕووکەش بـوو، دەیانویسـت زیندانییان پەشـیمان بکەنـەوە و تۆبەیان پێ بکەن، بەڵام خەسـرەوی گوڵسورخی و کەرامەت بە پێچەوانەی ویستی ڕژێم هەڵسوکەوتیان کرد.

**عەلی ئەشـرەف دەروێشـیان: بۆچوونی تۆ چی بوو لەسـەر سیاگوڵییەکان؟**

**سەفەرخان:** تۆ کە خوێندەواریت، ئایا بە هەزار کەس و دوو هەزار کەس و تەنانەت پەنجا هەزار کەسیش دەتوانرێت ڕاپەڕین بکرێت؟ لینین گووتوویەتی (وڵاتێک کە ئابوورییەکەی تێکشـکابێت و حیزبی بەهێزی هەبێت، ئەوا ئەو حیزبە دەتوانێت دەسـەڵات بگرێتە دەسـت). ئێمە هیچ شتێکمان نییە، بۆ نموونە کوردەکان چەندین ساڵە نان و خورما دەخۆن و خەبـات دەکـەن، زیندانیی دەکرێـن و دەکوژرێن، هیچ کارێکیشـیان

پێ ناکرێت، هەر حیزبێکیان بەسەر چەند دەستەیەکدا دابەشبوون و قسەی زلیش دەکەن. مەبەستم لەم سیاگۆلانەیە کە شەڕی پارتیزانییان دەستپێکردبوو. هۆکاری سەرکەوتنی (ماوتسی تۆنگیش) ئەوەبوو کە جووتیارەکانی بووژاندەوە. لە وڵاتی ئێمەدا کرێکار نەبوو، واتە کرێکاری بەکەڵک و شۆڕشگێڕ نەبوو، من کرێکارم زۆر بینیوە، بەڵام هەموویان کرێکاری تێکۆشەر نەبوون، کرێکارێک کە خاوەن خانووە و هەموو شتێکی هەیە، دەست و قاچیشی زنجیر نەکراوە و بە خۆشی دەڵێت کرێکار.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: کەواتە بە بۆچوونی تۆ جووتیارەکان دەبێت...**

**سەفەرخان:** بەڵێ جووتیارەکان لەبەر خاتری زەوییەکانیان، نەک لەبەر خاتری ئایدیۆلۆژیا لە بەرامبەر زوڵمی دەرەبەگەکاندا ناچار بوون ڕاپەڕن.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: بۆچی تۆ هیچ کاتێک بۆ نانخواردن نەدەهاتیتە سەر سفرەی نەخۆشەکان؟**

**سەفەرخان:** ئاخر ئەو سفرەیە بۆ ئەو زیندانییانە بوو کە نەخۆشیی گەدەیان هەبوو و ئازاریان هەبوو، ئەوان پێیان دەگووتم منیش بچم لەلای ئەوان نان بخۆم، چونکە خواردنی نەخۆشەکان لە خواردنەکانی تر باشتر بوو، ئەوان خزم و کەسەکانیان لە دەرەوەی زیندان خواردنی باشیان بۆ دەهێنان و خۆشیان خواردنی باشیان دروست دەکرد. بۆ نموونە شۆربای باشیان دروست دەکرد، زۆرجار بۆ بەهێزکردنیان هەنگوین و کەرەیان پێدەدان، زیندانییەکان پێیان دەگووتم تۆ کە ئەوەندە برسێتیت کێشاوە ماوەیەک بڕۆ بۆ سەر سفرەی نەخۆشەکان، بەڵکو کەمێک هێزت بە بەردا بێتەوە، منیش دەمگووت ناچم و لەسەر سفرەی ئاسایی دادەنیشم. تەنانەت دکتۆر (ڕەحیمیان) بۆ ماوەی یەک مانگ

دەرمانــی بەهێزکردنی بۆ نووســیم، دکتۆر ڕەحیمیــان خۆی زیندانیی سیاسی بوو، دکتۆری زیندانیش بوو.

**عەلــی ئەشــرەف دەروێشــیان: ئــەو لەگــەڵ کام گرووپەدا دەستگیرکرابوو؟**

**ســەفەرخان:** ڕۆژێک حەمید ئەشــرەف لە ڕووبەڕووبوونەوەیەکدا فیشــەکی بەردەکەوێــت، بە ناوێکی تــرەوە دەیبەنە لای ئــەم دکتۆرە، دکتۆریش نایناسـێت و چارەسـەری بۆ دەکات، دواتر چەند کەسـێک دەســتگیر دەکرێــن و لە لێکۆڵینــەوەدا دەڵێن حەمید ئەشــرەف بریندار بووە و لەلای ئەو دکتۆرە چارەسەر کراوە، هەر بۆیە دکتۆر دەستگیر دەکرێت و لە لێکۆڵینەوەدا دەڵێت من چوزانم ئەمە چییە، من دکتۆرم و هەرکەسـێک سەردانم بکات چارەسـەری بۆ دەکەم. حوکمی سێ ساڵ زیندانیی درابوو، ئەو کەسێکی زۆر باش بوو، ئێستاش ساڵانە دەچم بۆ سەردانیکردنی و ئەویش دێت بۆ سەردانیم. ئەو لە ژووری ژمارە سێ بوو، کەسێکی خوێندەوار و زیرەک بوو، بەردەوام لەگەڵ زیندانییەکاندا لــە گفتوگۆدا بوو. بەڵێ من نەدەچوومە ســەر ســفرەی نەخۆشــەکان، مەگەر تۆ خۆت لێپرسراوی سفرەی نەخۆشەکان نەبوویت.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشیان: بەڵێ لێپرســراو بووم، بەڵام تۆ هیچ کاتێک نەهاتیتە ســەر ئەو سفرەیە، پۆلیسیش چەند جارێک هەڵیکوتایە سەرمان.**

**ســەفەرخان:** بەڵێ زیاتر لە چەندین جار، جارێکیان هێرشــیان کرد و تەواوی زیندانییەکانیان کردە حەوشەکەوە و پێڵاوەکانیان پێ دانان، بە پێی پەتــی ناردیاننەوە بۆ ژوورەکانیان، پۆلیس گووتبووی لەوانەیە زیندانییــەکان بە ئەم پێڵاوانەوە لە بیری هەڵاتندا بن. جارێکیان لە کاتی هەڵاتنی بێژەنی جەزەنی و هاوڕێکانی، پۆلیس هێرشــی کردە سەرمان، جارێکــی تر لــە کاتی هەڵاتنی ئەشــرەفی دەهقانی هێرشــیان کردەوە،

جارێکیش بەهۆی ئەوەی کەسێک بە ناوی (تەقی) کە تورک بوو، تفی لەو پاسەوانە پیرە کردبوو و هاتن و هەموو کۆمیدییەکانیان شکاند و هەرچییەکیان بەردەست کەوت، بردیان. زۆر شتی تریشم لە یادە، چەند جارێکیشیان هێرشیان کردە سەر زیندانی ژنانی سیاسی و زۆریان لێدان، هەروەها لە زینداندا ژمارەیەک زیندانی چەپڕەوییان دەکرد و پۆلیسیش هێرشی دەکرد، ئەگەر دوو کەس بەیەکەوە قسەیان بکردایە دەهاتن و دەیانگووت بۆچی بەیەکەوە قسە دەکەن؟ بۆچی هاتوویت بۆ ئەم ژوورە؟ بۆچی چوویتە ئەو بەندە؟ ئیتر هەفتانە دەهاتن و ژوورەکانیان دەپشکنی، بۆ نموونە ڕۆژێک کەسێک کە هاوپەیوەندیی موهەندیس (تەنازی) بوو ویستیان ئازادی بکەن، ئەویش هەر موهەندیس بوو، بە بڵندگۆ هاواریان کرد هەمووان بڕۆنە حەوشەکە، بە گشتی هەمووان ڕۆیشتن، من و عەلی خاوەری و یەحیای ڕەحیمی و عەلی کەمالی و ئەو مەنسورەی کە ئێستا لە وەزارەتی دەرەوە کار دەکات، نەڕۆیشتین.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: مەنسوری کێ بوو؟**

**سەفەرخان:** جەوادی مەنسوری کەسێکی مەزهەبی بوو، ئەویش نەڕۆیشت، دوای ئەوەی کە وتارەکەی موحەڕەڕی تەواو بوو، هاتن و بە بڕیاری سەرهەنگ زەمانی هەموومانیان برد بۆ ژووری تاکەکەسی و باشیان لێداین، واتە ئەوانەی نەڕۆیشتبووینە حەوشە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەو سەرهەنگ زەمانییە بۆچی ئەوەندە ترسناک و بێبەزەیی بوو؟**

**سەفەرخان:** لەسەرەوە فەرمانی پێدەکرا، خۆشی هەڵسوکەوتی خراپ بوو، دیارە ئێمە کەسانی باشیشمان زۆر بینیبوو، بۆ نموونە سەروان (مەزلومی) کەسێکی باش بوو، بەڕاستی ئەگەر توانای هەبووایە هاوکاریشی دەکردین، یان (ساقی) کە تورک بوو، لێپرسراوی (قزڵ قەڵا) بوو، دواتر (ساقی) کرا بە کادیری ئیداریی، بەڵام سەرهەنگ

زەمانی بەڕاستی جەللاد بوو، ئەو باتوومەکەی دەستی دەکرد بە قنگی زیندانییەکانـدا و دوایـی پێـی دەگووتـن دەبێت باتوومەکە بلێسـنەوە. ڕۆژێکیان لە پەنجەرەکەوە سەیری تەلەفزیۆنی بەندی (٤و ٥)م دەکرد، پاسـەوانێک کە خەڵکی ئەهواز بوو ڕۆیشـت و شـکاتی لێکردم. هاتن و بردیانم کە بۆچی سـەیری تەلەفزیۆنـی بەندەکانی تر دەکەم. منیش گووتم: بۆچی چی تێدایە؟ من وەستام و سەیری ئەملاو ئەولام دەکرد، بەڵێ بەو ڕووداوە زۆر ناڕەحەت بووم، هەرچەندە ئازاریان نەدام، بەڵام زۆر ناڕەحەت بووم. دواتر داوام کرد کە من بگوازنەوە بۆ ژوورەکەی ئاغای (خاوەری) خاوەریش بە جگەرەکێشانی من ناڕەحەت بوو، منیش بۆ ڕێزگرتن لە ئەو دەچوومە حەوشـەکەوە جگەرەم دەکێشا. خاوەری بەردەوام دەیگووت نەخۆشم.

**عەلی ئەشـرەف دەروێشـیان: بەڕاسـتی ئـەو نەخۆش بوو، نەخۆشیی شەکرەی هەبوو، چاوەکانی خەریکبوو کوێر دەبوون.**

**سـەفەرخان:** ئێجگار واش نەبوو، ئەو کەسـێکی بێ جوڵە بوو، لەم دواییانەدا دەیویست خواردنەکەشی بۆ بەرنە ژوورەوە، ئەو دەیویست بەردەوام لەسەر سفرەی نەخۆشەکان دانیشێت، من ئەم جۆرە ڕەوشتەم پـێ باش نەبوو. فشـاری زۆریان لە من کرد کە بچمە سـەر سـفرەی نەخۆشـەکان، بـەڵام من نەچـووم. کاتێک کە چوومـە زیندانی ئەوین، ئـەو مریشـکەی پێیان دەدایین زۆر چەور بـوون. کاتێک خواردنیان بۆ دەهێنایـن لە تەنەکەدا بۆیان دەهێنایین. یەکێک لە تەنەکەکانیان کونکون کردبوو بۆئەوەی چەورییەکەی بڕوات.

**عەلـی ئەشـرەف دەروێشـیان: ئێسـتاش خەڵکـی دێـن بۆ سەردانیکردنت؟**

**سـەفەرخان:** بەڵێ، من هەمیشە میوانم هەیە و سـەردانیم دەکەن، پێیـان سـەیرە کە مـن چۆن لـەدوای ئەو هەمـوو سـتەم و زیندانییە

مــاوم. دێــن تاکو ببینن چۆن ماوم، چۆن ئەو هەموو ســاڵە لە زینداندا ماومەتەوە، ڕۆژێک ژنێک هات بۆ سەردانم و گووتی: من لە کتێبی (ساڵە تەماوییەکان)ی عەلی ئەشــرەف دەرویێشیان ناوی تۆم خوێندووەتەوە، هیوادار بووم تۆ ببینم. ئەو ژنە خۆشــی نووســەرە و کاری وەرگێڕان دەکات، ئەو لەگەڵ هاوســەرەکەیدا هاتبوو کە ناوی ئاغای موســەوییە، ئەوان گۆڤاری (تەوسیعە) دەردەکەن.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەم خانووەی تێیدا نیشتەجێیت هی کــێــیــە؟**

**سەفەرخان:** هی دەزگای شەهیدانە، مەگەر نازانیت؟

**عەلی ئەشرەف دەروێشــیان: بەڵێ بیستوومە، بەڵام زۆر دڵنیا نەبووم.**

**ســەفەرخان:** ئــەم باڵەخانەیە ئەبولقاســمی ســەرحەدزادە و کازم بەجنەوەردی و دکتۆر شــەیبانی دروســتیان کــردووە، ماوەیەکە لێرە بێــزار بــووم، ئەگەر قاتی یەکەمیان پێ بدامایە باشــتر بوو، بەڵام قاتی پێنجەمیان پێ دام. دەبێت بە شەســت و هەشــت پلیکانەدا سەرکەوم و بچمە خوارەوە. ســەرەتا بۆ من باش بوو، بەڵام ئێســتا کە نەخۆشم و سەکتە لێی داوم، زۆر نارەحەتە، چەند جارێک لە پلیکانەکان کەوتوومەتە خــوارەوە. دکتۆر شــەیبانی کەســێکی زۆر بەڕێزە، ئــەو کوێرەوەریی زۆری کێشــاوە، ئەو ســتەم و زیندانییەکی زۆری لە ڕژێمی پێشــوودا چەشتووە، کەچی لەسەر ئەم هەموو کۆشک و تەلارەوە ئەو تەنها یەک خانووی هەیە و هیچی بۆ خۆی کۆ نەکردووەتەوە، ئەو ئێستاش وەک هەمان ئەو کاتە وایە کە لە زینداندا بوو، کەسێکی هێمن و سادەیە.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشــیان: کچەکەت و نەوەکەت سەردانیت دەکەن؟**

**ســـەفەرخان:** بەڵێ، زۆرم زەحمەت پێوە دەبینن، دێن و ماڵەکەم بۆ پاک دەکەنەوە و خواردنم بۆ دەهێنن.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: چەند نەوەت هەیە؟**

**سەفەرخان:** ســێ نەوەم هەیە، کوڕێک بە ناوی بەهرۆز و دوو کچ بە ناوەکانی بیتا و ســارا، ئەمانە منداڵی مەهینن، بەهرۆز ئێستا خۆشی منداڵی هەیە.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشــیان: ڕژێمی شــا هیچ کاتێک داوایان لێکردوویت لە تەلەفزیۆن نیشان بدرێیت؟**

**ســـەفەرخان:** بەڵێ، مەگەر پێم نەگووتیت من لەگەڵ ئەو شەســت کەســەی ســاڵی (١٣٥٦) بردیانیــن بــۆ پاکانەکردن، ئــەوان هەموویان پاکانەیان کرد و تەنها یەک کەسیان نەما پاکانە نەکات، تەنها من مامەوە و پاکانــەم نەکرد، لــە کاتی گەڕانەوەم هاوڕێیانــم گوتیان هەموومان چاومــان لەســەر تەلەفزیۆن بــوو تاکو چاومــان پێت بکەوێــت، بەڵام خۆشــبەختانە تۆ دەرنەکەوتیت، ئیتر هاوڕێیان لە دەورم کۆبوونەوە و باوەشیان پێداکردم، گووتم: بینیتان چۆن پاکانەم نەکرد و یەک دەست چاکــەت و پانتۆڵم زەرەر کرد. ئەو زیندانییانەی پاکانەیان کرد بردیانن بۆ سەرتاشــخانە و جلوبەرگی تازەیان پێــدان و ئازادیان کردن. دواتر منیان برد بۆ کۆمیتەی هاوبەش، پێش ئەوەی بگەمە ڕاڕەوەکە، پاکەتی جگەرەکەیــان لــێ ســەندم، گووتم: بۆچــی جگەرەکانــم لێوەردەگرن؟ گووتیان: دوایی پێتی دەدەینەوە، لە ناکاو کەسێک هات و گووتی: ئێرە کۆمیتەی هاوبەشــە و من ئاغای ڕەســوڵیم، من تا ئەو کاتە ڕەســوڵیم نەبینیبوو، بردیانمە ژوورێکەوە و جگەرەکانیان پێ نەدامەوە. ڕەسوڵی دەیویســت فشــارم لێ بــکات و ماوەیەک جگەرەکانی پــێ نەدامەوە و

منیش هیچم نەگووت. دواتر ڕەسـوڵی هاتە ژوورەکەوە و جگەرەی بە زیندانییـەکان داو بە منی نەدا، ئاگام لێبوو جگەرەکەی بە کەسـێک داو ئاماژەیەکـی بـۆ من کرد کە جگەرەکە بە من بـدات، وەک ئەوەی قینی لە من بێت، بەڵام من تەسـلیمی نەبووم. لە زینداندا کەسـانێک هەبوون لەپێناو ئازادبووندا هەموو کارێکیان دەکرد، بۆ نموونە کەسـێکی وەک سیسـیانی ئەرمەنی، کە دوایی بوو بە موسـڵمان و بەردەوام ڕاپۆرتی دەنووسی.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: سیسیان سەر بە کام گرووپ بوو؟**
**سەفەرخان:** سەر بە گرووپێکی چەکداریی بوو، کەسێکی زۆر چەپ بوو، دواتر بوو بە ڕاست.

**عەلی ئەشرەف دەروێشـیان: ئەگەر بکرێت لەبارەی هۆشەنگی تیزابییەوە شتێک باس بکەیت.**
**سەفەرخان:** هۆشـەنگی تیزابی خوێنـدکاری کۆلێژی پزیشک بوو، دوایین سـاڵی خوێندنی بوو، هاوینی سـاڵی (١٣٤٥) دەستگیر دەکرێت و چوار سـاڵ حوکم دەدرێت، هەر ئەو سـاڵە حەمیدی ئەشرەفیش کە خوێندکاری کۆلێژی هونەر بوو، دەستگیر دەکرێت، حەمیدی ئەشرەفی یەکەمـی کۆلێـژی هونەر بوو، ماوەی دوو سـاڵ لە زینـدان مایەوە و ئازاد کرا و ڕۆیشـت. هۆشەنگی تیزابی هاودۆسیەی محەمەدی ئیمانی و محەمـەدی ئەمینی و ئاغایی و نەورۆزی بوو، ئەوان مەیلیان بە لای تودەییەکانەوە بوو، هۆشـەنگ لە زینداندا بوو بە تودەیی و کەسـێکی توندڕەو بوو، هەرکەسـێک دژی بیروباوەڕی ئەو قسـەی بکردایە بە توندی ڕووبەڕووی دەبووەوە. هەمووتان ئەوەتان بیستووە کە چۆن شەپازلەی لە حوجەتی کرمانی داوە. حوجەتی کرمانی سەر بە حیزبی میللی ئیسـلامی بوو، واتە هاودۆسـیەی ئەبولقاسمی سەرحەد زادە و کازمی بەجنەوەردی بوو، ئەمانە کەسـانی لاو و باش بوون. حوجەتی

کرمانـــی زۆر لایەنگــری گفتوگــۆ بوو، بــەو لاشــە لات و بێهێزەیەوە بــەردەوام پیاســەی دەکرد و ئــارەزووی لە وتوویــژ و گفتوگۆ بووە، کــە ئەوەش بووەتە هــۆی ئەوەی چەندینجار لێــدان بخوات. جارێکیان هاوینی ســاڵی (١٣٤٧) بوو، لە حەوشــەی بەندی چوار نانی بەیانیمان دەخوارد، سەیرم کرد حاجی عێراقی یەخەی کەسێکی بە ناوی خاقانی گرتووە دووری دەخاتەوە، خاقانی هاودۆســیەی کەســانێک بوو کە لە ڕاپەڕینــی پانزەی خورداد دەســتگیر کرابوون، ئەو کەســێکی قەڵەو و بــاڵا کورت بوو. نازانــم هۆکەی چی بوو کە خاقانی شــەپازلەیەکی لە حوجەتــی کرمانی دا، دوای چەند ڕۆژێک حوجەتــی کرمانییان برد بۆ بەندی سێ.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشیان: خاقانی لەسەر چی شەپازلەی لە حوجەتی کرمانی دابوو؟**

**ســەفەرخان**: خاقانی لــە لایەنگرانــی ئایەتوڵڵا ڕەبانی بــوو، گوایە حوجەتــی کرمانی بڵاوی کردووەتەوە کە ئایەتوڵــڵا ڕەبانی لە خاقانی نــاڕازی بــووە، خاقانیش لەســەر ئــەو قســەیە شــەپازلەیەکی لێداوە. حوجەتــی کرمانــی لــە بەنــدی ســێوە دوور دەخەنــەوە بــۆ زیندانی بەرازجــان، کاتێک دەیەوێت خوداحافیزی لــە هاوڕێکانی بکات، خاقانی شەپازلەیەک لە حوجەتی کرمانی دەدات. کاتێک هۆیەکەیم پرسی بۆچی ئــەو شــەپازلەیەت لێداوە، ئەو گووتی: جارێکیان بــە هاندانی حوجەتی (لاجوردی) ئەو شــەپازلەیەکی لە من داوە، منیش تۆڵەی خۆم کردەوە. هۆشەنگی تیزابی کەسێکی توڕە و دەمارگیر بوو، جارێکی تریش لەگەڵ زیندانییەکی عێراقی بە ناوی (عادل هەبە)، کە ئەندامی حیزبی کۆمۆنستی عێراق بوو، دەبێتە شــەڕیان، عادل هەبە ئەندازیار بوو، بە حەوت ساڵ حوکم درابوو، کاتێک چاوم لێبوو ئەو دوو کەســە بەرەنگاری یەکتری ببوونەوە، منیش ڕۆیشتم و یەک بۆکسم لێدا.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لە عادل هەبەت دا؟**

**سەفەرخان:** نەخێر، لە هۆشەنگی تیزابیم دا، چونکە عادل میوانی ئێمە بوو، باش نەبوو لەگەڵ ئەودا شەڕ بکەم. دواتر هۆشەنگیان بردە ژێرزەمینەکە و دووریانخستەوە بۆ بەندی سێ، لەوێ بوو کە شەپازلەی لە حوجەتی دابوو، دواتر دووبارە هێنایانەوە بۆ بەندی چوار. من هۆشەنگم بردە ژوورەکەی خۆم، ماوەی یەک هەفتە لە ژوورەکەی مندا مایەوە، لەوێش ئارامی نەدەگرت. زیندانییانی لە خۆی کۆدەکردەوە و پڕوپاگەندەی بۆ دەکردن، دواتر لەوێش دوورخرایەوە و بردیان و دوای ماوەیەک لە ڕۆژنامەکاندا بینیم نووسراوە، کە هۆشەنگ تیزابی لە ڕووبەڕووبوونەوەیەکدا کوژراوە، بەڵام دواتر دەرکەوت لەژێر ئەشکەنجەدا کوشتبوویان. ئەو دکتۆر بوو، کەسێکی چەپی توندڕەو بوو، ئەگەر کێشەیەک ڕووی بدایە، ئەو یەکەم کەس بوو نارەزایی دەردەبڕی، دواتر لەگەڵ ڕەحمان هاتفی گرووپێکیان دروستکرد. ڕەحمان هاتفی لەدوای شۆڕش کوژرا، ئەو ڕۆژنامەنووس بوو، هەروەها فێری فەرش چنین ببوو، کەسێک هەبوو بە ناوی موشیر خەڵکی مەرەند بوو، ئەو ڕەحمانی هاتفی فێری فەرش چنین کردبوو. فەرشێکی چنیبوو، وێنەی ستارخان و ماکسیم گورگی لەسەر نەخشاندبوو، منیش بە شۆخییەوە پێم دەگووت: تۆ ویستووتە وێنەی ستارخان بکێشیت، بەڵام ئەمە وێنەی باقرخانە، پار ئەو فەرشەم لە ماڵی کەسێکدا بینی.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لەبارەی ڕەزای شەلتوکییەوە قسەم بۆ بکە.**

**سەفەرخان:** کەسێکی پاک بوو، شەلتوکی لە هەمووان خاوێنتر بوو، ئەوان هەموویان کەسانی باش بوون، بەڵام کاتێک لە زیندانی بەرازجان بووین زۆربەی ئەفسەرەکان لەگەڵ زیندانییە ئاساییەکان نەدەگونجان

و دوورەپەرێز بوون، بەڵام دواتر باش بوون و تیکەڵاوییەکەیان زیاتر بوو. ڕەزای شـەلتوکی کەسـێکی دڵپاک بوو، من وام بیست کە دواجار سەردانی دکتۆری کردووە گووتوویەتی دکتۆر کارێک بکە نەگەڕێمەوە بـۆ زینـدان، واتە دەرمانێکی وای پێدا کـە بیکوژێت، دوای ماوەیەک لە مردنی، لە دکتۆرم پرسـی بەچی مرد؟ دکتۆر گووتی: منیش نازانم! وا هەست دەکەم نەخۆشیی شێرپەنجەی هەبووبێت...

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: بەهرۆزی حەقی و هاوڕێکانی چۆن لە زیندان هەڵاتن؟**

**سـەفەرخان:** بەهـرۆزی حەقـی لـە زیندانـی قەسـری تارانـەوە دوورخرابووەوە بۆ زیندانی شـاری (سـنە)، ئەو لە ڕێکخراوی چریک فیداییەکان بوو، لەوێشـەوە بۆ زیندانی بەنـدەر عەباس دوورخرایەوە. مەشـعوف کەلانتەریـش لە زیندانـی بەندەر عەباس بـوو، ئەو بەهۆی ئەشکەنجەی زۆرەوە تووشـی نەخۆشیی ببوو، لە بارێکی زۆر خراپدا بوو، لەسـەر ئەو هەموو نەخۆشییەشـەوە کەسـێک لێی ناپرسێتەوە و هەر ڕۆژەو بە بەهانەیەکەوە پەلکێشی دادگای دەکەن. بەهرۆزی حەقی و محەمەد عەلی پەرتەوی، کە قاچێکی فەلەج بوو، حەسەن خۆشنووس و بەهرۆز سـونعی کـە دوورخرابوونەوە بۆ زیندانـی بەندەر عەباس کاتێـک دەبینن مەشـعوفی کەلانتەری نەخۆشـە و کەسـێک ئاوڕی لێ ناداتەوە، دەست دەکەن بە مانگرتن و خواردن ناخۆن. دوای دوو هەفتە لە مانگرتن لەو هەوا گەرم و کوشـندەیەی بەندەر عەباس موشـعوف دەگوازنـەوە بۆ زیندانی ئەویـن. دواتر بەهـرۆز و هاوڕێکانی بەهۆی ئەشکەنجەدانی بەردەوامی زیندانییانی سیاسی لەگەڵ پۆلیسدا تووشی ڕووبەڕووبوونەوە دەبنەوە و پۆلیس دەڕژێنە ناویان و باشیان لێدەدەن. دوای ماوەیـەک، لـە پاییـزی (١٣٥٤/ ١٩٧٥) محەمـەد عەلی پەرتەوی و بەهرۆزی حەقی و حوسـێن خۆشـنووس لە زینـدان هەڵدێن، بەڵام هەرسێکیان دەستگیر دەکرێنەوە و بە برینداریی و گیانی خوێناوییەوە،

هەریەکــەو دەیانبەنە ژووری تاکەکەســییەوە لەوێش دووبارە دەســت دەکەنەوە بە مانگرتن.

بەهرۆزی ســەنعی کە خوێندکاری کشتوکاڵ بوو لە کەرەج و خۆی خەڵکی مەشــهەد بــوو، دوای یەک هەفتە لە ئەشــکەنجەدان و گەرمای کوشــندە، تووشــی نەخۆشــیی دەبێت و ژیریی خۆی لەدەست دەدات. بەهرۆزی ســەنعی لــە کاتژمێر (١٢)ی شــەودا کە دوایین چرکەکانی ژیانــی خۆی بەڕێ دەکات، پۆلیس دێن و لە ژوورەکە دەیبەنە دەرەوە. بەهرۆزی حەقی و محەمەد عەلی و حوســێن خۆشنووس ماوەی (٢٥) ڕۆژ بەبــێ خواردن لە ژوورە تاکەکەســییەکاندا دەمێننەوە. ڕۆژێک بە بێهۆشــی دەیانبەنە حەوشەکە و پۆلیســەکان باتوومەکانیان دەکەن بە قنگیاندا و دواتر دەیانگەڕێننەوە بۆ ژوورە تاکەکەســییەکان، شەوانە تا بەیانی پاســەوان بەسەر ســەریانەوە دەبێت و لێیان دەدەن، دوای ئەو هەمــوو لێدان و ئەشــکەنجەیە هەریەکەیان بــە فانیلەیەکی عەلاگە و بە شۆرتێکەوە دەگوازنەوە بۆ زیندانەکانی تر.

هەرچۆنێــک بێــت جگە لــە ژمارەیەکی کەمــی زیندانییــان، تەواوی زیندانییەکانی تر بڕیار دەدەن لە بەرامبەر پۆلیســدا بەرگریی بکەن، کە بەڕاستی بەرگرییان کرد. هەموو سەردانیکردنێک قەدەغە بوو، تەنانەت ئەگــەر ســێ کەس بەیەکەوە لە ژوورێکدا بوونایــە بۆیان نەبوو لەگەڵ یەکتریدا قســە بکەن. شــەو و ڕۆژ زیندانییانیان دەبرد بۆ ئەشــکەنجە، زیندانییــان لەتــاو ئازار و لێــدان هاواریان دەکــرد، ئەوانیش بەردەوام لێیان دەدان، تاکو بێهۆش دەبوون.

لــە ڕۆژێکــی زســتانی ســاڵی (١٣٥٥/ ١٩٧٦) لیکۆڵــەرەکان هاتنــە نــاو زیندانی قەســر هەوڵیان دا دووبارە زیندانییان تووشــی کێشــە و ناڕەحەتی بکەن و باڵادەســتیی خۆیان بسەلمێنن، لیکۆڵەرێکی ساواکی لێم هاتە پێش و دەستی کرد بە قسەکردن.

لێکۆڵەر: تۆ ناتەوێت دوای چەندین ســاڵ لــە زیندانیت، لێرە بڕۆیتە دەرەوە؟

من: کێ هەیە حەز نەکات لێرە بڕواتە دەرەوە؟

لێکۆڵەر: ئەی بۆچی لەو بارەیەوە شتێک نانووسیت؟

مــن: ئەوانەی کە منیــان دەســتگیرکردووە و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کردووم و بردوویانم بۆ دادگا هەموویان مردوون، ئەوانەشی کە لەگەڵ مندا لەســەر یەک کێشــە دەســتگیرکراوین، یان مردوون، یان خەریکی ژیانی ڕۆژانەی خۆیانن، ئێستا من چی بنووسم؟

لێکۆڵەر: تۆ دەتەوێت ببیت بە قارەمان؟

من: نەخێر، من کەســێکی ئاســاییم، بەڵام ئێوە دەتانەوێت من بکەن بە قارەمان، ئەگەر ســی ساڵ لەمەوبەر منتان ئازاد بکردایە، ئێستا هیچ کەسێک منی نەدەناسی.

لێکۆڵەر: ئەگەر شتێک نەنووسیت، تا مردن لێرە دەمێنیتەوە.

من: من هیچ شتێک نانووسم.

لێکۆڵەر: ناچارت دەکەم.

من: ناتوانیت.

لێکۆڵەر: کێبڵمان هەیە، حوســێنمان هەیە. (حوســێنی یەکێک بوو لە جەللادە ترسناکەکان، کە زۆر بە خراپی زیندانییانی ئەشکەنجە دەدا).

من: دەتوانیت هەموو ئەوانە تاقی بکەیتەوە.

ســاڵی (١٣٥٥/ ١٩٧٦) خەڵکــی ســتەمدیدەی ئێــران لە هــەر کاتێک زیاتر ڕووبەڕووی گرانیی ببوونەوە، لە کۆمەڵگای ئێراندا سانســۆر و چاودێریکردن ببوونە هۆی ئەوەی کە زۆرێک لە کەسایەتییە زانستی و کەلتوورییەکان کۆچ بکەن بۆ دەرەوەی وڵات. لەم ڕێگایەوە ئیمپریالیزم بەبێ خەرجکردنی کەمترین سەرمایە، لە ئەو کەسانە سوودمەند دەبوو. لە وڵاتی سانســۆرکراوی ئێراندا، لە ســاڵی (١٩٧٧)ی میلادیدا، ڕێژەی خوێندنــەوە زۆر کــەم بوو، لە وڵاتی ئێمەدا بە ئــەم هەموو ڕابردووی کەلتوورییــەوە بــە چەندین ملیــۆن خەڵکەوە لە ســاڵێکدا تەنها (٥٠٠ تا ٦٠٠) ناونیشانی کتێب بڵاودەکرایەوە. شا بە سیاسەتی دژە کەلتووریی و دژە خوێندنەوە هەوڵی دەدا خەڵکی بە ناهۆشیاریی بمێننەوە.

**عەلی ئەشرەف دەرویشیان: زۆرێک لە ئێوەیان برد بۆ کۆمیتەی هاوبەش تاکو لەوێ پاکانە بنووســن و ئازاد بکرێن، کاردانەوەی ئێوە لەگەڵ ئەواندا چۆن بوو؟**

**ســەفەرخان:** ڕۆژێکی سەرەتای ســاڵی (١٣٥٥/ ١٩٧٦) لە بڵندگۆی زیندانەوە بانگەوازیان کرد، سەفەری قارەمانی بە زوویی کەلوپەلەکانی کۆبکاتــەوە و لەبــەر دەرگای پاســەوانەکان ئامــادە بێت. ڕۆیشــتم و بردیانمــە ژێرزەمینەکە، کاتژمێر و هەموو شــتەکانی تریان لێوەرگرتم. چاویان بەســتم و سواری ئۆتۆمبێلیان کردم. دوای ماوەیەک ڕۆیشتن، دایانبەزانــدم، بــە چــاوی بەســتراوەوە بردیانمــە ژوورێکــەوە، بــۆم دەرکەوت ئەو شوێنە کۆمیتەی هاوبەشە. کە چاویان کردمەوە سەیرم کرد جەللادە ناسراوەکانی وەکو ڕەسوڵی و حوسێن زادە و سەرهەنگ زەمانی لەبەر دەممدا وەســتاون. بە بینینی ئەوان زۆر ناڕەحەت بووم، ئەوانیش زانییان پەســت و تورەم، بردیانم لــە ژوورێکدا دایاننام، تاکو لە هەلێکدا بە قســەی خۆش و پەیمانی درۆ، یان بە لێدان و هەڕەشــە پاکانەم پێ بنووسن.

دەوروبەری کاتژمێر یەکی نیوەشــەو بوو کە لە خەو هەڵیانســاندم، کە چاوم کردەوە ڕەسولیم لە پشت سەری خۆمەوە بینی. ئەو یەکسەر گووتــی: (باوکەکــەم منم هەڵســە با بەیەکــەوە بڕۆین)، ئــەو منی برد بــۆ ژوورەکــەی خــۆی، واتە ژووری ئەشــکەنجەدان، چــا و جگەرەی پێــدام، بــە زمانێکی لــووس گووتی: (تۆ ئــازاد دەکەم، بــڕۆ دەرەوە و خەریکــی ژیانی خۆت بە، بۆچی تۆ تاکو ئێســتا لە زینداندا ماویتەوە؟) لە وەڵامدا گووتم: ئاغای ڕەسوڵی من خۆم خۆمم نەخستووەتە زیندان، ئێــوە و دادوەرەکان منتان لە زینداندا هێشــتووەتەوە. ڕەســوڵی خۆی بــە خەمبــار و ناڕەحــەت نیشــان دا و چەنــد جوێنێکی بــە دادوەر دا. ئێتــر هیچ قســەیەکی تری لەگەڵــدا نەکردم و گەڕاندمییــەوە بۆ هەمان ژوور کــە لێی بــووم. دوای یانزە ڕۆژ لە هەمان ژووری تاکەکەســیدا

دووباره نیوەشـــەوێک لە خەو هەڵیانســـاندم. ڕەسوڵی کەسێکی جەللاد و ئەشـــکەنجەگەر بوو، وا هەســـتم دەکـــرد ژن و ماڵـــی نەبێت، چونکە شـــەو و ڕۆژ لە ژوورەکەی خۆیدا بوو، ئەو هەمیشـــە کاتی نیوەشـــەو زیندانییەکانی دەبرد بۆ ژوورەکەی خۆی. بەڵێ، لە خەو هەڵیســـاندم و بردمی بۆ ژووری ئەشـــکەنجە و گووتی: بۆیە تۆم هێناوەتە ئێرە تاکو ئـــازادت بکەم و بڕۆیـــت، زیندانییەکان تۆیان کـــردووە بە قارەمان، من دەمەوێت ئەو قارەمانییە لەدەست ئەوان وەربگرمەوە.

منیش گووتم: زیندانییان لە منەوە قارەمانییان بۆ خۆیان بنیاد ناوە. ئەگەر ئەوان وەک قارەمانێک ســـەیری مـــن دەکەن، ئەوە ئاکامی کاری ئێوەیە، من بە ویستی خۆم لێرە نەماومەوە، دادگای سوپا تا ئێستا منی لە زینداندا هێشتووەتەوە.

ڕەســـوڵی دووبارە چەند جوێنێکی بە دادگا و نەســـیری ســـەرۆکی ســـاواک دا و گووتـــی: (ئێمـــە خزمەتکاری شـــاین، تەنها شـــا) دووبارە ناردمییەوە بۆ هەمان ژوور، لە ڕۆژی دوانزەیەمدا کە من لە کۆمیتەی هاوبەش بووم، ڕەســـوڵی دووبارە منی بردەوە بۆ ژووری لێکۆڵینەوە، بەڵام ئەمجارەیان ئەو بە تەنها نەبوو، بەڵکو حەسەن زادەشی لەلا بوو. لەگەڵ چوونە ژوورەوەم ڕەسوڵی ڕووی کردە حەسەن زادە و گووتی: ئاغای دکتۆر لەگەڵ قارەمانیدا قســـە بکە. من زانیم ڕەســـوڵی بە هێنانی حەســـەن زادە مەبەستی ترســـاندنی منە، حەســـەن زادە کەمێک یاریی بـــە پەنجەکانـــی کـــرد و گووتی: من و تۆ زمانمان یەکـــە، ئەو بە زمانی تورکی ماوەی یەک کاتژمێر و نیو قســـەی بۆ کردم، بەڵام من بە یەک وشەی (یۆخ)، واتە نابێت، وەڵامی تەواوی وتەکانی ئەوم دایەوە. ئینجا حەســـەن زادە بە توڕەییـــەوە ڕووی کردە ڕەســـوڵی و گووتی: ئاغای ڕەســـوڵی تیپی ئازەربایجان و حیزبی تودە مێشـــکی ئەمیـــان تێکداوە، دروشـــمی (کرێـــکاران و جووتیـــاران یەکگـــرن بە ســـوژن ئاخنراوەتە مێشـــکییەوە) ئەو هەڵســـا و ڕۆیشـــت. دوای ڕۆیشـــتنی حەســـەن زادە دووبارە بردیانمەوە بۆ ژوورە تاکەکەســـییەکە، دوای نیوەڕۆی هەمان

ڕۆژ دووباره بردیانمه‌وه بۆ ژووره‌که‌ی ڕه‌سوڵی، ئه‌مجاره‌یان یه‌کێک له‌ ترسناکترین و بێبه‌زه‌ییترین جه‌للادی ساواک به‌ ناوی (ڕه‌حمانی سه‌ربازجۆ) له‌وێ بوو، ڕه‌سوڵی زۆر له‌سه‌رخۆ گووتی: باوکه‌که‌م وه‌ره‌ بنووسه‌، فه‌رمانیان پێکردووم که‌ ئازادت بکه‌م، له‌ ده‌ره‌وه‌ باشتر ده‌توانیت بژیت، له‌دوای ئازادبوونت بڕیاره‌ مانگانه‌ بڕه‌ مووچه‌یه‌کت پێ بدرێت تاکو ژیانت باشتر بگوزه‌رێت، به‌ڵام به‌و مه‌رجه‌ی دوای ئازادبوونت لاساریی نه‌که‌یت، منیش به‌ توڕه‌بییه‌وه‌ گووتم: ئه‌گه‌ر ئازاد بکرێم پێویستم به‌ مووچه‌ی ئێوه‌ نییه‌، ده‌توانم به‌ هێز و بازووی خۆم ژیانی خۆم دابین بکه‌م.

زۆرمان قسه‌ کرد، ڕه‌سوڵی به‌ توونديی گووتی: نووسراوت لێوه‌رده‌گرم، منیش گووتم تاقیم بکه‌ره‌وه‌، پارچه‌ پارچه‌شم بکه‌ن وشه‌یه‌ک نانووسم، ئه‌ویش به‌ هه‌موو هێزی خۆی ده‌ستی به‌ مێزه‌که‌دا کێشا و گووتی: پێت ده‌ڵێم بنووسه‌. منیش گووتم: ته‌مه‌نی جوانیی خۆم له‌ زینداندا به‌سه‌ربردووه‌ و زیندان هێزی لێبڕیوم، ئه‌گه‌رنا تۆ نه‌تده‌توانی به‌و جۆره‌ قسه‌م له‌گه‌ڵدا بکه‌یت.

به‌ بیستنی ئه‌و قسانه‌ی من، ڕه‌حمانی هه‌ڵسا و به‌ هاوکاریی پاسه‌وانێک به‌ بۆکس کردیانمه‌ ده‌ره‌وه‌. پاسه‌وانه‌که‌ بلوزه‌که‌می هه‌ڵکێشا بۆ سه‌رسه‌رم و بردمییه‌وه‌ بۆ ژووره‌که‌. ڕۆژی دواتر بردیانمه‌وه‌ بۆ زیندانی قه‌سر، زیندانییه‌کان چاوه‌ڕوانی من بوون، به‌ بینینم خۆشحاڵ بوون.

ماوه‌ی یانزه‌ ڕۆژ بوو له‌ کۆمیته‌وه‌ گه‌ڕابوومه‌وه‌، کات نیوه‌ڕۆ بوو، بانگیان کردم بۆ ژووری پاسه‌وانان. کاتێک چوومه‌ ژووری پاسه‌وانان، سه‌یرم کرد ڕه‌سوڵی له‌وێ دانیشتووه‌ و سه‌روان (شه‌عله‌وه‌ر)ی جێگیری سه‌رۆکی زیندانیش له‌وێ بوو. ڕه‌سوڵی گووتی: به‌ ئۆتۆمبێلی خۆم تۆ ده‌به‌م بۆ کۆمیته‌، له‌وێ ته‌نها چه‌ند دێڕێک بنووسه‌ و هیچی تر، ناتبه‌م بۆ ته‌له‌فزیۆن و نامه‌که‌شت له‌ ڕۆژنامه‌دا بڵاو ناکه‌مه‌وه‌. منیش بۆئه‌وه‌ی به‌ ته‌واویی نائومێدی بکه‌م، گووتم: دڵنیابه‌ هیچ نانووسم.

ڕەسوڵی بە بیستنی ئەو وەڵامەی من بە جۆرێک هارو دەهری بوو کە جێگای باوەڕ نییە، بە زوویی هێنایانمەوە بۆ ناو زیندان، وام هەست کرد کە من دوایین قسەی خۆمم کردووە و جارێکی تر بانگم ناکەنەوە، بــەڵام عەســری هەمــان ڕۆژ لەگەڵ شەســت زیندانیی تــردا بە چاوی بەســتراوەوە بردیانین بۆ کۆمیتە. هەموومانیان بە تەواوی ژوورەکاندا دابەشــکرد، مــن و حاجــی مەهدی عێراقی و عەســکەری ئــەولادی و حەیدەری لە ژوورێکدا بووین، ماوەی دوو شــەو و ڕۆژ بۆ نووســینی پاکانە زیندانییەکانیان دەبرد بۆ ژووری لێکۆڵینەوە، شەوی سێیەم بوو کە ڕەســوڵی هاتە بەر ژوورەکەی ئێمە و من و حاجی مەهدی عێراقی و عەســکەر ئەولادی و حەیدەری بانگ کرد. من لە توڕەییدا دەلەرزییم بە ڕەســوڵیم گووت: بێ هۆ من مەبە، من کەســێک نیم نامە بنووســم و پاکانــە بکــەم، ئەویش بــە توڕەییەوە گووتی: ((ســەیرکە زۆر کەس بڕیاریان داوە نامە بنووســن و ئازاد بکرێن، تۆش وەرە نامە بنووســە و لێرە بڕۆرە دەرەوە)).

گووتم دێم، بەڵام خۆم بە تاوانبار نازانم تاکو پاکانە بکەم.

ڕەســوڵی ئێمەی بردە هۆڵێکی گەورەوە لەوێ نزیکەی (١٢٠) کەس خەریکی نووســینی پاکانە بوون. ڕەســوڵی وا بیری کردبووەوە کە من بە بینینی ئەوانە ورە بەردەدەم و منیش وەک ئەوان پاکانە دەنووســم. دواتر بە هێواشــی هاتە لامــەوە و کاغەزێکی لەبەردەمم دانا. بە بینینی کاغەزەکە توڕە بووم و دڵم کەوتە پەلەپەل و خۆم خستە سەر زەوی. ڕەســوڵی و ســاواکییەکان کە منیان لەو بارەدا بینی، گەڕاندیانمەوە بۆ ژووری زیندان، ئیتر لەوە بەدوا جارێکی تر ڕەسوڵی بەلامدا نەهاتەوە. ســێ ڕۆژ دواتــر نزیکــەی شەســتودوو کــەس لەوانەی کــە نامەیان نووسیبوو، پاکانەیان کردبوو، کە لە زیندانی قەسر و زیندانی ئەوینەوە هێنابوویانــن، هەموویانیــان لــە هۆڵێکــی گــەورە کۆکــردەوە و پێیان گووتن ڕۆژی (١٥)ی ئەســفەند ئازاد دەکرێن. دواتر لەبەردەم کامێرای تەلەفزیــۆن بە دەربڕینی ســوپاس بۆ شاهەنشــا هەموویان ئازادکران.

گەرچـی ئەوان هەموویان بە ئازادبوونیان خۆشــحاڵ بوون، بەڵام من لە هەموویان خۆشــحاڵتر بووم، چونکە توانیبووم لووتی ساواکییەکان بشــکێنم و ویژدانی خۆم ئاســوودە بکەم. ئاســوودە بووم بەوەی کە لــە ســەردەمی کۆمــاری ئازەربایجاندا ئەو بەڵێنەی بــە خەڵکیم دابوو، توانیبووم بەڵێنەکەم بەرمە ســەر و خیانەت لە گەل و نیشــتمان نەکەم، دواتر بــە کەلەپچەکراویی بردیانم بۆ زیندانی ئەوین، کاتێک هاوڕێکانم منیان بینی؛ هاتن بۆ پێشوازییم و لەئامێزیان گرتم.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشــیان: لــەو ماوەیەدا هیــچ ئاگاداری کەسوکارت بوویت؟**

**سەفەرخان:** ماوەیەک بوو مەهینی کچم هیچ ئاگاییەکی لە من نەبوو، بــە ناچاریی بــە دوامدا گەڕابــوو، ڕووی لە هەر شــوێنێک کردبوو بە سوکایەتییەوە وەڵامیان دابووەوە. لەو ڕۆژانەدا خەبات و تێکۆشان بۆ ئازادکردنی زیندانییانی سیاسی؛ چ لە ناوخۆی زیندان و چ لە دەرەوەی زیندان دەســتی پێکردبــوو، ڕۆژنامە نهێنی و بڵاوکــراوەکان بەردەوام بــوون لــە بڵاوکردنــەوەی هەواڵی زیندانییــان، بڵاوکــراوەی (ئارمان) لــە یەکەم ژمارەی خۆیــدا وێنەیەکی منی چاپکردبــوو لەژێر وێنەکەدا نووسیبووی (٣٠) ساڵ پایەداریی سەفەرخان لە زیندانەکانی شادا.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: هەر لەو کاتەدا بوو کە خاچی سور هاتنە ناو زیندان؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، ساڵی (١٣٥٦/ ١٩٧٧) لە زینداندا وا بڵاوبووەوە کە نوێنەرانی خاچی ســوری جیهانی و ڕێکخراوی لێبووردنی نێودەوڵەتی ســەردانی زیندانەکانــی ئێران دەکــەن، لە کۆتایی ســاڵی (١٣٥٦)، واتە نزیکی جەژنی نەورۆز، ڕەوشــی ناو زیندان باشتر بوو، هەڵسوکەوتی کارمەندانی ناو زیندان گۆڕابوو، نامەنووســین سانسۆری لەسەر نەما، مــن بە نووســینی نامەیەک بــۆ کچەکەم ئەوم لــە نیگەرانی ڕزگارکرد.

(مەنوچەهـــری) یەکێک بوو لە ســـاواکییە جەلـــلاد و بێبەزەییەکان، لەو ڕۆژانەدا زیاتر لە ساواکییەکانی تر هەوڵی فریودانی زیندانییەکانی دەدا.
مەنوچەهری ڕۆژانە ســـەردانی زیندانی دەکرد، ڕۆژێک عەزیز یوسفی داوای لێکرد کە من بگوازرێمەوە بۆ زیندانی قەسر تاکو لەوێ چارەسەری گوێـم بۆ بکەن. مەنوچەهـــری لە وەڵامدا گووتبـــووی نایێنێرم بۆ زیندانی قەسر، بەڵکو دەینێرم بۆ نەخۆشخانەی ژمارە یەکی سوپا. گوێم ئازارێکی زۆری هەبـــوو، بـــە زوویی بەڕێیان کردم بۆ نەخۆشـــخانەی ژمارە یەکی ســـوپا، پێم ســـەیر بوو کە چۆن ســـاواک وا بە زوویی وەڵامی داواکاریی هاوڕێکەمی دایەوە، دواتر دەرکەوت کە ئەو ئامانجێکی تری هەبوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئامانجی چی هەبوو؟**

**ســـەفەرخان:** ئەوان دەیانویســـت نوێنەرانی خاچی سوری جیهانی چاویان بە من نەکەوێت، بۆیە نەک تەنها ناردیانم بۆ لای دکتۆری گوێ، بەڵکو بۆ لای دکتۆری دەروونییشـــیان ناردم، کـــە دکتۆرێک بوو پلەی ســـەرتیپی هەبوو، ئەوانە دکتۆری ئەڵقـــە لەگوێ و کرێگرتە و نۆکەری ســـاواک بوون، بۆ گەیشـــتن بە پلە و ســـامانی زۆر ببوونە داردەستی ســـاواک، تەنانـــەت ئەگەر پێویســـتی بکردایە هاوکاریـــی جەللادەکانیان دەکـــرد بـــۆ ئەشـــکەنجەدانی زیندانییان. ئـــەو دکتۆرە لەســـەر بڕیاری ســـاواک بە ناونیشانی بوونی نەخۆشیی دەروونی ماوەیەکی زۆر منی لە نەخۆشخانە هێشتەوە، لە یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەم لەگەڵ دکتۆردا لێی پرسیم: بۆچی بەیانی کاتێک چاییان بۆ هێنایت نەتخواردەوە.
من نان و چای بەیانیم خواردبوو، لە قســـە بێبنەماکانی ئەم دکتۆرە نۆکـــەرەی ڕژێـــم ســـەرم ســـوڕمابوو و کەوتبوومە گومانـــەوە، دواتر تێگەیشـــتم کە ســـاواک بۆئـــەوەی نوێنەرانـــی خاچی ســـوری جیهانی ئـــاگاداری ژیانـــم من نەبن لە زینداندا، بۆیە هەروەکو ســـەدان زیندانیی تری سیاسی دووریانخستبوومەوە.

**عەلی ئەشـــرەف دەروێشـــیان: لەکاتێکدا ســـاواک دەیزانی کە عەزیز یوسفی خۆشی بە سەختی نەخۆشە؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، دەیانزانی، زۆر باش دەیانزانی، ئەو گورچیلەکانی خـراپ ببوون، فشـاری خوێنی هەبوو، تەنگەنەفـەس بوو، ئازاری دڵی هەبوو، ئەو کاتە ماوەی (٢٥) ساڵ بوو لە زینداندا بوو، ماوەی دە ساڵ بوو دوورخرابووەوە بۆ زیندانی بەرازجان، تەواوی تەمەنی لاویی خۆی لە زینداندا بەسەربردبوو، ئەویشیان دوو جار بردبوو بۆ نامەنووسین و پاکانە، ئەویش بە توندیی ڕووبەڕووی ساواک وەستابووەوە. تەنانەت جەللادێکی وەک ســەرهەنگ زەمانی کە سەرۆکی زیندان بوو، حسابی بۆ دەکرد، ئەو هەمیشــە کتێبی باشــی لابوو، پۆلیســەکانیش جورئەتی ئەوەیــان نەدەکرد بچنە جێگاکەی عەزیز یوســفی کــە پڕبوو لە کتێب. ناچـار بـوون هەرچۆنێک بێت ئەو ئـازاد بکەن. واتـا بۆئەوەی خاچی سوری جیهانی ئەو نەبینێت، ئازادیان کرد، لە کاتی ئازادکردنیدا ڕەزای شــەڵتوکی لەگەڵ خۆیدا برد و ڕۆیشــت بۆ نووســینگەی ســەرهەنگ زەمانــی. لــەوێ بە بێمنەتی لــە بەردەمیدا دەوەســتێت و دەڵێت: ئاغای ســەرهەنگ من نامــەم نەنووســیوە و پاکانەم نەکـردووە، بەڵام تۆ و ســاواک ناچــارن من ئازاد بکەن. ڕەزای شــەڵتوکی کــە گەڕایەوە ئەم قسانەی بۆ ئێمە گێڕایەوە.

**عەلی ئەشـــرەف دەروێشیان: لەبارەی عەزیز یوسفییەوە، هیچ شتێکی ترت لەیاد نییە؟**

**ســـەفەرخان:** عەزیــز یوســفی دووجــار هاتووەتە زیندان، ســاڵی (١٩٤٨ /١٩٢٧) کــە ئەویان هێنایە زینـدان بەهۆی بڵاوکردنەوەی چەند بڵاوکراوەیەکــەوە بوو، ئەو کات ئەو کوڕێکی لاو بوو، هێشــتا ڕیشــی نەهاتبوو، من بۆ یەکەمجار لە زیندانی تەبریز ئەوم بینی، جاری دووەم دوای دوو ســێ ســاڵ لە ئازادبوونی دووبارە لەگــەڵ چەند کوردێکی تــردا دەســتگیر دەکرێتەوە. عەزیز یوســفی و جەلیـل گادانی و غەنی

بلوریـان لەگەڵ نزیکەی (٢٠٠- ٣٠٠) کەسـی تر هەمووومان لە زیندانی ئورومیە بەیەکەوە بووین، دواتـر هەمووومان بەیەکەوە دوورخراینەوە بۆ زیندانی بەرازجان. عەزیز یوسـفی و غەنی بلوریان بە لەسێدارەدان حوکمدرابـوون، بەڵام لـە دەرەوە کـوردەکان بۆیان تێکۆشـابوون و حوکمەکەیان بۆ کرا بە هەتاهەتایی، لە هەموویان چالاکتر جەلیلی گادانی بوو، بیسـتم کە گەڕاوەتـەوە بۆ ناو حیزبی دیموکراتی کوردسـتان[1]، ئاخـر ئەو لە سـەرەتادا کۆمەڵە بـوو لە یەکتری جیاببوونـەوە، دواتر بیسـتم گەڕاوەتەوە بـۆ شـــوێنی یەکەمی. ڕۆژێک ڕادیـۆی (بی بی سـی)م کردبووەوە و گوێم لێدەگرت، لە لەندەن چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا دەکرد، پێشکەشـکارەکە پرسـیاری لێکرد: ئێوە بۆچـی جیابوونەتەوە، جەلیل گادانی لە وەڵامدا گووتی: ئێمە شۆڕشگێڕین و ئەوان سـازشکار، پێشکەشـکارەکە گووتی: ئەگەر تۆ شۆڕشـگێڕیت، لێـرە چی دەکەیت؟ شوێنی شۆڕشگێڕەکان شاخەکانە.

ئـەوان چەند کەسـێکیان لێکوژرا وەکو قاسـملو و شـەرەفکەندی، دواتر گوێبیستی چاوپێکەوتنی عەبدوڵلای حەسەنزادە بووم کە جێگری شەرەفکەندی بوو، لە ئەویشیان پرسی بۆچی لە یەکتری جیابوونەتەوە، ئـەو گووتی: لە یەکتری جیا نەبووینەتەوە، ئێمە بووینەتە دوو دەسـتە و هەریەکەمان بە ناوێک کار دەکەین. قسـەکانی ئەو زۆر جوان بوون، بەڵـێ ئەو گووتـی: ئێمە بەیەکەوەیـن، ئەوان بە نـاوی کۆمەڵە و ئێمە بـە نـاوی دیموکرات. لەکاتێکـدا کە ئەوهاش نەبوو، ئـەوان لە یەکتری جودا ببوونەوە، قاسـملوی بێ چارە کەسـێکی زۆر زانا بوو، ئەو زاناو مرۆڤدۆست بوو، من چەند جارێک لە مهاباد ئەوم بینیوە، شەرەفکەندیش کەسێکی خوێندەوار و هەڵکەوتوو بوو.

١جەلیلـی گادانـی، هەرگیز کۆمەڵـە نەبووە، ئەو ماوەیەک لە حزبـی دیموکرات جیا بووەوە، دواتر تێکەڵ بوونەوە. (وەرگێڕ)

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: هەڵسوکەوتی عەزیز یوسفی لەگەڵ زیندانییەکانی تر چۆن بوو؟**

**سەفەرخان:** عەزیز یوسفی ئەگەرچی کەسێکی زۆر تووند بوو، بەڵام بیروباوەڕێکی پتەوی هەبوو. لەگەڵ کەسانی تریشدا ڕەفتارێکی هێمنانەی هەبوو، لە بەندی شەشی زیندانی قەسر لەگەڵ حاجی ئەنواری لە یەک ژووردا بوون، ئەوان هەمیشە قسەی خۆش و شۆخییان بەیەکەوە دەکرد. ڕۆژێک کە هەمووان بەیەکەوە خەریکی خوێندنەوە بوون، ئاغای ئەنواری لەسەر کتێبەکە سەری بەرزکردەوە و ڕوویکردە عەزیز یوسفی و گووتی: عەزیز یوسفی ئێوە کەی کۆمەڵگای کۆمۆنیستی لە ئێران دادەمەزرێنن، تاکو ئێمە هەرکاتێک ویستمان بەلوعەی ئاوی ماڵەکەمان بکەینەوە لەجیاتی ئاو شیر و شەربەتی پێدا بێت و بیخۆینەوە. عەزیز یوسفی بە هێواشی سەری لەسەر کتێبەکە بەرزکردەوە و گووتی: حاجی گیان هەرکاتێک حۆرییەکانی ئێوە ئامادەکران.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: دوای مانگرتنتان لە خواردن، لە نەخۆشخانەی سوپا چی ڕوویدا؟**

**سەفەرخان:** دوای مانگرتنمان لە خواردن، ساواک ناچار بوو، دووبارە من بگەڕێنێتەوە بۆ زیندانی ئەوین.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: نوێنەرانی خاچی سوری جیهانی بە بینینی ئێوە چییان گووت؟**

**سەفەرخان:** چەند ڕۆژێک بەسەر هاتنەوەی من بۆ زیندانی ئەوین تێپەڕیبوو، نوێنەرانی خاچی سوری جیهانی هاتن بۆ زیندان، دوای کۆکردنەوەی زیندانییان لە یەک شوێن، تەواوی کارمەندانی زیندانیان کردە دەرەوە. ئەبوتورابی باقرزادە و ڕەفیق بوونە وەرگێڕی من و زیندانییەکان. ڕوویان کردە من و گووتیان: خۆت بناسێنە. منیش گووتم: من سەفەری قارەمانیم و پەیوەندییم بە تیپی دیموکراتی ئازەربایجانەوە

هەبووە. زیاتر لە (٣٠) بەهاری تەمەنی خۆمم لە خراپترین زیندانەکانی شادا بەسەر بردووە، ئەو شایەی کە خۆی بە میراتگری شارستانییەتی کۆنی ئێران و کۆڕشی مەزن ناساندووە.

بــە ناباوەڕییەوە دووبارە پرســیاری کردەوە: ئایــا دەکرێت پێمان بڵێیت لەم ماوەیەدا چەندجار زیندانیی کراویت؟ منیش بەمجۆرە وەڵامم دایەوە، من لەدوای هێرشــی شــا بۆ ســەر ئازەربایجان و تێکشــکانی هێزەکەمان لە ســاڵی (١٣٢٥) ماوەیەک خۆم شــاردەوە، لە ســەرەتای ساڵی (١٣٢٧) کاتێک شا حکومەتی سەربازیی ڕاگەیاند، دەستگیر کرام، لــەو ڕێکەوتــەوە زیاتــر لە تەمەنی کەســێکی تەمــەن مامناوەند من لە زینداندام.

نوێنەرانــی خاچی ســوری جیهانــی ژیاننامە و بەســەرهاتی منیان یاداشــت کــرد و لەگــەڵ خۆیانــدا بردیــان. خاچی ســوری جیهانی لە ســەردانەکانی تریانــدا کەم و زۆر ئــاگاداری ژیاننامــەی من بوون و لەبارەی منەوە ڕاپۆرتی خۆیان نووســیبوو، تەنانەت ســەرۆکی خاچی ســوری جیهانی سەردانی شای کردبوو، داوای ئازادکردنی منی لە شا کردبوو، بەڵام شــا زۆر بێشــەرمانە گووتبووی: ئــەوە گونجاو نییە و ئازاد ناکرێت. لە ســەردانێکی تریاندا بۆ زیندان، خاچی سوری جیهانی ئەو نامەیەیان نیشــاندام کە بۆ ئازادبوونی من دابوویانە شــا. گووتیان تــۆ ماوەی ســی ســاڵە لــە زینداندایت، ئێمــە هیوات بــۆ دەخوازین بە زووترین کات ئازاد بکرێیت، نوێنەرانی خاچی سور گووتیان، بەڵام شا گووتوویەتی ئازادکردنی ســەفەرخان گونجاو نییــە و داواکەی ئێمەی ڕەتکردووەتەوە، لە هاوینی (١٣٥٧) دووبارە گواســتیانمەوە بۆ زیندانی قەسر.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشــیان: یەکەمین خۆپیشــاندانی ســەر شەقامەکان، چ کاریگەرییەکی لەسەر دەروونی تۆ هەبوو؟**

**ســەفەرخان:** ئەو حەفتا کەســەی کە ڕۆیشــتن پاکانەیان نووسی

و سوپاسـی شـایان کرد، دیاربوو ساواک دەیانویسـت چەند کەسێک ئـازاد بکەن، ڕۆژانـە دەیانبردن و دەیانهێنانـەوە، دەیانبردنە کۆمیتە و دەیانهێنانەوە، ڕەوشەکە لە گۆڕانکارییدا بوو، لە کۆمیتە و لە ژوورەکاندا کە پێشـتر هیچ ڕاخەرێکیان تێدا نەبوو، کۆمباریان هێنا و ڕامانخسـت، قاپ و کەوچک و پەرداخیان پێداین، سـابوونیان لە شـوێنی دەستشۆر دانا، ئەشکەنجەدان نەمابوو، هەفتەی دوو جار میوەیان پێدەداین، خەیار و شـووتییان بۆ دەهێناین، سـەردانیکردن زۆر بوو، خوشک و دایک و بـرا لە لای زیندانییەکانەوە دادەنیشـتن، واتە ئەو کاتەی کە دەهاتن بۆ سـەردانی کەسـە زیندانیکراوەکەیان، وەک نارەزایی لەسەر زەوییەکە دادەنیشـتن و دواتر هەڵدەسـتان و دەڕۆیشـتن لە بـەردەرگای دادگا دادەنیشـتن و مانیـان دەگرت، ئەوان هەڵگیرسـێنەری شـۆڕش بوون. دایکی عەزیزی سـەرمەدی و دایکی سـەلامەتی ڕەنجبەر و هاوسەری موهەندیـس پەروێـزی زۆر چـالاک بـوون، خەڵکیـان کۆدەکردەوە و دەچوون لەبەردەرگای دادگا مانیان دەگرت.

**عەلی ئەشرەف دەرویێشـیان: ڕۆژی (۱۷)ی شەهریوەری (۱۳۵۷) ئێمە لە زیندانی ئەوین بووین، بۆ پاڵپشتی ئەو خەڵکە بێتاوانەی کە بە دەسـتی بەکرێگیراوانی ڕژێم شـەهید کران، مانگرتنمان لە خواردن ڕاگەیاند. ئێوە کە لە زیندانی قەسـر بوون، ڕەوشی ئەویَ چۆن بوو؟**

**سـەفەرخان:** لەو ڕۆژەدا لە تـاران و یانزە شـاری تر حکومەتی سەربازیی ڕاگەیەنرا، کرێکارە ئازاکانی پاڵاوگەی نەوتی تاران مانگرتنی سەرتاسـەرییان ڕاگەیاند، ئەمە یەکەمین مانگرتنی سەرتاسەریی ئێران بـوو. بە بۆنـەی کوشـتارە بێڕەحمەکـەی (۱۷)ی شـەهریوەر ئێمەی زیندانییانی زیندانی ژمارە یەکی قەسر، کە پێکهاتبووین لە هەشت بەند، لـە ڕۆژی (۱۸)ی شـەهریوەر مانگرتنی خۆمان بـە هاوکاریی تەواوی زیندانییـان ڕاگەیانـد، مانگرتنەکـە بەهـۆی کوشـتاری مەیدانی ژاڵەی

قارەمانــەوە بوو، دواتر لیژنەیەک هاتــن و داوایان لێکردین مانگرتنەکە بشــکێنین، بەڵام ســەرکەوتوو نەبوون و ئێمە مانگرتنەکەمان بەردەوام بــوو. زیندانییــەکان هێزیــان لەبــەر بڕابــوو، هەمــوو لــە ژوورەکاندا کەوتبــوون، بنەماڵەی زیندانییانی سیاســی مانگرتنەکانیان لە فەرمانگە و دامەزراوە حکومییەکان و دادگاکاندا درێژە پێدا و داوای ئازادکردنی زیندانییانی سیاسییان دەکرد. ڕژێمی شا پێشبینی لەناوچوونی حەتمیی خۆی کردبوو، دەستیان کرد بە ڕشتنی گازی فرمێسکڕێژ و تەقەکردن لــە خەڵکانــی خۆپیشــاندەر و هەوڵیــان دەدا بــە هــەر ڕێگەیــەک بێت بڵاوەیان پێ بکەن، بەڵام ڕەوشــی شــۆڕش لە وڵاتدا لە ســەرکەوتندا بــوو. ئیتر نە ســتەمکاران دەیانتوانی بە ناوی یاســاوە خوێنی خەڵکی بکەنە شووشەوە، نە جەماوەریش ئامادە بوون چیدی گرفتاری زوڵـم و ستەمی ڕژێمی شا بن. میللـەت باوەڕی تەواویان بە لەناوچوونی ڕژێم هەبوو، بۆیە لە گیانبازیی و فیداکاریی درێغییان نەدەکرد و دروشــمی (زیندانییانی سیاســی دەبێت ئازاد بکرێن)یان هەڵگرتبوو. سەدان کەس بەهۆی نووسینی ئەم دروشمە لەسەر دیوارەکانی شارەکان بەر گوللە کەوتن و شــــەهیدکران.

**عەلی ئەشـــرەف دەروێشـــیان: بنەماڵەی زیندانییانی سیاسی چییان کرد؟**

**ســـەفەرخان:** لە مانگی مهـری ســاڵی (١٣٥٧) (١٩٧٨/١٢) تەواوی بنەماڵەی زیندانییانی سیاســـی، بەتایبەت زیندانییانی تاران و تەبریز بە خۆپیشـاندان و چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕۆژنامەکاندا هێرشـێکی توندیان دژی ڕژێمی شاهەنشا دەست پێکرد.

هــەر لەو ڕۆژانــەدا مەهینــی کچم لەگــەڵ ڕۆژنامــەی (ئایندەگان) کــە نووســەرانی ئــەو ڕۆژنامەیــە لــە ڕێــگای شۆڕشــەوە هاتبوون، چاوپێکەوتنێکــی ئەنجـام دابوو، لــە چاوپێکەوتنەکــەدا گووتبووی: من حەوت مانگ لەدوای دەســتگیرکردنی باوکم لەدایک بووم، هەتا باپیرم مابــوو ئەو چاودێریــی دەکردین و بەخێوی دەکردیــن. دایکم زۆرجار باســی خەبات و تێکۆشانی باوکمی بۆ دەکردم، بەڵام هێشتا من باوکی خۆمــم نەبینیبــوو، کاتێک مــن تەمەنم بوو بە پانزە ســاڵ دایکم کۆچی دوایی کرد، من لە تەمەنی (١٩) ســاڵیدا هاوسەرگیریم کردووە، ڕەنگە پێتان ســـەیر بێت کە من تا ئەو کاتەش هێشـــتا باوکی خۆمم نەبینیبوو، هۆیەکەش ئەوە بوو لەدوای تەمەنی پێنج ساڵی منەوە باوکم لە زیندانی ئورمیەوە دوورخرایەوە بۆ زیندانی بەرازجان. دوای هاوســـەرگیریم، هاوســـەرەکەم بۆ سەردانی باوکم بردمی بۆ زیندانی بەرازجان، تا ئەو کاتەش نەمدەزانی باوکم شێوەی چۆنە، تەنها ئەوەی لەبارەی باوکمەوە باســیان دەکرد، ڕووخســاری دەهاتە بەرچاوم. هاوسەرەکەشم تا ئەو کاتــە باوکمی نەبینیبوو، کاتێک چووم بۆ ســـەردانیکردنی باوکم و ئەو هاتە لامان؛ ئینجا هەســـتم کرد ئەوە باوکمە. ئەو ماوەی چواردە ســـاڵ بوو هیچ کەسێک سەردانی نەکردبوو، بەتایبەت ئەو کاتانەی لە زیندانی

بەرازجـان بـوو. بە باوكمم گووت: من كچی تۆم، هاوسەرەكەشـم پێ ناسـاند، ئینجـا باوەشـمان بە یەكتریدا كـرد و دامانە قولْپـەی گریان. بەهۆی ئێمەوە هەموو ئەو زیندانییانەی لەوێ بوون دەسـتیان كرد بە گریـان. باوكم كەسـێكی بەهێز و ورەبەرز بوو، لە تـەواوی ئەو ماوە درێژەی زیندان هەستی بە بێهێزیی خۆی نەكردووە.

ڕۆژی سێی مانگی ئابان، ڕۆژی سەردانیكردنی زیندانییانی سیاسی بوو، كەسوكاری زیندانییان بە بیستنی هەواڵی ئازادبوونی زیندانییان لە هەموو لایەكی ئێرانەوە بەرەو تاران هاتبوون، ناوی من لە لیسـتی ئەو زیندانییانـەی كە ئازاد دەكران، بوونی نەبوو. كەسـوكاری زیندانییانی سیاسـی كە زانیبوویـان ناوی من لە لیسـتی زیندانییانـی ئازادبووندا نییـە، هەموویان دڵخۆشـیی كچەكەمیـان دابووەوە، ئـەو ڕۆژە كاتێک سەردانیكردن كۆتاییهات، لێپرسراوانی زیندان بە كەسوكاری زیندانییان گووتبوو سبەی چواری ئابان ژمارەیەكی تر لە زیندانییان ئازاد دەكرێن، ئەم فیلّەی پۆلیس بۆ ئەوە بوو كە كۆبوونەوەی كەسوكاری زیندانییان لـەو نـاوە نەهێڵن، نەوەكا كێشـە دروسـت بێـت و پەلامـاری زیندان بدەن. كەسـوكاری زیندانییان نەیاندەزانی ژمارەی زیندانییانی سیاسی چەندە. كاتژمێر (٩)ی شـەو دووبارە لە بڵندگۆی زیندانەوە ناوی چەند زیندانییەكی تر خوێندرایەوە و داوایان لێكرا كەلوپەلەكانیان كۆبكەنەوە و بـەرەو دەرگای دەرەوە بـڕۆن. لـەو كاتـەدا چەنـد كاتژمێرێک بوو سـەردانیكردن كۆتایی هاتبوو، بە ئومێـدی ئازادبوونی زیندانییەكانیان خەڵک گەڕابوونەوە بۆ ماڵەكانیان. لەو ڕۆژانەدا لەناو زیندان دەربڕینی خۆشی و شادیی بوو. ئێمە ئەو زیندانییانەی كە ئازاد دەكران، بەڕێمان دەكـردن و ئەمـلاولای یەكتریمان ماچ دەكرد. ئـەم ئازادكردنەی چەند كەسـی دوایی لە كاتژمێر دەی شـەو كۆتایی هات. من زۆر ماندوو و شـەكەت بـووم، ددانم ئـازاری زۆری هەبوو، ڕۆیشـتم بۆ لای دكتۆر ئیسـماعیلی عالیخانی، كە ئەویش هێشـتا ئازاد نەكرابوو، ئەو دكتۆری ددانی ناو زیندان بوو. گووتم: دكتۆر ددانم ئازاری زۆرە. دكتۆر پێكەنی

و گووتی: دەرمانێکی باشم بۆ تۆ هەیە، هەندێک ئیسپرتۆی سپی کردە ددانەکەمـــەوە. من وام هەســـت دەکرد کچەکەم هاتبێت بۆ ســـەردانیم، لەبەر خۆمەوە دەمگووت من ئازاد ناکرێم.

دووبارە بڵندگۆ دەستی کردەوە بە ناوخوێندنەوە، من شـــەکەت و ماندوو دانیشـــتبووم، بەهرۆزی حەقی بە خێرایی هاتە لامەوە و بڵندی کـــردم و گووتی: هەڵســـە، گووتم: بۆ کوێ؟ گووتـــی ناوت خوێنرایەوە. گووتـــم: وازبهێنە ئەوە بڵندگۆیە و وا منیش لێرە دانیشـــتووم، گوێم لێ نەبـــووە ناوم بخوێنرێتەوە. گووتی: هەڵســـە ناوت خوێنرایەوە. بەهرۆز پێش خۆی دام و گووتی برۆ، من باوەڕم نەدەکرد، زۆر پەســـت بووم، بە بەهرۆزم گووت وازم لێبێنە، ئێســـتا کاتی شۆخیکردن نییە. بەهرۆز گووتی: ســـەفەرخان بەخودا شـــۆخی ناکەم بەڕاســـتیمە. ســـەیرم کرد چەنـــد هاوڕێیەکـــی تر بـــەرەو لای من هاتـــن، ئیتر بە ڕێـــزەوە بردیانم قاتێـــک چاکەت و پانتۆڵی جوانیـــان لەبەر کردم و بەڕێیان کردم بەرەو حەوشەکە.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەو چاکەت و پانتۆڵە بە ئەندازەی خۆت بوو؟**

**ســـەفەرخان:** هەمبوو، هاوڕێیەکم هەبوو، لـــە کارگەی بەرگدرووی زینـــدان کاری بەرگدروویـــی دەکـــرد، تـــەواوی جلوبەرگـــی پۆلیـــس و شـــارەوانییەکان ئـــەو دەیدوورین، ئەو زیندانـــی هەتاهەتایی بوو، بەڵام کەســـێکی چەپ بوو، منی زۆر خۆشدەویســـت و هـــەر ئەو جلوبەرگی بـــۆ دەدووریـــم، چونکە ئەو جلوبەرگەی لە زیندان پێیان دەداین، بۆ من نەدەبوون، هەندێک لە زیندانییەکان چەند قات جلیان دەدڕاند، بۆئەوەی دووبـــارە بدوورێتـــەوە و قاتێکی بۆ من لێ دروســـت بکـــەن، بەڵام ئەو بەرگـــدرووەی هاوڕێـــم کاتێک خۆپیشـــاندان دەســـتی پێکرد و باســـی ئازادبوونی زیندانییان بڵاوکرایەوە. گووتی: وەرە ئەندازەت بگرم، بەڵکو یـــەک قـــات چاکەت و پانتۆڵت بۆ بدرووم. گووتم: پێویســـت ناکات قاتم

هەیە، ئەویش قاتێکی جوانی بۆ درووم. بەڵێ، چاکەت و پانتۆڵم پۆشی، هەمــوو هاوڕێکانم کە گوێبیســتی خوێندنەوەی ناوی من بوون، بەرەو لام هاتــن و ســروودیان دەخوێنــد و دەیانگووت: بژیت ســەفەرخان- بژیت ســەفەرخان. لــەو کاتەدا هەر زیندانییەک گوێــی لە خوێندنەوەی نــاوی هاوڕێکــەی بووایــە بــە خۆشــییەوە بــەرەو ڕووی دەهات. من هێشــتا باوەڕم بە ئازادبوونــی خۆم نەدەکرد، بۆ دڵنیابوون ســەرێکم لە نووســینگەی زیندان دا، پرســیم ناوی من خوێندراوەتەوە، یەکێک لە کارمەندەکان ناچار بوو دۆسیە و بڕیاری ئازادبوونم نیشان بدات. من گووتم: پێویستە بگەڕێمەوە و خوداحافیزی لە هاوڕێکانم بکەم، سەرەتا پۆلیس ڕێگایان پێ نەدام، بەڵام پێداگرییم کرد و گووتم: ناڕۆمە دەرەوە تــا خوداحافیزیی لە هاوڕێکانم نەکەم. بــە ناچاریی ڕەزامەند بوون، بە هێمنــی چوومەوە ناو هاوڕێکانم و قوڕگم گیرابوو، قســەم بۆ نەدەکرا. هاوڕێکانم هەلهەلەیان دەکێشــا و خۆشــحاڵیی خۆیــان دەردەبڕی، بە هەزار زەحمەت دەنگم بڵند کرد و گووتم: خۆزگە من لەدوای هەمووتان ئازادبکرامایە. ئەو شــەوە زیندانییەکان کە هەریەکە و خەڵکی شوێنێک بوون، لە خۆشییاندا فرمێسک بە چاوانیاندا دەهاتە خوارێ.

دوای ئەوەی خوداحافیزییم لە تەواوی زیندانییان کرد، هاتمە دەرەوە، کارمەندانــی زیندان بردیانم بەرەو لای ئۆتۆمبێلێک کە ژمارەیەکی زۆر زیندانیی ئازادکراوی تێدابوو، دوای ماوەیەک پاســەوانێک دایبەزاندم و بردمی بۆ ژووری سەرتیپ موحەڕەڕی. کە سەیرم کرد دکتۆر سەحابی و کوڕەکەی موهەندیس سەحابی لەوێ بوون، یەکراست چووم بۆ لای ئەوان و یەکتریمان لەباوەش گرت. دکتۆر سەحابی گووتی: گوێم لێبوو کە ناوت خوێنرایەوە، بۆیە لێرە مامەوە تاکو لەگەڵ خۆمان تۆش بەرین بــۆ ماڵی خۆمان، دەزانم تۆ لە تاران شــارەزا نیت. منیش تکام لێکردن کە بمگەیەننە ماڵی کچەکەم.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: سـەفەرخان لە ڕێگا بیرت لە چی دەکردەوە؟**

**سـەفەرخان:** بە بینینـی دکتۆر سـەحابی و موهەندیس سـەحابی خۆشـحاڵ بـووم، دەمزانـی ئـەوان بۆچـی چاوەڕوانی مـن دەکەن و دەیانەوێت لەگەڵیاندا بڕۆمەوە بۆ ماڵەوە، ئەوان دەیانویسـت ئابڕووی ڕژێـم ببەن و بڵێن ئێمـە ڕێزی تەواومان لە زیندانییانی ئازا و قارەمان گرتووە ئەگەر سەر بە هەر لایەنێک بن، بەتایبەت کە خۆشیان ئازار و ئەشکەنجەی زیندانیان چەشتبوو.

دەنگی خۆپیشاندان لە هەموو لایەکەوە بەرز ببووەوە، من لە ماوەی سـیودوو سـاڵدا لە دەرگای هیچ ماڵێکـم نەدابـوو، نەچووبوومە هیچ ماڵێکەوە، بە خۆشـی خۆم سـواری ئۆتۆمبێل نەببووم و هیچ منداڵێکم ماچ نەکردبوو، جگە لە ژوورە تاریکەکانی زیندان، هیچ شـوێنێکی ترم نەبینیبوو. ئەو هاوڕێیانەی لەسێدارە درابوون و ئەوانەی کە ئەشکەنجە درابوون، لەبەر چاوم بوون، ئەوەم دەهاتەوە یاد کە چۆن ئەفسەرێکی پلەبـەرز لـە زیندانـی تەبریز میرزا باقـر حاجـی زادەی هونەرمەندی شـانۆکاری دابووە بەر شـەق و پێلەقە، ئەو داماوەش هاواری دەکرد. ئەو ئەفسەرە هەڕەشەی لێدەکرد و دەیگووت: بەردێکت پێوە دەبەستم بە فڕۆکەی سەربازییەوە دەتبەستمەوە و فڕۆکەکە هەڵدەفڕێنم، چونکە تۆ کەسـێکی خائین و وڵاتفرۆشیت، بەڵام ئەو کەسێکی نیشتمانپەروەر بـوو، بەکرێگیراوانـی ڕژێم بە نیشـتمانفرۆش و خائین و تیرۆریسـت ناویان دەبرد. لەیادمە ڕۆژێک ئەو ئەفسەرە پلەبەرزە گووتی: سەرۆکی بەشـی سیاسـی ئاگادار بکەنەوە کـە لێکۆڵینەوەیەکـی ورد لەگەڵ ئەم خۆفرۆش و وڵاتفرۆشەدا بکات. میرزا باقری حاجی زادە لە بەرامبەری وەسـتایەوە و گووتی: من هیـچ پارەیەکم نییە، قابلەمەی ماڵەکەمم برد تاکو بیفرۆشم، چونکە کەفیلیان لێم دەویست، بەڵام کەس ئامادە نەبوو لێـم بکڕێت، ئێسـتا من چۆن دەتوانم ئەم نیشـتمانە بـەم گەورەییەوە بفرۆشـم. سـاواکییەکان ئەگـەر کەسـێکیان دەسـتگیربکردایە و هیچ

بەڵگەیەکـی تاوانباربوونی پـێ نەگیرایە، ئەوا عەینــەک و فڵچەی ددان شــۆرین و پێنووســەکەیان لێوەردەگرت و بە تاوانی ڕۆشنبیر و دژی ڕژێــم دەیانکــرد بە دۆسـیەکەیەوە و تاکو بڵێن لەســەر ئــەم بنەمایە دەستگیرکراوە.

تەواوی لاوانی خەباتگێڕ و تیکۆشــەری وەکو ئەسکەندەری سادقی نــەژاد، ئەمیر پەروێــزی پویان، ئەحمــەد زادەگان، بەهرۆزی دەهقانی، عەلــی ڕەزای نابەدل، مەنافــی فەلەکی زەهتاب، مەشــعوفی کلانتەری، بێژەنــی جەزەنــی و هاوڕێکانی، دکتۆر فاطمی، ســەعید ســوڵتان پور، خەســرەوی گوڵسورخی، ســەعید موحســین و هاوڕێکانی، هۆشەنگی ئەنوشــە و هەزاران هەزار ناوی تر دەهاتنەوە بەر چاوم. میرزا باقری حاجــی زادەش کــە هونەرمەندێکی گــەورە بوو، لە تەمەنــی پیرییدا لە گۆشەیەکی شەقامی شاری تەبریز لە سەرماندا ڕەقبووەوە و مرد، ئایا ئەو کەسێکی نیشتمانفرۆش بوو؟

بەڵێ، لەو کاتەوە کە تووشی دکتۆر سەحابی و موهەندیس سەحابی بووم و کەوتمە ڕێ بەرەو ماڵی کچەکەم، ئەو ڕووداوانە هەروەکو فیلم دەهاتنە پێش چاوم.

**عەلی ئەبشــرەف دەروێشــیان: چۆن چوویتە ماڵیان، کچەکەت کاردانەوەی چی بوو؟**

**ســەفەرخان:** دکتۆر ســەحابی کەســێکی دنیادیدە بوو، ئەو هەوڵی دا هەواڵەکــە بــە جۆرێــک بە کچەکــەم بڵێت کە تووشــی بوورانەوە و دڵەڕاوکــێ نەبێت. کە گەیشــتینە بــەر دەرگای ماڵیان، دکتۆر دابەزی و زۆر بــە هێمنی لە زەنگــی دەرگای دا، کچەکەم چەند ڕۆژێک لەوەوبەر چاوپێکەوتنێکــی لەگــەڵ ڕۆژنامەی (ئایـنـدەگان) ئەنجــام دابوو، وەک هەرکەســێکی خەباتگێڕ خۆی و هاوســەرەکەی (موحســینی عەباسی) چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد پۆلیس بێن و دەستبەستیان بکەن، کچەکەم هاتە دەرەوە و دەرگاکەی کردەوە و سڵاوی کرد.

دکتۆر سەحابی پرسیاری لێکرد: تۆ کچی سەفەرخان نیت؟

مەهین: بەڵێ! بفەرموون، چیتان دەوێت؟

دکتۆر سەحابی: هەواڵت نییە ئەو کەی ئازاد دەکرێت؟

مەهین: نەخێر هەواڵم نییە، ئەمڕۆ ڕۆیشـتم بۆ سـەردانی، ناوی لە لیسـتی ئازادبوونـدا نەبوو، باوکی بێچارەم دەبێت تـا کەی لە زینداندا بێت؟

دکتۆر سەحابی: کچم نائومێد مەبە ئینشائەڵڵا ئازاد دەبێت.

مەهین: (ئاخێکی هەڵکێشا) لەوانەیە تەمەن دەرفەت نەدات باوکم بێتە ماڵی ئێمە.

دکتـۆر سـەحابی: ئەگەر تۆ دەعوەتێکمان بـۆ بکەیت، من هەواڵێکی خۆشت پێدەدەم.

مەهیـن: من خـۆم و منداڵەکانم دەکەم بەقوربانـی باوکم، دەعوەت چییە؟ دەترسم بەم کاتی نیوەشەوە شتێکی لێ بەسەرهاتبێت.

دکتـۆر سـەحابی: نـا کچی خـۆم، باوکت هیـچ کێشـەیەکی نییە و سـەلامەتە، هەموو شـتێک لەباشـیدایە، باوکتم هێنـاوە، فەرموو ئەوە سەفەرخانە و ئەوەش ئێمە.

مەهیـن هەروەکو ئافرەتێکی شـێت بەخێرایی هاتە دەرەوە و چاوی بە من کەوت، من لەسـەر پێشنیاری دکتۆر سـەحابی چەند هەنگاوێک لەولاتـر خـۆم دابـووە پاڵ دیوارەکە و سـەیری ئەوانـم دەکرد، بەڵام ئەم سـەیرکردنە وەک سەیرکردنی پشتی شیشـە ئاسنینەکانی زیندان نەبوو. بەرەو ڕووم هات و باوەشمان بۆ یەکتری کردەوە و یەکتریمان لەئامێز گرت. فرمێسـکم بە چاواندا دەهاتە خوارەوە، موهەندیسیش لە دوورەوە سەیری ئێمەی دەکرد، بە دەنگەدەنگی ئێمە نەوەکانم لە خەو هەڵسان و بەسەر سوڕمانییەوە سـەیری بابەگەورەیان دەکرد، بەرەو لایان ڕۆیشتم فرمێسکەکانم ڕووخساری ئەو گۆڵانەیان تەڕ کرد.

## بەرەو گوندی شیشوان

**عەلی ئەشـــرەف دەروێشـــیان: دوای ئازادبوونت لە زیندان، لە کوێ نیشتەجێ بوویت؟**

**ســـەفەرخان:** ماڵی مەهینی کچم لە شەقامی جەمشـیدئاوا بوو، کە ئێسـتا ناوەکەی گـۆڕاوە بە شـــەقامی جەمالـزادە، خەڵکـی دەیانزانی مـن لە کوێم، ئیتر هاتوچۆ و ســـەردانیکردن دەســـتی پێکـرد، لەوانەیە زۆربەی خەڵکی تاران هاتبن بۆ ســـەردانیکردنم. ڕۆژانە لە کاتژمێر (٦)ی بەیانییەوە تاکو (١١)ی شـــەو دەرگای ماڵەکە کراوە بوو، سێ کەس سـێ کەس خەڵکی دەهاتنە ژوورەوە، ژمارەیەکی زۆریش لەبەردەرگا دەوەستان تاکو نۆبەیان بەرکەوێت و بێنە ژوورەوە. بۆ هەر سێ کەس و چارەکە کاتژمێرێک دیاریکرابوو بۆ بینینم، هەرکەســێک دەهات منی دەبینی و دەگەڕایەوە. بینینی ئەو خەڵکە زۆرە بۆ من مایەی خۆشحاڵیی بـوو، بەڵام ماندووش دەبـووم، هەندێک جار وا ڕێدەکەوت کاتژمێر (٢ و٣)ی شـــەو دەخەوتـم، بەیانیـان کاتژمێر (٦) لە خەو هەڵدەســتام بۆ پێشوازیکردن لە میوانەکان.

بـەردەوام لـە گەڕەکـەکان خۆپیشـاندان بوو، هێشـتا سـەرەتای سـاڵی (١٣٥٧) بوو، ڕۆژێک لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەم دەکرد، خۆپیشـاندان و هاوارکـردن و ڕاکـەڕاک بوو، چاوم لێبـوو کۆمەڵێک هەڵاتن و هاتنە کۆڵانی ماڵی کچەکەم، لەدوایانەوە پۆلیس دەســتی کرد بـە تەقەکردن لێیـان، پیاوێک هاتـە کۆڵانەکە و ژنێکـی جوانی لەگەڵدا بوو، نازانم هاوســەری بوو، یان خوشـک، هەردووکیان گەنج و جوان بوون، ئۆتۆمبێلێکی پڕ لە پۆلیس دوایانکەوتن، پۆلیسێک لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزی و نیشـــانەی لە پیاوەکە گرتەوە و تەقەی لێکرد، فیشـــەکێک بەر ســـەری کەوت و کـەوت بە زەویدا، ژنەکەش دەســـتیکرد بـە هاوار و

گریان، خەڵکی بەسەریان چڕژا و پیاوەکەیان خستە ئۆتۆمبێلەوە و بردیان. خەڵکێکی زۆر لەو ناوە کۆبوونەوە و پۆلیس هاتن و بڵاوەیان پێکردن، چەند کەسێک لە ترسی پۆلیس هاتنە ماڵی مەهین. پۆلیسەکانیش هاتنە ژوورەوە، کاتی نیوەڕۆ بوو، ئەوانەی هاتن و لەسەر سفرەکە دانیشتن، نزیکەی (٢٠ تا ٢٥) کەس دەبوون، گووتم هەندێکتان بڕۆنە سەربان، پۆلیسەکان هاتنە سەرەوە و لە ئێمەیان پرسی. ئایا کەسانێک هاتوونەتە ئێرە؟ گووتم: نەخێر ئەمانە میوانی ئێمەن. ئاغای عەباسی هاوسەری مەهینی کچم گووتی: من خاوەن ماڵم. پۆلیسەکان گووتیان: ئەمانەی لەسەر سفرە دانیشتوون کێن؟ ئاغای عەباسی گووتی: ئێ ئەوانە میوانەکانمانن. پۆلیسێک گووتی: باشە ئەم کەسەیان ناوی چییە؟ ئاغای عەباسی نەیتوانی وەڵام بداتەوە. ئەفسەرەکە گووتی: ئەوانی تریان بۆ کوێ چوون؟ ژوورەکان گەڕا و ڕۆیشت بۆ سەربان و ئەوانی تریشیان هێنایە خوارەوە. ئێمە و چەند کەسێک لە خۆپیشاندەران کەوتینە نێوەندگیریی و داوامان لێکردن ئەمجارە لێیان ببوورن و لەگەڵ خۆیاندا نەیانبەن، ئەوانیش شل بوون و زۆر گرنگییان پێ نەدان و ڕۆیشتن. بەردەوام دەرگامان کراوە بوو، خەڵکی لە ترسی هێرشی پۆلیس دەهاتنە لای ئێمە. بەهەرحاڵ وازیان لێهێنان و هەمووانیان ئازادکرد و خۆیان ڕۆیشتن. پێم سەیر بوو، نازانم چۆن پۆلیسەکان ئەو کارەیان کرد، لەوانەیە لەبەر ئەو خوێنە بووبێت کە لە کۆڵانەکەدا ڕژابوو. کاتێک پۆلیسەکان ڕۆیشتن خەڵکێکی زۆر هاتنە شوێنی خوێنە ڕژاوەکە و چەپکە گوڵیان لەسەر خوێنەکە دانا، بەدڵنیاییەوە بریندارەکە مردبوو، چونکە فیشەک بەر سەری کەوتبوو.

بیرم کردەوە من ئەگەر بمەوێت لێرە بژیم، لێرە ڕەوشەکە ڕۆژ بەڕۆژ خراپتر دەبێت، ڕۆژێک دانیشتم لەگەڵ ئاغای عەباسی و مەهینی کچم و چەند خزمێک کەوتینە گفتوگۆ. بڕیارم دا بڕۆم بۆ تەبرێز. بەهرۆزی حەقی ماڵی لە تەبرێز بوو، گووتی: ئەگەر دەتەوێت بچیت بۆ تەبرێز دەبێت بێیت بۆ ماڵی ئێمە. دیارە ئێمە لە تەبرێز چەند شوێنێکمان

لەبەرچــاو گرتبــوو. گووتم: باشــە دێمە ماڵی ئێــوە، هەموومان لەگەڵ بەهرۆزدا هاوڕا بووین، دیارە زۆر لە یەکترییەوە نزیک بووین، بەهرۆز لە پێش ئێمەدا بەرەو تەبریز بەڕێکەوت، تاکو ماڵەکەی ئامادە بکات. ئێمە ڕۆژێــک کاتژمێر(٥)ی بەیانی لەگەڵ (١٢ تــا ١٣) ئۆتۆمبێل لە تارانەوە بەڕێکەوتیــن. مــن و ئاغای عەباســی و پەروێزی برای و دوو کەســی تر لە ئۆتۆمبێلی یەکەمدا بووین، زۆر هێمن و لەســەرخۆ دەڕۆیشــتین، هەوڵمان دەدا دوای نیوەشــەو بگەینــە تەبریز، چونکە لە تەبریز هەواڵ بــڵاو ببــووەوە کە ئێمە دەڕۆین بۆ ئــەوێ و لەوانەیە خەڵکی کۆببنەوە و هەراو دەنگەدەنگ دروســت ببێت. کاتژمێر (٢)ی نیوەشەو گەیشتینە تەبریز، بە شــەقامی شەشــی گوڵاندا ڕۆیشــتین، چونکە ماڵی خوشکی بەهرۆز لەوێ بوو.

گەیشــتینە ماڵــەوە، کۆڵانەکــە کەمێــک تەســک بــوو، خانووەکەش بچــووک بــوو، ئەوان بەپەلــە ماڵەکەیــان ڕێکخســتبوو. کاتژمێر (٢)ی شــەو گەیشــتین و لێی خەوتیــن، کاتژمێر (٨)ی بەیانــی زەنگی دەرگا لێیدا. تیپی مۆســیقای تەبریز هاتبوون، کە سەرپەرشتکاریان حەسەنی مۆســیقار بوو، دواتــر عەبدولعەلی هات، چەنــد هونەرمەندێکی تریش هاتــن. ئەو چەنــد ڕۆژەی کە من لــە تەبریز بووم، ئەوانیــش لەو ماڵە بــوون و بــەردەوام ئاهەنگیان ســاز دەکرد، هونەرەکەیــان زۆر جوان بوو، هەندێک جار قەرەباڵغی دروســت دەبوو، پۆلیس دەهاتن و گازی فرمێســکڕێژیان لە حەوشــەکەدا دەڕشــت و چاوەکانمان ئاوی دەکرد. تەبریــز لە تــاران قەرەباڵغتر بوو، ڕۆژانە لــە کاتژمێر (٣٠: ٨) بەدواوە بەلێشــاو خەڵکی دەهاتن بۆ ســەردانیکردنم، بە جۆرێک ڕۆژانە پۆلیس دەڕژانە ســەرمان، ئــەوان کاریان بەســەر منەوە نەبــوو، بەڵام گازی فرمێســکڕێژیان بەســەر ئەو کەسانەدا دەڕشــاند کە لە دەرەوە بوون، هیچ کەسێکیان دەستگیر نەدەکرد، تەنها ئاگادارکردنەوەیەک بوو. تاکو ڕۆژێک ئەفسەرێکی پۆلیس هات بۆ لام و گووتی: ئێمە بەدەست ئێوەوە ماندوو بووین، وا باشــترە ئێوە خۆتان بڵاوە بەو خەڵکە بکەن کە دێنە

سـەردانتان، یان تەبریز جێبهێڵە و برۆرە شـوێنێکی تر، بەڕاستی ئێمە لـە تواناماندا نەماوە و ناشـمانەوێت ئـازاری تۆ بدەین. ئـەو زۆر بە ئەدەبەوە قسـەی لەگەڵدا کردم. گووتم: بەسـەرچاو بەمزووانە دەڕۆم. ئەفسەرەکە دانیشت و چایەکی خواردەوە و ڕۆیشت.

شەو خزمان و دۆستان لە دەورم کۆبوونەوە، بڕیارم دا کە ئەو ماڵە جێبهێڵم، بەڵام هیچ شوێنێکم شک نەدەبرد ڕووی تێ بکەم، بۆیە بڕیارم دا بڕۆم بۆ گوندی شیشـوان، واتە گوندەکەی خۆمان. کاتژمێر (١٠)ی بەیانـی بە کاروانێکـی زۆری ئۆتۆمبێلەوە کەوتینە ڕێ، چونکە چەندین ئۆتۆمبێلـی تـر لەگەڵمان بەڕێکەوتـن، هەر بۆیە چەندین سـەربازیش شـوێنمان کەوتن. کاتێک گەیشتینە شـاری ئازەرشەهر، شەش مەڕیان لەبـەر پێماندا سـەربڕی، کاتێک لە ئازەرشـەهر تێپەڕین سـەیرم کرد دوو ئۆتۆمبێلی گەورەی پڕ لە سەرباز لەگەڵ ئێمەدا دێن، ئێمە هێواش بووینەوە، ئەوانیش ئۆتۆمبێلەکانیان هێواشـکردەوە، ئیتر تێگەیشـتم بە بڕیارێک لەگەڵ ئێمەدا دێن، تاکو گەیشـتینە شـاری عەجەبشێر هەر بە دوامانەوە بوون، لە عەجەبشـێر خەڵکی ڕژانە سـەر جادە و دەستیان کـرد بە وتنەوەی دروشـمی شۆڕشـگێڕیی و هاواریـان دەکرد بژیت سـەفەرخان، بژیـت سـەفەرخان. کەمێکی تر ڕۆیشـتن و ئەفسـەرێک هـات و بڵاوەی بە خەڵکەکە کرد، هاتە پێش ئێمە و عەلی شـۆفێری لە ئۆتۆمبێلەکـە دابەزانـد و گووتی: ناوت چییە؟ ئەویـش ناوی خۆی پێ گووت و ئەفسەرەکە گووتی: چەکەکەتم پێ بدە. عەلی گووتی: چەکم پێ نییە، ئەفسـەرەکە گووتی: چەکەکەت لە ئۆتۆمبێلەکەدایە، عەلی گووتی: سەیری ناو ئۆتۆمبێلەکە بکە. ئەفسەرەکە سەیری کرد و هیچی نەبینی، بـەڵام ئێمە چەکێکمان پێبوو شـاردبوومانەوە، لە شـاری عەجەبشـێر تێپەڕین و دوای دە خولەک گەیشتینە گوندی شیشوان.

**عەلی ئەشـــرەف دەروێشیان: منیش هاتم بۆ ئەوێ، لە شیشوان هاتمە خزمەتت؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، لەگەڵ خوشکەزاکانتدا هاتیت.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: منیش یادەوەرییەکم لێرە هەیە.**

**سەفەرخان:** منداڵانی خوشکەکەت سروودیان بۆ خوێندمەوە، بەڵێ، ئێمە چوار پێنج ڕۆژ لە شیشـــوان بووین. زۆر کەسمان بینی. دوو سێ کەس هاتن و من گلەییم لێکردن. گووتم: فڵان کەس تۆ بۆچی ئەو کاتە ئـــەو کارەت کـــرد؟ بۆ ڕۆیشـــتی هاوکاریی فڵان ئاغات کـــرد، ئەوانیش ســـەریان داخســـت و هیچ وەڵامێکیـــان پێ نەبوو. ڕۆژێک ڕۆیشـــتم بۆ ماڵـــی یەکێـــک لە ئاغاکان کە لە کاتی کێشـــە و ئەڵۆزییـــەکان هەڵاتبوو، خەڵکی ڕژابوونە ســـەر ماڵەکەی و زیانێکی زۆریـــان پێگەیاندبوو. ئەو ئاغایە ناوی قاسم ئاغا بوو، من یادەوەریی زۆرم لەگەڵ ئەم ئاغایانەدا هەیـــە، زیندانێک لـــە ژێرزەمینی ماڵی ئەم ئاغایانەدا هەبوو، خەڵکیان لێ ئەشـــکەنجە دەدا. دیارە خەڵکیش بەرگرییان لـــە خۆیان دەکرد. دێتەوە یادم هەندێک کات بە تایبەتی لە ڕۆژی عاشورادا خەڵکی هەڵیاندەکوتایە سەریان و زیندانییەکانیان ئازاد دەکرد، بەهەرحاڵ. شەوێکیان کاتژمێر (۹)ی شـــەو بوو، ئەو ئەفســـەرەی لە عەجەبشێر هات و پێشی پێگرتین و داوای چەکی لێکردین، هات بۆ ماڵمان. کەســـێکی هێمن و لەســـەرخۆ بوو، زۆر جیاوازتر لەو ڕۆژەی لە عەجەبشـــێر بینیم، زۆر بە بێدەنگی و دۆســـتانە هات و دانیشـــت، چایەکیان بۆ هێنا و داوای لێبووردنی لە مـــن کرد و گووتی: ئاغاکان ئێمەیـــان وا تێگەیاندبوو کە ئەگەر تۆ لێرە بمێنیتەوە، بەو هێزەی لەگەڵتایە دەســـت بەســـەر بنکە ســـەربازییەکەدا دەگـــرن. ئێمـــەش بە بیســـتنی ئەو هەواڵە ترســـمان لێ نیشـــت، ئێســـتا ئێمـــە دەزانین تـــۆ بەرنامەیەکی خراپـــت نییە، هەربۆیـــە هاتووم داوای لێبووردنت لێ بکەم. ئینجا گووتی: تۆ لێرە بمێنەرەوە و کارت بەســـەر کەســـەوە نەبێت، هەر کارێکت هەبوو ئێمە ئـــاگادار بکەرەوە. من چوار

پێنج ڕۆژ لە شیشــوان مامەوە، دواتر ڕۆیشــتم بۆ ئورمیە، ســەردانی زەنور و خوالێخۆشــبوو ئەبولفەزڵی قزڵباخیم کــرد، کە یەکێک بوو لە هاوڕێیانی زیندانم.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەم ئەبولفەزڵ بە خزمایەتی دەگاتە تۆ؟**

**ســەفەرخان:** نەخێر، ئەو هاوڕێی زیندانم بوو، بەداخەوە لە ســاڵی (١٣٦٠) لە تێکهەڵچوونێکدا لە بەندەر ئەنزەلی کوژرا.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشیان: ئێستا ئەگەر دەکرێت باسی دووەم پرۆسەی هاوسەرگیریتمان بۆ بکە.**

**سەفەرخان:** باشە ئەگەر پێویست بکات بۆتان باس دەکەم.

**عەلی ئەشــرەف دەروێشــیان: ئاخر ئــەو زۆر پێداگریی کرد و گووتی: با سەفەرخان کەمێک لەبارەی منەوە قسە بکات.**

**سەفەرخان:** هەروەکو پێشتر باســم کــرد هاوسەری یەکەمم ساڵی (١٣٤٣/ ١٩٦٤) کۆچــی دوایــی کرد، کاتێک لە ســاڵی (١٣٥٧) لە زیندان ئازادکرام لەگەڵ خزم و کەســەکانم ڕۆیشتم سەردانی گۆڕەکەیم کرد، دوای چەنــد ڕۆژێک بیرم کردەوە کە ئەگەر کەســێکی باشــم دەســت بکەوێت، وا باشــترە دووبارە هاوســەرگیریی بکەمــەوە، بەڵام مەهینی کچم دژی ئەوە بوو هاوسەرگیریی بکەمەوە، دوای ماوەیەک لە هەمان گوندی شیشــوان ژنێکیان بۆ دۆزیمەوە، بــەڵام کچەکەم گووتی: نابێت هاوســەرگیریی بکەیت، من حەز ناکەم کەسێک بێتە ئەم ماڵە و جێگای دایکــم بگرێتەوە، منیش لەبەر خاتری کچەکەم وازم لێهێنا، بەڵام بە دڵ پێــم ناخــۆش بوو. مەهین دەیگووت: من ســەردانت دەکــەم و تەواوی کارەکانــی ناو ماڵت بۆ ئەنجام دەدەم، ئیتر بەرنامەکەم هەڵوەشــایەوە و هاوســەرگیریم نەکرد. مەهین ماوەیەک دەهات و سەردانی دەکردم،

بـــەڵام هێـــواش هێواش ئەویـــش بێتاقەت بـــوو نەدەهات بەلامـــدا، بۆیە دووبـــارە بڕیـــارم دا کـــە هاوســـەرگیریی بکەم. ژنێک هەبـــوو لە تاران دادەنیشـــت، ئـــەو لـــە ئاوارەکانی ســـۆڤیەت بوو، لە تاران ئارایشـــتگای هەبوو، ئەم موحتەرەم خانمە کە هاوســـەرگیرییم لەگەڵدا کرد، هاوڕێی ئـــەو ژنە ســـۆڤیەتییە بوو، ڕۆژێـــک موحتەرەم خانم بۆ ئارایشـــتکردن ســـەردانی ئـــەو ژنـــە دەکات، ئەویش پێشـــنیاری بۆ من کـــرد کە بچمە داخوازیـــی موحتـــەرەم خانم. ئەوەبـــوو یەکتریمان بینـــی و پێکهاتین و بەیەکەوە هاوسەرگیرییمان کرد.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: موحتەرەم خانم هاوسەری پێشووی مردبوو؟**

**ســـەفەرخان:** نەخێر، لە یەکتری جیا ببوونەوە، یەکێک لە کوڕەکانی موحتـــەرەم خانـــم لە وڵاتـــی ئەڵمانیـــا دەژی و کاری بازرگانی دەکات. ئـــەو کاتە موحتـــەرەم خانم کارمەند بوو، دەچووە ســـەر کار، بەیانیان کاتژمێر پێنج هەڵدەستا و دەڕۆیشتە سەر کار، زۆر ئازا و گورجوگۆڵ بـــوو، هیچ کێشـــەیەکی بۆ من دروســـت نەدەکرد، بـــەڵام دوای ئەوەی خانەنشـــین کرا لەماڵەوە دانیشـــت و کێشەکان دەستیان پێکرد. ڕۆژانە دەوروبـــەری من قەرەباڵغ بوو، بـــەردەوام میوانمان دەهات، منیش ئەو کاتـــە هێـــز و توانام باش بوو، موحتەرەم خانمیش وەک ئێســـتا نەبوو، پێشـــوازیی لە میوانەکان دەکرد و خزمەتی دەکردن. ئەو کات ماڵەکەم ببووە دیوەخانێک، ئەو کەسانە زیاتر سەردانیان دەکردم کە لە زینداندا کەســـەکانیان بێســـەر و شـــوێن ببوون، بە جۆرێک ماڵەکـــەم قەرەباڵغ بوو، کە بۆ پلینیۆمی شانزەیەمی حیزبی تودە بانگهێشتی منیان نەکرد، گووتبوویـــان ماڵەکـــەی بووەتە بارەگای چریک فیدایییـــەکان، دیارە ئەو کەسانەی سەردانی ماڵی منیان دەکرد، هەمەجۆر بوون.

**عەلی ئەشرەفدەروێشــیان: وا باشــترە بێینەوە ســەر باســی هاوسەری دووەمت.**

**ســـەفەرخان:** بەڵێ، یەکێــک لــە تایبەتمەندییەکانی مــن ئەوەیە کە حەزدەکــەم تەواوی کارەکانی ژیانی خــۆم، خۆم ئەنجامیان بدەم، واتە ئامــادە نیم کەســێک هاوکاریم بــکات، لە زیندانیش هــەر ئاوها بووم، تەنانــەت چاییەکەشــم خــۆم ئامادەم دەکــرد و دەمکــردە تەرمۆزەوە. تەرمۆزەکەم ناسراو بوو، هەموو زیندانییەکان چاییان لێ خواردبووەوە، تــا ئــەو ڕۆژەی لە زیندان ئازادکــرام تەرمۆزەکەم هــەر مابوو، دواتر وەک یادگارییەک دام بە بەهرۆز. بەڵێ، تایبەیمەندیی من ئاوها بوو کە هەموو کارەکانم خۆم ئەنجامیان بدەم. لەدوای ســاڵی (١٣٦٠) ئامانجی کچەکەم ئەوەبوو کە ڕێگریی بکات لەوەی کە هاوســەرگیریی بکەم، بە جۆرێک کچەکەم دەستی بەسەر کارەکانی مندا گرتبوو، کە نەتوانم بیر لە هاوســەرگیریی بکەمــەوە. لە ســاڵەکانی (١٣٦٠و ١٣٦١) من هێز و توانام باش بوو، بەردەوام میوانم دەهات و خەڵکی بەزۆریی هاتوچۆیان دەکــردم، بــەردەوام چەند مریشــکێکم چــاک دەکرد و دەمخســتە ناو بەفرگرەکــە. ڕۆژی چەند جارێک خواردنم ئامادە دەکرد، هەرکەســێک دەهات بۆ ســەردانیم، ئەگەر برسی بووایە، بە زووترین کات خواردنم بۆ ئامادە دەکرد. ئیتر بۆم دەرکەوت ئەم کارە ناکرێت، میوان بە تەنها دانیشــێت و منیــش لە چێشــتخانە خەریکی ئامادەکردنــی خواردن بم. کاتێک موحتەرەم خانم بووە هاوســەرم، ئەویش ویســت و ئارەزووی خۆی هەبوو.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لە ماڵەوەش هەروەکو زیندان پشتت بەخۆت بەستووە؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، بەهەمان شــێوەی زینــدان، بەداخەوە موحتەرەم خانم بەو جۆرە نەبوو، کەسێکی توند بوو، بەردەوام شەڕە دەنووکمان بوو، بەردەوام دەمەقاڵێمان بوو، بەردەوام کێشەمان هەبوو، ئەگەر من

دانـم بە خۆمـدا نەگرتایە، کێشـەکانمان زیاتر دەبوون. تـا ئەو کاتەی دەچـووە سـەر کار و لە مـاڵ دوور دەکەوتەوە خـراپ نەبوو، کاتێک دەگەڕایەوە بۆ ماڵ شەکەت و ماندوو بوو، کارەکانی ناو ماڵ هەمیشە لە ئەسـتۆی من بوو، خۆم کارەکانم ئەنجام دەدا. ساڵی (١٣٦١) کاتێک ئالۆزییـەکان دروسـتبوون، ئەندامانـی حیزبـی تودە دەسـتگیرکران، ڕۆژێکیان منیش دەسـتگیرکرام و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کردم، نزیکەی (٤ تا ٥) کاتژمێر هێشـتیانمەوە، بەڵام دوای ئەم لێکۆڵینەوەیە ئازادیان کـردم و گەڕامـەوە بـۆ ماڵـەوە، ئیتر لـەو کاتـەوە تا ئێسـتا کاریان بەسـەرمەوە نییە. پێیـان دەگووتم تۆ ئەندامی سـەرکردایەتیی حیزبی تودەیت. دیارە من ئەندامی فەخریی ئەو حیزبە بووم. تا سـاڵی (١٣٦٣) لە شـەقامی ڕۆستەم نزیک مەیدانی شـۆڕش ژیانێکی ئاسایی دەژیام، لەو سـاڵەدا نەخۆشـکەوتم و کیسی ئاو لەسـەر جگەرم دروست بوو، ڕۆیشـتم بۆ نەخۆشخانەی شەهریار و نەشتەرگەرییان بۆ کردم، بەڵام نەشتەرگەرییەکەم سـەرکەتوو نەبوو، لە نەخۆشخانە هاتمە دەرەوە و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ خراپتر دەبووم، لەسەر جێگا کەوتبووم، نە خواردنم دەخوارد، نە قسەم دەکرد. ڕۆژ بەڕۆژ لاوازتر دەبووم، ئازارێکی زۆرم هەبـوو. ڕۆژێکیان ئازارەکەم ئەوەنـدە زۆر بوو خەریک بوو لە هۆش خۆم دەچووم، ویسـتم تەلەفۆن بکـەم، تەلەفۆنەکەم لێدا و بوورامەوە، ئیتـر بەهـرۆزی نـەوەم دێـت و لـە دەرگا دەدات و دەرگا ناکرێتەوە، ناچـار لە سـەربانەوە دێتە خوارەوە و پەنجەرەکە دەشـکێنێت و دێتە ژوورەوە. سـەیر دەکات من بێهۆش کەوتـووم، بەخێرایی دەمگەیەنێتە لای دکتۆر. چەند دکتۆرێک دێنە سـەرم و پشـکنینم بۆ دەکەن و بۆیان دەردەکەوێت تووشی نەخۆشیی شێرپەنجە بووم، بەڵام هیچیان بە من نەگووت. یەکێک لە دکتۆرەکان ماچی کردم و گووتی: هەرچییەکت بێت من ڕاسـتییەکان بە تۆ دەڵێم. خەڵکێکی زۆر لەبەر دەرگا وەسـتابوون، چاوەڕوانی ئەنجامی پشکنین بوون، لە کۆتاییدا دکتۆر گووتی: وەرەمێک لەسـەر سـییەکانی هەیە، ئەویش ئەوەندە گرنگ نییە و نەشتەرگەریی

بۆ دەکەم سەرکەوتوو دەبێت. بۆ ڕۆژی دوایی بردیانم بۆ ژووری نەشتەرگەریی، دوای نەشتەرگەریی وەرەمەکە دەبڕن و دەینێرن بۆ تاران، کە وەڵامەکەی گەڕابووەوە گووتبوویان ئەو وەرەمە گومانی شێرپەنجەی لێدەکرێت. لە ڕۆژی نەشتەرگەریی و ڕۆژانی دواتر چەندین کەس لە دەورم کۆبوونەوە. ماوەی یەک ساڵ لەژێر چاودێریی پزیشکیدا بووم.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: ئەو ماوەیەی لە زیندان بوویت؛ لەگەڵ کەسدا تووشی کێشە بوویت؟**

**سەفەرخان:** بەڵێ، یەک جار تووشی شەڕ بووم.

**عەلی ئەشرەف دەروێشیان: لە کام زیندان بوویت؟**

**سەفەرخان:** لە زیندانی قەسر بووم، ئاغای شەهید زەند هەڵسوکەوتی لەگەڵ مندا باش نەبوو، ئەو بێچارەیە دوای ماوەیەکی کەم لە ئازادبوونی بەهۆی نەخۆشیی شێرپەنجەوە کۆچی دوایی کرد، ئەو ماوەی (٢٥) ساڵ لە زینداندا بوو. ڕۆژێکیان من خەریکی وەرزشکردن بووم، هاوینی ساڵی (١٣٥٣) بوو، نازانم چی بوو، هاتوهاواری کرد بەسەرمدا و گووتی: شەعبان بێمۆخ، چونکە وەک شەعبان بێمۆخ وەرزشم دەکرد. من سەرەتا تێنەگەیشتم، بەڵام دوایی لە چەند کەسێکم پرسی، ئەو برادەرە چی گووت و مەبەستی چی بوو. کە بۆم دەرکەوت چی گووتووە، بە تووڕەییەوە ڕۆیشتم بۆ لای، عەزیزی سەرمەدی پێشی پێگرتم و بەزۆر هێنامییە ژووری چێشتخانەی بەندی شەش، کە ژوورێکی بچووک بوو. هێشتا ئەو میلە ئاسنەی وەرزشم پێ دەکرد، هەر بە دەستمەوە بوو، بە تووڕەییەوە قسەم دەکرد. سێ کەسی تر لێم هاتنە پێش تاکو هێمنم بکەنەوە. ڕاستییەکەی ئەوەبوو دەمویست بچم وانەیەکی دابدەم. ئەویش زۆر ترسابوو چووبووە پەنایەکەوە و سەیری دەوروبەری خۆی دەکرد و بە چەند کەسێکی گووتبوو تووخوا ئاگادارم بن مەهێڵن

لێم نزیکبێتەوە، بەو چەند کەسەی گووتبوو بەخوا بمگرێت دەمکوژێت. بەهەرحـــاڵ زیندانییـــان منیان گـــرت و ســـوێندیان دام وازی لێبهێنم و بردیانمەوە بۆ ژوورەکەی خۆم. دواتر چەند برادەرێک ڕۆیشتن بۆ لای ئەو و پێیان گووتبوو بۆچی جوێنت پێداوە؟ ئەو کەسێکی ناتەواو بوو، قسەی ناشرینی بە هەموو کەسێک دەدا، من زۆر شتم لەبارەی ئەوەوە بیســـتبوو، تاوانی بەدڕەوشـــتی دەخستە پاڵ زۆرێک لە زیندانییان، کەم کەس هەبوو لە زیندان ئەو تاوانی نەخستبێتە پاڵ. من زۆر لێی پەست بووم، ئەویش باش ترســـابوو. ئەو میلە ئاســـنەی وەرزشـــم پێ دەکرد، هێشـــتا بە دەســـتمەوە بوو، ویســـتم بیکێشـــم بە ســـەریدا، بەڵام دوایی دڵم پێی دەســـووتا. ئەو هیچ کەســـێک لە دەرەوەی زیندان نەدەهات بۆ سەردانیکردنی و دواتر هاوکارییشم دەکرد.

## یەکەمین چاوپێکەوتن/
## ڕۆژنامەی کەیهان ژمارە (١٠٥٩٥/ ٤ی ئابانی ١٣٥٧)

دوای سـێ سـاڵ، لـەم ئازادییـە چاوەڕواننەکراوەدا، مـن خۆم بە قەرزارباری خەڵکی دەزانم، ئەگەر ئەو خەڵکە بەیەکەوە ڕانەپەڕینایە و نەهاتنایە سـەر شـەقام، ئەوا دەبووایە من تا کۆتایی تەمەنم لە زینداندا ژیـان بەسـەر بەرم. ئـەم ئازادییەی کە بە هەوڵ و تێکۆشـانی خەڵکی بەدەست هات، پیرۆزبایی لە تەواوی جەماوەر دەکەم.

بۆچی بۆ بەدەسـتهێنانی ئەم ئازادییە خوێن کەم ڕژاوە؟ کەم گوللـە لە سـنگی ئازادیخـوازان دراوە؟ من (٣٢) سـاڵ لەمەوبەر و دوای (٥) سـاڵ لە خەبات و تێکۆشـان لەناو دیموکراتەکانی ئازەربایجان، کە لە کۆتاییدا دەستگیرکرام و خرامە کونجی زیندانەوە، خەباتی من لە دژی ڕژێمێکی سـەرمایەداریی بوو، هەربۆیە بـە حوکمی هەتاهەتایی حوکم درام.

سـاڵی (١٣٥٥) لەگەڵ (٧٠) زیندانیی تر بۆ نووسـینی پاکانە بردیانم بۆ زیندانی ئەوین، من بە هیچ جۆرێک ئامادە نەبووم پاکانە بنووسـم، هـەر بەهۆی ئەو خۆڕاگرییەمەوە بـوو بۆ ماوەیەکی زۆر لە خراپترین شوێنی زیندانی ئەوین هێشتیانمەوە. سەرۆکی زیندان پێی گووتم دەبێت هەتاکو دەڕزێیت لەم شـوێنەدا بمێنیتەوە، منیش پێکەنیم و گووتم: من کەسێک نیم برزێم، من پیاوی ناو کونجی زیندانەکانم.

پێتان سـەیر نەبێت ئەگەر شـارەزای شـارەکان نەبم و شەقامەکان نەناسـم، من بەردەوام هۆش و بیرم لای زیندانییانی سیاسـییە، ژیانی مـن واتـە کونجی زیندان، مـن ئەو لاوانـەم بینیوە کە هێشـتا موو لە ڕووخسـاریان نەهاتبوو، ئەوان بەهۆی خوێندنەوەی کتێبێک خرابوونە زیندان، من ئێستا ناتوانم هیچ بڵێم، هەموو ژیانی من یادەوەرییە.

من هێشتا ناتوانم هەست بە وشەی جوانی ئازادیی بکەم.

ژیانــی من پەڕاوێکە بــە مەرەکەبی خوێن هەمــوو یادەوەرییەکانی (٣٢) ساڵی تێدا نووسراوەتەوە.

خۆ لێم دەپرســیت ئارەزووت چییە؟ من بە ڕاشــکاویی پێت دەڵێم. ئارەزووی من ئازادیی تەواوی پارتەکانە و ئازادیی تەواوی زیندانییانی سیاسییە.

## پێشوازیکردن لەلایەن خەڵکەوە

ماڵی سەفەرخان ڕووبەڕووی هێرشـێکی بێوێنەی خەڵک ببووەوە، بە جۆرێک کە ژوور و هۆڵ و حەوشە و بەردەرگای ماڵی ئەم زیندانە ناسـراو و خۆڕاگرە بەردەوام پڕبوو لە خەڵک، خەڵکی دەسـتە دەسـتە دەهاتـن بـۆ سـەردانیکردنی و لەئامێزیـان دەگرت و ماچیـان دەکرد. بەهۆی قەرەباڵغییەوە زۆرێک لەو کەسانەی کە دەیانویست چاویان بە سەفەرخان بکەوێت، بۆیان هەڵنەکەوت کە چاویان پێی بکەوێت، ئەوان ڕێز و خۆشەویستی خۆیان بە چەپکە گوڵێک بۆ سەفەرخان دەردەبڕی و بە نووسـینێک لەسـەر چەپکە گوڵەکە ڕێزی خۆیـان بۆ دەردەبڕی.

نووسینی سەر چەپکە گوڵەکان زیاتر ئەم دروشمانە بوون:

-سڵاوی گەرمی خۆم پێشکەش دەکەم بە سەفەرخانی قارەمان.

-ئازادیی تۆ لە زینداندا سەرکەوتنە بۆ تەواوی خەباتگێڕان.

-ئازادیخوازانـی ئێـران، تۆ و زیندانییانی تریـان ئازادکرد، یادی تۆ هەتاهەتایـە لەناو دڵی خەڵکی ئێراندا بە زیندوویی دەمێنێتەوە. ناوی تۆ لـە پاڵ ناوی کوێرئوغلی و سـەمەدی بەهرەنگی لە مێژووی ئێراندا بە نەمریی دەمێنێتەوە...

**تـەواو**

**٢٠٢٢/٧/٣**

**سێکانیان**

## بیرەوەرییەکانی

# سەفەرخان

چەندین ساڵ بوو ناوی سەفەرخانم بیستبوو، دەمزانی کەسێکی ئازەرییە و خەڵکی ئازەرشەهر و تەبرێزە، ئەویش هەر وەکو غەنی بلوریان، عەزیز یوسفی، جەلیلی گادانی، بێژەنی جەزەنی و خوسرەوی گوڵسورخی زیندانییەکی ئازا و بەورە و خۆڕاگری زیندانەکانی ئێران بووە، بەڵام هیچ زانیارییەکی ئەوتۆم لەسەر شێوازی خەبات و تێکۆشان و ئاوارەیی و دەستگیرکردن و خۆڕاگرییەکانی ناو زیندانی نەبوو...

وەرگێڕ




سلێمانی
٢٠٢٢